

# چۆن چەپکێک و
# کام مێژووی کۆمەڵە ؟!

خوێندنەوەیەکی مێژوویی بۆ (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە)

مەلا بەختیار

شوبات
۲۰۱۲
بەرگی یەکەم

# چۆن چەپکێك و
# کام مێژووی کۆمەڵە ؟!

**خوێندنەوەیەکی مێژوویی بۆ ( چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە )**

**مەلا بەختیار**

**بەرگی یەکەم**

**شوبات - ٢٠١٢**

- **ناوی کتێب:** چۆن چەپکێکو کام مێژووی کۆمەڵە؟!

- **نوسەر:** مەلا بەختیار

- **بەرگی:** یەکەم – چاپی یەکەم

- **تایپو دیزاین:** تەها حەمەنوری

- **دیزاینی بەرگ:** ئارام عەلی

- **چاپخانە:** دەزگای چاپو پەخشی حەمدی

- **نرخ:** (٧٠٠٠) دینار

- **تیراژ:** (٥٠٠٠) دانە

- **ساڵی چاپ:** ٢٠١٢

- لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٠٢٤)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە

## پێشکەشە بە:

- فوئاد سوڵتانی (لە مەریوان شەهیدکرا) و .
- ئەکرەم‌و خەبات (لە قەراغ) لەبەرچاوی برایم جەلال شەهیدکران‌و یەك فیشەکی بۆ بەرگریلێکردنیان نەتەقاند.

# پێرست

# پێشەكی

## درۆ و .. درۆی ململانێی سیاسی

لەوباوەڕەدام، جنێو چینە چەوسێنەرەكان دایانهێنابێ‌و درۆش چینە چەوساوەكان.. چۆن؟

چەوسێنەر.. دەسەڵاتدار خاوەنی ئامرازەكانی بەرهەمهێنانیش بووە، لەسەردەمی كۆیلەیەتیدا، نەك خاوەن هێزی كار، بەڵكو خاوەنی خودی مرۆڤەكانیش بووە، بۆیە هەركاتێك ویستبێتی، یان هەرچۆنێك ئارەزووی لێبوبێ، تەنانەت بۆ رابواردنیش بوبێ، جنێوی داوەتە مرۆڤە چەوساوەكان. لەمەوە، ئیتر جنێو ئاوێتەی خووڕەوشتی ئادەمیزاد بووە؛ لەگەڵ گەشەكردنی كۆمەڵایەتی‌و ئاڵوگۆڕەكانیشدا، ئیدی جنێو تەشەنەی سەندووەو بوشەتە بەشێكی خووە سایكۆلۆژیەكان.. بەچەوسێنەرو چەوساوەشەوە.

بەڵام درۆ، زۆرتر چەوساوە پەنای بۆ بردووە. بەتایبەتی درۆی پێشتر بیرلێكراو، یان بە مەرام پەنا بۆ براو. یاخود بە نەخشە بڕیارلێدراو. درۆكردنیش ئاسانە، بۆیە هەركاتێك‌و هەرچی چۆنێك ویسترابێ، بەكارهێنراوە.

چەوساوە، لەبەرامبەر چەوسێنەردا، یان ژێردەستە دژی سەردەستە، بۆ دەربازبون لە مەرگ، یان لە شەڕی نەخوازراو، یان لەكاتی ئەشكەنجەداندا، یان وەكو كارێكی تری نامرۆڤایەتی، یاخود لە كاری بێگاری تاقەت پڕوكێنەر، چەوساوە، بە هەزاران چەشن بڕوبیانوو دۆزینەوە، یان هەواڵ هەڵبەستن، یان درۆكردن، یاخود بوختان داتاشین، هەوڵی داوە لەداوی چەوسێنەرو مەرگ‌و پەلاماردان رزگاری ببێ.

هەڵبەتە، نە جنێودانو نە درۆکردن، ناتوانین بڵێین، تەنهاو تەنها، لەبۆتەی چەوسێنەرو چەوساوەدا قەتیس ماونەتەوە، یان جێگۆڕکێ بە ئاڕاستەو مەرامەکانیان نەکراوە. نە لە زانستی سایکۆلۆژیو نە لە زانستی سۆسیۆلۆژیدا، ئەم چەشنە بلۆکبەندییە بۆ وشەو زاراوەو خووڕەوشت، لەسەر یەك ڕێبازو لەناو یەك چینو توێژدا، نەماوەتەوەو نامێنێتەوە.

زانا سایکۆلۆژیەکان، بەشی زۆری بەشەکانی درۆ، بۆ سەردەمی منداڵی دەیگێڕنەوەو لەناو منداڵانیشەوە، بۆ مێردمنداڵیو گەورەتر، بەرە بەرە درۆ نشونما دەکاتو گەوهەری چەشناوچەشنیش پەیدادەکات. بەڵام لەدوا سەرەنجامدا، لەدێرزەمانەوە درۆ، بۆتە چەکی دەستی چەوسێنەران. چەند منداڵ، بە چەکی درۆ، بە زۆری لەبەر ترسو لە هەڕەشەی گەورەتر لەخۆی، خۆی رزگاردەکات، ئاواش گەورەی چەوساوە، زۆرجار، بەئامرازی درۆ، خۆی لە بەڵای گەورەی چەوسێنەر دەرباز دەکات.

ئێستاش.. زانستەکانی خووڕەوشتی هاوچەرخ: ئەنترۆپۆلۆژی، زانستی کۆمەڵناسی، زانستی لقە جۆراوجۆرەکانی سایکۆلۆژی، وەکو: سایکۆلۆژیەتی تەندروستی، سایکۆلۆژیەتی تاوان، سایکۆلۆژیەتی کۆمەڵایەتی ئادەمیزاد.. تەنانەت سایکۆلۆژیەتی هاورەگەزبازەکانیش.. سەرەڕای تەواوی ئەم زانستانە، هێشتا ئادەمیزاد پێویستی بە پەروەردەی هەمەلایەنەیە کە لە ئافاتی درۆ، درۆزنی، درۆهەڵبەستن، بپارێزرێ. بەڵام تاوەکو ئێستا، پەتای درۆکردن باوە، خراپترین چەشنی درۆش:

درۆی مرۆڤە پێگەیشتوەکانە، ئەمە ترسناکترین نەخۆشی کۆمەڵایەتییە، چونکە بینای کۆمەڵ دادەرمێنێ‌و متمانەی نێوان کەسەکان دەڕوخێنێ. گومان‌و دڵەڕاوکێ لەبری دڵنیابون‌و ئاسودەیی، لەسەر سەرگوزشتەکان دێنێتەئاراوە.[1]

پیاوی گەورەو پێگەیشتوو، پێگەی کۆمەڵایەتیان هەیەو گوێلێگیراون، درۆکانیشیان کاریگەری لەسەر تاکوکۆی کۆمەڵ هەیە.

گرێکوێرەی درۆ، هەتا سەدان ساڵی ئایندەش، پێشبینی لەناوچونی، لەلایەن هیچ زانایەکی سۆسیۆلۆژی‌و سایکۆلۆژیەوە نەکراوە. بمانەوێ‌و نەمانەوێ، نەك لە رۆژهەڵاتدا، بەڵکو لە تەواوی جیهاندا، درۆی شاخداری حکومەت، حیزب، سیاسی، دەزگا، بانق، کەسایەتی، روناکبیر، عەسکەری، ئەدیب‌و نوسەرو هونەرمەندان، هی کۆمەڵەکان، هەیە، ماوە، دەشمێنێ!! (د.دیوید لیبرمن) جوانی فەرمووە کە گوتویەتی:

"لە کۆمەڵێکی نمونەییدا، نە پێویستی بە درۆ هەیەو نە بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە، بەڵام ئێمە لە جیهانێکی فریوخواردودا دەژین‌و بمانەوێ‌و نەمانەوێ لەناو ئەم گەمەیەدا، گیرمانخواردووە." [2]

رێك‌و رەوان وایە.. واش دەمێنێتەوە. هەتا ئەو رۆژەی چین‌و چەوسانەوە دەمینێ؛ هەتا ئەو دەمەی مرۆڤ لەسەر چەوساندنەوەی مرۆڤ دەژی؛ هەتا ئەو سەردەمەی جیاوازی رەگەزەی، نەتەوەیی، رەنگی پێست، لەناودەچێ؛ هەتا ئەو رۆژگارەی نهێنیەکانی گەردون سەراپا دەدۆزرێتەوە. سەرەتای توخمەکانی پێکهێنانی گەردون‌و گیانلەبەر دەسەلمێندرێ‌و دەزانرێ هێلکە لە مریشکە، یان مریشك لە هێلکەیە، بێگومان:

---

[1] الكذب في سلوك الأطفال، اعداد: محمد علي قطب الهمشري، وفاء محمد عبدالجواد، علي اسماعيل محمد، الناشر مكتبة العبيكات، الطبعة الاولى ١٤١٨هـ - ١٩٩٧م. ص(٨).

[2] دروغ گورا در چن دەقیقه بشناسید. دیوید جی — لیبرمن. دکتر حسین رحیم منفرد، ابو القاسم شهلایی، مقدم/ نقش و نگا/ سال نشر: ١٣٨٨. ص(١٦).

درۆی چینایەتی، درۆی کۆمەڵایەتی، درۆی سیاسی، درۆی ئایینیو مەزهەبی، درۆی تاك، وەکو درۆ دەستکردەکانی ئادەمیزاد، وەکو درۆ هەڵبەستراوەکانی مرۆڤ، وەکو درۆ داتاشراوەکانی تاکەکان، لەناو ئادەمیزاددا دەمێنێتەوەو بەردەوامیش زیان بە وڵاتان، دەوڵەتان، سیستەمەکان، کۆمەڵەکان، تاکەکان، حیزب، گروپە سیاسیو روناکبیریەکان دەگەیەنێ.

درۆ تا درۆ، جیاوازە. درۆی هەڵبەستراو هەیە، رەنگە شەڕی گەورەو کارەساتی لێبکەوێتەوە. درۆش هەیە، بۆی هەیە، لە ئانو کاتی خۆیدا، روداوی نالەبار بگێڕێتەوە. درۆ هەیە لەناو بازنەیەکی بچوكو هەشە لەناو گەورەترین بازنەدا، زیان دەبەخشێ. درۆی ئەوتۆش هەن، نەك راستیەکانی ئێستا، بەڵکو راستیەکانی مێژووش دەشێوێننو دەشێلن. بگرە بۆ ئایندەش زیانیان دەمێنێتەوە.

درۆش وەکو هەموو دیاردەیەکی تر، کاتێك باشتر دەرکی پێدەکرێ، کە دەبێتە مایەی ئاشوبو کارەسات. یان دەبێتە مایەی هەڵگێڕانەوەی راستیە مێژوویەکان، کە مێژووی هاوبەشی نەوەیەکن. یان هی هێزێکن، یان هی بەشێکی زیندوی کۆمەڵن!

بەش بەحاڵی خۆم، بەحوکمی تەمەنی سیاسیم، نە کەمم کردووەو نە کەمیشم دیوەو نە درەنگیش هاتوم..

- دەوڵەتانم دیوەو درۆم لە کاربەدەستە گەورەکانیان بیستووە.
- حیزبە سیاسیەکانم دیوەو درۆم لە گەورەو بچوکی بەرپرسیارانو راگەیاندنەکانیان هەستپێکردوەو خوێندۆتەوە.
- لەگەڵ هاوسەنگەرو هاوڕێو کاربەدەستی زۆری حزبیەکەی خۆشم ژیاوومو لەناو ئەمانیش هەبونو هەن، قسەی بەرزو نزمیان کردووەو دەکەن، زۆرجار، تەریق بومەتەوە!!

- لەناو کۆمەڵو کەسوکاریشم، درۆم بیستووەو شەرمەزاریی دایگرتوم.
- ناشڵێم: لەناو ئەو جەنجاڵە سیاسییەو ململانێو کێشمەکێشانەدا، لە شەڕو شۆڕدا، لە سەرکەوتنو شکستدا، لەکاتی لێقەومانو خۆشاردنەوەو کۆبونەوە لەگەڵ دەزگا تایبەتیو گشتییەکاندا، تەنانەت لە ژیانی کۆمەڵایەتیشدا، بێ هەڵەو کەموکوڕیمو ناچاری قسەی ناڕاست گوتنو مانۆڕکردنو تەنانەت فێڵ لە نەیارو دژو دوژمن کردنیش نەبوم. (جاروبار درۆشم کردووە) تەنانەت جاری وا بووە، زانیومە بەرامبەرەکەم مەرامی خراپی بووە، توند بەرپەرچم داوەتەوەو قسەکانیشم بناغەی زانستیان نەبووە. یان هەر لەخۆمەوە بەرگریم لە کەسانو روداو کردووە، کەمتر ئاگاشم لێیان بووە. بەڵام بە خووڕەوشت، خۆم بە دوور دەزانم لە بەدخویی درۆ. بەڵکو درۆزن سەنگی نییە لام. بە کەسوکارەکانیشمەوە.

() () ()

دوای خوێندنەوەی بەناو کتێبەکەی کاك برایم جەلال (چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە) نایشارمەوە، سەرم سوڕما لەم هەزاران درۆیەی کە بە مەرام، بە رق، بە کینە، بە کاردانەوە، بە دوژمنایەتی، بە خۆهەڵکێشان، بە بوختان کردن، بە مل شکاندن، بە سوکایەتیکردن، بە داپۆشینی شکست، بە پارسەنگدانەوەی لاوازی، بە چەواشەکردنی خوێنەر، بە شاردنەوەی ترسنۆکی، بە ئاوەژوکردنەوەی تاوانەکان، بە کەمکردنەوەی بایەخی تێکۆشەران، تەنانەت بە سوککردنی شەهیدانیش، بەڵێ سەرم سوڕما، لەو هەزاران درۆیەی لەدووتوێی (٥٠٦) لاپەڕەی ئەو کتێبەدا، هەڵبەستراوون.

خوێنەر باوەڕ بکات، لە هەر لاپەڕەیەکدا، لایەنی کەم چوار تا پێنج درۆو بوختانو چەواشەکاری تیایە. لاپەڕەی وا هەیە زیاتریش. تێکڕا لەو باوەڕەدام (٢٠٠٠ هەتا ٢٥٠٠) درۆو بوختان هەڵبەستن، لەم کتێبەدا هەن. هەوڵ دەدەم،

ئەو درۆو بوختانانەی خۆم دەیانزانم، راستیان بکەمەوە. دوای وەڵامدانەوەکەشم خوێنەر دەزانێ، ئەو ژمارەو ئامارە درۆیانەی باسکردن، راستە یا نا؟

بۆئەوەی لە لێکدانەوەی بنجو بنەوانی درۆکردن، بەهەڵەنەچم، زیاتر لە (١٠) سەرچاوەم لەسەر درۆ، بە زمانی عەرەبیو فارسی خوێندەوە. هەتا جارێکی تر، هزری خۆم، لەباری سایکۆلۆژیو سۆسیۆلۆژیو سیاسیەوە، دەربارەی سەرچاوەکانی درۆ، ئامادەبکەمو بەهەڵەدا نەچم. خوێندنەوەکانیش، منیان بردە رامانێکی قوڵ؛ بە دەیان کاتژمێر لەمێشکی خۆمدا، بەم لەم دیاردەیە کردەوە. دەمهێناو دەمبرد. مێژووی زانراوی شۆڕشەکەمانم وەبیر خۆم دەخستەوە. کۆبونەوەکانمان دەهێنایەوە یاد. شەڕو شەڕگەکانم وەکو شریتی سینەمایی، لەیادەوەریمدا لێدەدایەوە. کونوکەلەبەری کۆبونەوە نهێنیەکانم تاوتوێ دەکردنەوە.. لە گێڕانەوەی یادەوەریەکاندا، رواوەکاندا، بەسەرهاتەکاندا، لەگەڵ بابەتەکانی ئەم کتێبەی نوسەر بەراوردم دەکردن، لە زۆربەی هەرە زۆریاندا، بەردەوام لەم جۆرە هەڵسەنگاندنو حوکمدانانەی نوسەر سەرم سوڕدەما. دەیان پرسیارم بەمێشکدا گوزەریان دەکرد:

- ئەم نوسەرە، بۆ وای نوسیووە؟
- تۆ بڵێی هاندرابێ؟
- ئاخۆ بەدەسیسە نوسویەتی؟ (*)
- پارەی وەرگرتووە؟
- پیلانێکی بەدەستە؟

---

* چەندین کتێبو سەدان بەڵگەو بەڵگەنامە، بە بڕیاری موخابەراتی یەکێك لە وڵاتانی دراوسێمان، لەدوای راپەڕینەوە، نوسراونو چاپکراوون. من زانیاریم هەیە، ئەو کتێبانە، بەتەواوی نامە نهێنیەکانەوە، چۆن بڕیاری بڵاوکردنەوەیان دراوە.

- نەخشەی هاوبەش لەپشتی نوسینەکەدا هەیە؟
- پیلانگێڕی دیکەی وەکو عێراقچێتیو کوردستانی داتاشراو، لەئارادا هەیە.. تاد؟

هەرچەند، بابەتەکانم رادەژەنیو لەبێژنگی ویژدانم دەدان، سەرەڕای لەڕادەبەدەر خراپی کتێبەکەو لە سنوربەزاندنی پەلاماردانی منو شەهید ئارامو هاوڕێکانم لە کۆمیتەی هەرێمەکاندا، بەڵام ویژدانم رێگەی پێنەدەدام، سەبارەت بە کەسایەتی نوسەر، گومانی سیاسی لە پاکێتی ئەم پیاوە پەیدابکەم. نەمدەتوانی باوەڕ بکەم، نوسەر، بە پارە، یان بە دەسیسە، یاخود بە پیلان، ئەم کتێبەی نوسیووە. سەرەنجام هەر دەگەیشتمە ئەو باوەڕە، کە نەخۆشییە دەرونیەکانی، نوسینەکەی پێ نوسییوە.

لە خەباتی ژێرزەمینیەوە، بۆ خەباتی شاخ، بۆ جیابونەوە، دەیناسم؛ رۆژمێژی ناسینەکەم لەگەڵ ئەم پیاوەدا، لەبەرو لەبیرە. رۆژێك لەرۆژان گومانم لە نیشتمانپەروەری، لە کوردایەتی، لە یەك رێبازی، نەبووەو نییە. بەڵام لە کتێبەکەدا، چۆن چۆنی بابەتەکانی نوسیووە؟ لەگەڵ سروشتی کەسایەتی خۆیو دەرونی خۆیو خو و رەوشتی خۆیدا، راستگۆ بووە؛ لە کەم کەسم دیووە، بیرکردنەوەی، سروشتی، مۆراڵی، بەدەستی خۆی، ئاوا بەرجەستە بکات. کتێبەکەی چۆن نوسیووە؟ کەیلی درۆو بوختان، رقو کینە، لە روانگەی خۆیەوە سەختگیر لەسەر دەستەگەری ناو کۆمەڵە، حەقیقەتی رۆژانەو تەمەنی سیاسیو کۆمەلایەتیشی، کوتو مت ئاوایە.

دوای خوێندنەوەی سەرچاوەکان لەسەر درۆ، بەزمانی فارسی: "١- چرا درمانده ایم؟ نوسەر (حسن نراقی). ٢- دروغ گورا در چند دقیقە بشناسید،

نوسەر (دکتر دیوید لیبرمن). ٣- از کجا بفهمیم کسی دارد دروغ می گوید؟ نوسەر (دکتر دیوید لیبرمن). ٤- فریب نخورید، نوسەر (دکتر دیوید لیبرمن)"

بە زمانی عەرەبیش: "٥- الكذب وأثره في الإنسان، نوسەر (يوسف ميخائيل اسعد. ٦- الأمراض النفسية والعقلية والاضطرابات السلوكية عند الأطفال، نوسەر (د.عبدالمجيد الخليدي — د.كمال حسن وهيي) الطبعة الاولى ١٩٩٧ - دار الفكر العربي/ بيروت. ٧- اسس الصحة النفسية. (د.عبدالعزيز القوصي). ئەمە جگە لە چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی دیکە.

دوای خوێندنەوەو پیاچونەوە بەم سەرچاوانە، لە درۆکردنی سەردەمی منداڵیەوە، بۆ هەرزەکاری، لاوێتی، پیاوێتیو پیرێتی، هەستم نەکرد، توێژەرەوانی درۆ، جیاوازی درۆکردن لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر، دەستنیشان بکەن. واتا: درۆ مۆرکی نەتەوەییو رەگەزی نییە. درۆ، هەروەکو دیاردەگەلێکی هاوبەشی دیکە، بەشێکی خوورەوشتی هاوبەشی گەلانە، لە کولتورو ترادسیۆندا؛ هەڵبەتە درۆ، بە دیوە خراپەکەی. دیاردە مرۆییەکان وان، بە خراپو باشیانەوە، دیاردەو کولتوری هاوبەشن. چۆن، هەستی موزیك، چێژی ئەدەبی، چالاکی وەرزشی، زانست، زانیاری، ئازایەتی، جوانی، جوانکاری، سێکس، خۆشەویستی، سۆز.. تاد. دیاردەگەلی گەشی هاوبەشی مرۆیین. ئاواش: رق، تاوان، کوشتن، بوختان، پیلان، ناهەقی، فێڵ، گرانفرۆشی، دزی، زوڵم، خیانەتکردن، لەوانە درۆکردنیش، دیاردەی هاوبەشن. واتا: ترادسیۆنی ئینتەرناسیۆنالیزمن.

درۆکانی دوتوێی کتێبی (چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە)ش، بەشێوەیەکی گشتی، دەچێتە خانەی درۆی هاوبەشەوە، بەڵام تایبەتمەندێتی کوردانەی خودی نوسەری پێوەدیارە کە زەقو رەق، لەنوسەری گەلانی دیکەی جیادەکاتەوە. رەنگە

لە راستی دورنەکەوتبمەوە گەر بڵێم: بەخوێندنەوەو زانیاری بەندە، لە نوسەرانی کۆنو نوێی کوردەواریو کوردایەتیدا، بەتایبەتی لە بواری مێژوو خوێندنەوەو مێژوونوسینو سیاسەتدا، کاکی نوسەر، لە درۆکردنەکاندا، نوسەرێکە لەم بوارەدا پلەی ئیمتیازی بەردەکەوێ.

() () ()

لە سیاسەتدا، مانۆڕ هەیە، تاکتیك هەیە، تەنانەت جاروبار درۆکردنیش هەیە. هەموو نهێنی شاردنەوەیەك لەدوژمن، بەڵکو لە خەباتی ژێرزەمینیدا، نهێنی شاردنەوە لە دایك، باوك، هاوڕێو دۆستیش، جۆرێکە لە درۆ. لە زیندانداا، نهێنیەکان نەدرکێندرێ، درۆیە. کەچی لەهەمان کاتدا، قارەمانێتیشە. دەیانو سەدان پاساوی درۆ لەبواری سیاسەت هەنو خەڵکیش لەگەڵیا راهاتون. بەڵام لەناو درۆ گشتیەکانی سیاسەتدا، درۆکردن بکرێتە خوو، یان پیشە، یاوەکو بەشێکی زاڵ لە کەسایەتی سیاسەتمەدار، ئەمەیان دەچێتە قاڵبی ئەو درۆیانە کە ناچێتە چوارچێوەی مانۆڕو تاکتیکی سیاسەتی بەدیهێنانی ئامانجەکان. بەڵکو، درۆی زەق لەناو ململانێی سیاسیدا، یان درۆ وەکو خوو، خووڕەوشت، رەفتار، وەکو بەشێکی کەسایەتی سیاسەتمەدار، ئەمەیان نەك بچوکترین خزمەت بە سیاسەتو بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکان ناکات، بەڵکو راستەوخۆ زیانیشی پێدەگەیەنێ. چۆن خۆرکە، ئاسن ئاژن ئاژن دەکاتو دایدەرزێنێ، سیاسەتمەداری درۆزنیش، لەناو هەر حیزبێکدا بێ، لەگەڵ هەر گروپێکدا بێ، ئەو حیزبو گروپە لەبەرچاو دەخاتو دەشبێتە مایەی بێزاری، بێرێزی، سوکایەتی، تەنانەت بێمتمانەییو ئابڕوچونیش.(*)

* لە دووتوێی کتێبەکەدا، دەیسەلمێنم کە نوسەر، چۆن چۆنی ئابڕوی کۆمەڵەی لەناو پێشمەرگەو بارەگاکاندا، دەبرد.

مرۆ.. لەوە تێدەگات، نەتەوەیەکی وەکو کورد، لەبەرئەوەی بەدرێژایی مێژووی، شکستی خواردووەو بێمتمانەیی تیا دروست بووە، مێژوونوسێك، یان نوسەرێك، یان حکایەتخوانێك، یاوەکو شایەتحالێك، بەڵکو شایەرێکیش، لەبەر نەوەکانی نەتەوەکەمان، لەبەرئەوەی سەردارو کەسایەتیە رەمزەکانی لەبەرچاو نەکەوونو شکستەکانیان نەبێتە مایەی نائومێدی نەوەکان، پاساو بۆ شکستەکان، یان بۆ رەفتارو گفتاری چەوسێنەرانە، بۆ هەڵسوکەوتی نەشیاو، هێنراوەتەوە. بەدرێژایی مێژووی هەموو نەتەوەکان، ئەم پاساوهێنانەوانە، بۆ سەرکردەو سەردارە نەتەوەیی، سیاسی، تەنانەت ئاینیو مەزهەبیەکانیش هەبوەو دەشمێنێ.

بۆ نمونە:

حەزرەتی عیسا کە لەخاچ دراوە، بۆئەوەی موریدەکانی نائومێد نەبنو ئاینی مەسیحسیەت دوچاری شکست نەبێ، پەیامی سەرلەنوێ ژیانەوەی مەسیح دراوەتەوە گوێی مەسیحیەکان، ئەمەش هێزێکی مەعنەوی گەورەی بەخشیوەتە پەیام هەڵگرانی مەسیحیەت.. هەتا ئێستاش.

کاتێك دەست کراوە بە کۆکردنەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەر، دەیان هەزار بەسەرهاتو فەرمودەیان، بەناوی پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام سەرەنجام بەشێکی کەم لەو فەرموودانە بەڕاست زانراوە. باقیەکەی بێگومان، ئەوانەی گێڕاویانەتەوە، یان کوتومت وا نەبون، یاخود هەڵبەستراو بون، بۆیە پەسەند نەکراوون.

لەکاتی شکستی بنەماڵەو بنەماڵەخوازەکانی ئیمامی عەلیو ئیمامەکانی تردا (کە پاشان ناونران شیعەگەرا) بەو گفتەی دراوە کە گوایە ئیمامی دوانزەهەم (محەمەدی مەهدی) دەژێتەوەو دێتەوەو ستەم رادەماڵێو دادپەروەری دێنێتەدی، ئەمەش لەڕوی روحیەوە، هەتائێستاش کاریگەری لەسەر روحی شیعەکان هەیە.

روایەت لە ئاینەکاندا زۆرن‌و هەر روایەتێکیش، لەڕووی زانستیەوە، نەك ئەوسا، بەڵکو ئێستاش، کە زانست‌و زانیاری، مێژووناسی، ئارکیۆلۆژی، زۆر گەشەی کردووە، کەچی نەیتوانیوە یەك ریوایەت‌و داستانە باسکراوەکان، زانستیانە بسەلمێندرێ. بەڵام وەکو روایەت، وەکو عەقیدە، ئێستاش کاریگەریان لەناو بەشێکی زۆری خەڵکدا هەیە.

ئەو روایەتانە، لە ژینگەی میتافیزیکی داماڵێن‌و بێینە سەر دونیاگەرایی، دەبینین لەسەر سەرکردایەتی‌و سەردارەکان، لە گێڕانەوەی سەرگوزشتەکاندا، لە گۆرانی، فۆلکلۆر، بەیت‌و حەیراندا، لە پەندی پێشینیاندا، لە داستان، شیعرو بەڵکو نوسینیشدا، پاساوهێنانەوە بۆ گەلێ رەفتاری دزێو، تەنانەت ئارایشتکردنی ئەو رەفتارە دزێوانەش، بەسەر نەوەکانی رابوردودا تێپەڕیوون‌و باوەڕیشیان پێهێنراوە. دەتوانین سەدان نمونە لەسەر راپەڕین‌و شکستی راپەڕین‌و سەردارانی راپەڕینەکان بهێنینەوە. بەشی زۆری درۆکان مەگەر بەدیقەت بناسرێن‌و زۆربەی ئەوانەی درۆکانیشیان هەڵبەستووە، ناناسرێن. بەڵام لەبەرئەوەی درۆکان خراونەتە خزمەتی گشتیەوە، لەپێناوی ئامانجێکی باشدا، درۆکان جێیان گرتووە. زۆرجاریش، لە نەبونی چاپەمەنی‌و چاپخانەدا، گۆڤارو رۆژنامەو ئازادی بیرورادەربڕیندا، درۆکان وەڵام نەدراونەتەوە، یان راستیش نەکراونەتەوە. ئێستاش لەگەڵ راستیەکاندا بەچەشنێ ئاوێتەن، تازە زۆربەیان لەگەڵ راستیەکاندا، یەکالانا کرێنەوە.

() () ()

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە، لەسەردەمی جیهانگیریدا، لە رۆژگارێکدا چاپ‌و چاپەمەنی زۆرن‌و ئازادیشن. لە چاخی ئەنتەرنێت‌و فەیسبوك‌و یوتوبدا، رەخنەگرتن سنوریشی تێپەڕاندووە. شایەتی روداوەکان بەسەدان ماوون‌و بەشێکی

بەرچاویشیان توانای نوسینو رەخنەگرتنو مشتومڕیشیان هەیە، کەچی لەسەردەمێکی ئاوادا، کاکی نوسەر، ئەوەندە چاوقایم بی، ئەوەندە ئاشقی خۆت بی، ئەوەندە رقاویو گیانی تۆڵەسەندنی تیابێ، گوێ نەدەیتە بەدرۆخستنەوەی درۆکانت، کتێبێکی لێوان لێو لە درۆ، بوختانو شکاندن بنوسیت. ئەمەیان کاری نەکردەیە. بەڵام ئەم پیاوە، لەبەرئەوەی مێشکی پڕبووە لە رقو رقەبەرایەتی، بۆیە لە نوسینی ئەم کتێبەدا، ستۆپی نەبوەو گوێی نەداوەتە لایەنی کەمی کاردانەوە بەرامبەری. بێ سڵەمینەوە، بۆ دامرکاندنەوەی نەخۆشیە دەرونیەکانی، چۆن ئارەزووی لێبوبێ، وەکو داستانی مارەکانی سەر شانی زوحاك، درۆی دەرخواردی دەرونی نەخۆشی داوەو جلەوی بەتەواوەتی لێبەرداوە.

() () ()

کە کتێبەکە بڵاوکرایەوەو لەمو لەوم بیست، سەری سەرسوڕمانم بادەدا. کە ئەمو ئەو رۆژنامەش، پەرەگرافو بڕگەیان لێ بڵاوکردەوە، زیاتر سەرنجی راکێشام. کە مامۆستا جەعفەر (فایزل کەریم ئەحمەد)ی هاوڕێی منالێشم، ناملکەی (هەورێکی نەزۆكو مێژوویەکی ناکۆك)ی لەسەر کتێبەکە نوسی. زۆرتر رامام، لەهەمانکاتدا دامام. ئایە: وەڵام بدەمەوە، یان بێدەنگی هەڵبژێرم؟ وردە وردە، بڕیارم دا خۆشم بە وردی کتێبەکە بخوێنمەوە، دوایی بەشێنەیی بڕیار بدەم. کە خوێندمەوەو کەوتمە تاوتوێکردنی وەڵامدانەوەو سەرچاوە خوێندنەوە، بۆ وەڵامدانەوە، دەقێك زۆر سەرنجی راکێشام، کە ئەمەی خوارەوەیە:

"کاتێك سەرنجت بۆ بەڵگەی درۆیەکی بەرامبەرەکەت رادەکێشرێ، دەستبەجێ ئەوەی پێتە ئاشکرای نەکەیت. چونکە کارێکی ئاوها دەبێتە هۆی ئەوەی کەسانی دیکە نەتوانن زانیاریو نیشانەی تر پەیدا بکەن. لەبەر ئەم هۆیە، باشتر وایە

کەمێك پشوت درێژ بکەیت هەتا زانیاریەکانت تەواودەبێو دوای ئەوە بڕیار بدە، لەبەرامبەر درۆکانی ئەودا، چ کاردانەوەیەکت دەبێ". [3]

قسەیەکی هەتا بڵێی جوانە. لەدەقەکەداو لە مەتنی کتێبەکەشدا، بەجوانی دیارە کە نوسەر، چەند قوڵە لە تێگەیشتنی سەرچاوەو کاریگەریەکانی درۆ، بۆیە وشیاری داوە کە دەستوبرد کاردانەوە بەرامبەر درۆزن، خراپە. بەبێ ئەوەی پێشتر کتێبی ناوبراوم، خوێندبێتەوە، بە رێکەوت لەسەر درۆنامەکەی نوسەر، پشووم درێژکرد. ئەمەش سوودی بە خۆم گەیاند. دڵنیام، وەڵامەکەشم بایی خۆی سوود بە خوێنەریش دەگەیەنێ. گەر هەڵەشم کردبێ، لەئێستاوە خوێنەری ئازیز ببەخشنو سەرپشك بن لە راستکردنەوەو رەخنەلێگرتنم.

() () ()

لەکۆتایی ئەم کورتە باسەشدا، لەسەر درۆ، پێویستە ئاماژەیەك بەوەش بدەم، کە درۆکردنیش، بە قۆناغە، یان بە تەمەنە. درۆی خۆڕسکی مناڵ، جیاوازە لە درۆی مێردمناڵو هەرزەکار. هی لاویش جیاوازە، هەروا درۆی پیاوانیش جیاوازن. لەکۆتایی تەمەنیشدا درۆی پیریش تایبەتمەندی بەساڵاچونی هەیە. هاندەری درۆش، بەتایبەتی لەدوای لاوێتیەوە، زۆرن. وەکو: ١- خۆ خەڵەتاندن. ٢- پێنەگەیشتنی کەسایەتی. ٣- زاڵکردنی رواڵەت بەسەر گەوهەردا. ٤- بەرگری لە خود. ٥- ئیرەیی‌و کێبەرکێ. ٦- رقو تۆڵەسەندنەوەی دەرونی.. تاد.

نوسەر، وەکو خۆی نوسیویەتی لەدایکبوی (١٩٤٣) واتا ئێستا تەمەنی (٦٩) ساڵە. ئیتر پێی ناوەتە قۆناغی پیریەوە. زانایان پێیانوایە؛ جۆرێك لە ئاوێتەبونی درۆ، لە تەمەنە جیاوازەکانو لە قۆناغەکانی تەمەندا دەمێنێتەوە. درۆی منداڵو

---

[3] فریب خورید/ دکتر دیوید لیبرمن/ ترجمة (دکتر محمد بهشتیان)، انتشارات بهشتیان – تهران ١٣٩٠، صفحة (٢١).

مێردمناڵ تێکەڵاودەبن. هی مێردمناڵو پیاو، هی پیاو و پیر، ئەو پیاوانەی بەرەو پیری کەمەرکێش دەبن، لە درۆکردندا هەستیارترن، ئەم دەقەی خوارەوە، بەجوانی ئەم راستیەمان بۆ دەردەخات:

پیاوی کامڵ، لەو بوارەی کاری تیادا دەکات، بۆ ناو و ناوبانگی، هەستیار دەبێ. پەرۆشی کەرامەتی خۆی دەبێ، دەشترسێ ناو و ناوبانگی لەکەدار بێ، کە کەسێکیش هەر شتێك باس بکات کەمایەسی بێ بۆی. رەنگە هانا بۆ درۆکردن بەرێ سەبارەت بە بنەچەی..

هەروەها دەڵێ: پیاوی بەتەمەن، وا باسی خۆی دەکات کە؛ کەسایەتیەکی مەزنە، یان ناودارو سەنگینەو خاوەن هەیبەتو پلەیەکی بەرزە.

لە درێژەی لێکدانەوەکەدا، لەسەر درۆی پیاوی گەورە دەڵێ: لەبەرامبەر ئەو کەسەی ناتوانێ تۆڵەی لێبسەنێتەوە، پەنا بۆ درۆکردن وەکو چەکی تۆڵەسەندن، دژی دژەکەی دەبات. دەست بە هۆنینەوەی کۆمەڵێك درۆ دەکات، کە پێی وایە زیان بەو کەسە دەدات. تاد.. [٤]

ئەم دەقانە، لەم تەمەنەدا، بەسەر کاکی نوسەردا جێبەجێ دەبێ. ئەم پیاوە، کە لەم تەمەنەدا، هەزاران درۆ لە کتێبێکدا کۆدەکاتەوە. بێگومان لەپڕ وای بەسەرنەهاتووە. ئەم کەسە، مێژوویەکە لەم کەسایەتیە. من سەردەمی منالی نازانم، بەلاّم لە تەمەنی (٣٥) ساڵیەوە، لەساڵی (١٩٧٦)وە دەیناسم. تۆزقاڵێك خو و رەوشتی نەگۆڕاوە. تەنانەت فەلسەفەی دیالکتیکیشی بەدرۆخستۆتەوە. چۆنم دیوەو ناسیوە، ئەم کتێبەشی ئاوا نوسیووە. بەدرێژایی مێژووی خۆی، پیاوێکی لەشەڕدا ئازا نەبووە. دوورونزیك توخنی شەڕگەکان نەکەوتووە. خۆی بە

---

[٤] بروانە لاپەڕەکانی (١١ و ٤٣ و ٥٨) لە کتێبی (الكذب واثره في الإنسان)، تألیف: یوسف میخائیل اسعد، دار غریب للطباعة والنشر والتوزیع- القاهرة.

کەسایەتیەکی گەورەو جەمسەرێکی ململانێ سیاسیەکان زانیووە، بەبێ ئەوەی کاریگەریەکی ئەوتۆشی لەناو رێکخستنەکەی‌و هاورێکانی‌و دەوروبەریدا هەبێ. تەنانەت لە کۆنفرانسەکاندا، لەبەرئەوەی هاوڕی نزیکەکانی کەسایەتی ئەم پیاوەیان دەناسی، ئەم درێغی نەدەکرد لە بەرگریلێکردنی هاورێ‌و تەکەتولەکەیان، بەڵام لە یەك کۆنفرانسیشدا، هاوتەکەتولەکانی بۆ سەرکردایەتی دەنگیان پێنەدەدا. ئەمە لەکاتێکدا هاوتەکەتولەکانی لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو کۆنگرەکانی یەکێتیدا، خۆیان دەردەچون. بەڵام ئەمیان بەکاردەهێناو دەنگیشیان پێنەدەدا. چونکە دەیانناسی چماڵێکە!! بۆیە، لە هەرسێ کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو دوو کۆنگرەکانی یەکێتیش، بۆ سەرکردایەتی دەرنەچوو.

خوورەوشتی، کە بە شیری خواردویەتی‌و بە پیریش تەرکی نەکردووە،(*) ئەم خوورەوشتەی، لەگەڵ پەروەردەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و کەسایەتیەکەیدا، تەواو تێکەڵاو بووە. ویستویەتی لەم تەمەنەی بەرەو پیریدا، ئیتر تۆڵەی بەرودوا بکاتەوەو کلۆکۆی دەرونی دابمرکێنێتەوە. بەڵام بێئاگا لەوەی، قازانجی سەری مایەشی دەخوات. هەتائێستا، گەر لە پەنای کێشەکاندا، بەناوی تەکەتول‌و عێراقچێتی‌و کوردستانچێتیدا، بۆی چوبێتەسەر، درۆ بۆ خەڵك هەڵبەستێ‌و بوختان داتاشێ، ئەوا لەمەودوا، ئەو باوکە مرد. راستی راستییەو درۆش درۆ.

لەم وەڵامدانەوەیەدا، هەوڵ دەدەم راستیەکان، ئەوانەی دەیانزانم، بیاخەمەڕوو. بەهیوام، خزمەتێك بگەیەنمە مێژوو. ئەو مێژووەی نوسەر بەشێوەیەك شێواندویەتی، من دڵنیام بەم نوسینە، سەرجەمیان راستناکرێنەوە. چاوەڕوانم دڵسۆزانی تریش، چاکی لێهەڵماڵن‌و نەهێڵن، مێژووی هاوبەشی شەهیدو

---

* ئاماژە بەو پەندە کوردیە: (خویەك گرتی بە شیری، تەرکی ناکات بە پیری).

کەمئەندامو قارەمانانی گەلەکەمان، ببێتە پێخۆری دەرون نەخۆشێك، نەك لە کەسمان، بەڵکو لە ویژدانی خۆشی سڵی نەکردۆتەوە.

() () ()

بۆ وەڵامی ئەم جۆرە نوسینەی مێژوو لەلایەن نوسەرەوە، بابی خۆیان سودیان دەبێ، هەتا نوسەرو ئەوانەی وەکو ئەو کتێبی زل زلیان نوسیووە، بزانن، کە مێژوونوسین پێوانەکەی نوسینی کتێبی زلو بەخۆداهەڵدانو شکاندنی کەسانی دیکە نییە. بەڵکو مێژوونوسین، جگەلەوەی زانستە، لەناو ئەم زانستەی مێژووشدا، میتۆدی جیاواز هەیە. ئەوەی هەموو میتۆدەکانی مێژوونوسینیش کۆدەکاتەوە، ئەمانەتی چۆنیەتی گێڕانەوەی رووداوەکانو هەڵسەنگاندنی بابەتیانەی بەسەرهاتو بەڵگەنامەکانە. نەك مەرامی نوسەر، یان خووڕەوشتی دانەر. هەر بۆ بیرخستنەوە:

ئەو مێژوونوسانەی کار لەسەر پرۆگرامی بەڵگە مێژووییەکان دەکەن، دوو چەشنن:

چەشنێکیان: بەڵگە دەدۆزنەوەو لێکدانەوەی هەمەلایەنی لەسەر دەکەن. وەکو کتێبەکانی زاناو مێژوونووس د.کەمال مەزهەر (کوردستان لەنێوان شەڕی یەکەمی جیهاندا).

چەشنی دیکەشیان: ئەوانەن کە بەڵگەو بەڵگەنامەیەکی باش دەدۆزنەوە، بەڵام بیروڕای کورتی خۆیانی لەسەر دەردەبڕن. وەکو هەندێك لە کتێبەکانی نەوشیروان مستەفا (قەڵەمو موراجەعات، حکومەتی کوردستان، کورد لە گەمەی سۆڤیەتدا).

چەشنی دیکەشیان: نوسینەوەی بیرەوەرییە، بە وردو درشتەوە، هەندێکیان هیچ بەڵگەیەك ناخەنە دووتوێیەوە، وەکو هەندێك لە نوسینەکانی (مەسعود

محەمەد)، هەشە، بەڵگەو.. وێنەش دەخاتە ڕێڕەوی بیرەوەری گێڕانەوەکەی.. وەکو نوسینەکانی (محەمەد ڕەسول هاوار)و (چیم دی ئەحمەد خواجە) هەروەها بیرەوەریەکانی ڕەفیق حیملی بەناوی یاداشت، کە بابەتیانەو بەدیدێکی ڕەخنەگرانەش قۆناغەکانی شەڕی یەکەمی جیهانو شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر هەڵدەسەنگێنێ. لە بیرەوەریەکانم، کەریمی حیسامی، ڕوداوەکانی کوردستانو ئێران، لەدوتوێی خوێندنەوەیەکی ڕەخنەئامێز، بەپشتبەستن بە چەندین دیکۆمێنتی گرنگ، نوسی. دیارە مشتومڕو وەڵامیشی بەدواوە هەبوو. لەم دواییەش کتێبە نایابەکەی مامۆستا پشکۆ (ئەزمونو یاد). کە بەکەمترین بەڵگەنامە، زۆرترین ڕاستی ڕوداوەکانی یەکالاکردەوە.

ساڵەهاش، شێوە نوسینی دیکەی مێژوو داهێنراوە، ئەویش مێژووی زارەکی، لە دەوروبەری خۆماندا، لەئێران دەستیپێکراوەو پێی دەڵێن (تاریخ شفاهی) ئەمەش چاوپێکەوتنی دووروودرێژە لەگەڵ کەسایەتیە زیندوەکان، لە بوارە جیاجیاکان. بەتایبەت سیاسەت، وەکو (مصاحبە با کورش لاشایی)و (مصاحبە با ایرج کشکولی). لەناو کوردیشدا، عومەری شێخ موسو سەید برایمی عەلی زادە، هەمان تاقیکردنەوەیان کردووە.

چەند بەڕێزێك، لە حیزبەکان، فەرماندەکانی شۆڕش، سەرکردەو سیاسەتمەدارەکان، پڕیان داوەتە نوسینی بیرەوەریەکانیان، وەکو گێڕانەوەی ڕوداوەکان، بەناوی بیرەوەریەوە، هەتاڕادەیەك بۆ بیرخستنەوەی ڕوداوەکان، مێژووی بەسەرهاتەکان، یادی شەهیدو شەڕەکان سودی بەرچاویان هەیە. بەڵام زۆربەی ئەو یادەوەریانە، ناکرێ بخرێنە چوارچێوەی هیچ یەکێ لە پرۆگرامەکانی مێژوونوسین. بەڵکو هەشیانە زیانی گەیاندۆتە مێژوو، وەکو کتێبەکەی (سەید کاکە) لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانم بڵێم: لەو کەسانەش، نەخوێنەواریان بەمانای وشە چ وەکو خوێنەواریو چ وەکو هوشیاری، تیادایە، کە لایەنی کەمی ئاستی

تێگەیشتنیان لە مێژوونوسینو لە مەسەلە تیۆریو ئایدیۆلۆژیەکاندا نییە. ڕەخنەی بێسەروبەریش لە نوسینەکانیاندا هەیە، کەچی بەقەد ئەم بەرهەمە بەناو نوسینەی (چەپکێك لە مێژوی کۆمەڵە) کە لەدوای خاڵە شیهاب، زیاتر لە کاکە ئارام، بەتەمابوو ببێتە کەسایەتی یەکەمی کۆمەڵە. لایەنی خراپەو ڕقو کینە لە گێڕانەوەی ڕوداوەکاندا، ڕەنگی نەداوەتەوە. پێویست ناکات نمونە لەم کەسانە بهێنمەوە، چونکە هەندێکیان هەر خەریکی قاچاخچێتی، سەرانەسەندن لە ملیۆنێرەکانو ژێربەژێر شەریکایەتی کۆمپانیاکانو بۆیەکردنی سەریان بونایە، باشتر بوو لەم کتێبە کەتە کەتانەی بەناوی نوسینی بیرەوەریو مێژووەوە، بۆیان (تألیف) کراوە!!

() () ()

پێش ئەوەی بچینە سەر وەڵامدانەوەی بۆچونەکانی نوسەرو بیروبۆچۆن لەسەر بێسەروبەری ئەم چەپکە نوسینەی مێژووی کۆمەڵە، دەربڕین، پێمان باش بوو، ئاماژە بە چوار نمونەی جیاواز، لەسەر چۆنێتی خوێندنەوەی مێژوو، مێژوونووسینو هەڵسوکەوتی بەرپرسیارانە لەگەڵ ڕوداوەکانی مێژوو بکەین. کە بەپێی ڕیزبەندی مێژووییان، نمونەکان ئەمانەن:

یەکەم: شۆڕشی ئۆکتۆبەر (ترۆتسکی، لینین، ستالین).

دووەم: شۆڕشی یۆلیۆی ١٩٥٣ لە میسر (جەمال عەبدولناسر، خالید محێدین، ئەنوەر سادات).

سێهەم: پارتیو کوردستان ( بارزانیو کێشەی هەمزە عەبدوڵڵاو مەسعود بارزانی).

چوارەم: ڕابردوو، شەڕی ناوخۆ و لێبوردەیی (مێژووی یەکێتیو مام جەلال)

**یەکەم: شۆڕشی ئۆکتۆبەر**

**(ترۆتسکی، لینین، ستالین)**

ترۆتسکی، سیاسەتمەدار، شۆڕشگێڕو تیۆرسیۆنی بەناوبانگی شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسیا، بەڵکو جیهانیش بوو. پێش‌و پاش شۆڕشی (شوبات-ئۆکتۆبەری ١٩١٧) چەند جارێك لەگەڵ لینیندا، ناکۆك بوەو ململانێیان کردووە. پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەریش، هەتا بە تەوری جەللادەکانی ستالین، لە مەکسیکدا تیرۆر دەکرێ، بەردەوام لەگەڵ ستالیندا، ناکۆکی قوڵی سیاسی، تیۆری، حیزبی‌و چۆنیەتی بونیاتنانی سیستەمی سۆسیالیستی هەبووە. گەیشتە رادەیەك، ستالین وڵات بەدەری کرد. لە تاراوگە، ناکۆکیەکانی ستالین‌و ترۆتسکی قوڵتر دەبێ. کتێبی جۆراوجۆریش لەسەر جیاوازیەکانی خۆی‌و ستالین‌و سیستەمی شورەوی دەنوسێ، وەکو کتێبی (الثورة المغدورة، مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەر.. تاد) ئینجا، کە ترۆتسکی مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەنوسێ، نایەت، ناکۆکیەکانی سەرهەڵداوی رێڕەوی حیزبەکەیان‌و شۆڕشەکەیان‌و ئەزمونەکەی یەکەمین سیستەمی سۆسیالیستی سەپێنراوی شورەوی (کە ترۆتسکیش لەسەرەتاوە ئۆباڵی سەپاندنەکەی دەکەوێتە ئەستۆ) ترۆتسکی نەهاتووە، کێشە کەڵەکەبوەکانی روداوەکان، لەسەر سەراپای مێژووی حیزبەکەیان‌و لینین‌و ستالین، بارگاوی بکات. بەڵکو، وەکو گەورە رابەرێکی مێژوویی، کە لە ئەرکەکانی خوێندنەوەو نوسینی مێژوو، بەوردی تێگەیشتووە، مێژووی لە خانەبەندی قۆناغەکانی خۆیاندا نوسیوەتەوە. لە باسکردنی لینیندا، ترۆتسکی دەنوسێ:

"لینین لەو ماوەیەدا گرنگیەکی حاشاهەڵنەگر بوو. شۆڕش لەنێوان لینین‌و مەنشەفیکەکاندا، شوێنێکی بۆ هەڵوێستە ناڤینەکان نەهێشتوتەوە."

لە درێژەی باسکردنی بابەتیانەی ڕۆڵی لینیندا، دەڵێ:

"هاتنی لینین پەرەپێدانی کاروبارەکانی خێراترکرد. کاریگەری شەخسی لینینیش، یارمەتی کورتکردنەوەی قەیرانەکەی دا. ئایە بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین حیزب بەبێ لینین ڕێگەی چارەسەری دەدۆزیەوە؟ ئێمە ئەم جۆرە دڵنیابونە هەرگیز ناتوانین بسەلمێنین." (*)

گریمان، ترۆتسکی، نەیتوانیووە باسی لینین بەو شێوەیە نەکات، چونکە رابەرێکی گەورەو سیاسیەکی هەڵکەوتوی رۆژگاری خۆی بووە. ترۆتسکیش وەفای بۆ مێژوویەك کە خۆی لە دروستکەرەکانێتی، هەبووە. دەبا دیقەت بدەین، لەسەر ستالین چی وتووە؟ کە هەمیشە ترۆتسکی بەرپرسیاری ستالین بووە. لەپێش‌و لەکاتی شۆڕشی ئۆکتۆبەریشدا، سەنگ‌و کاریگەری لەو زیاتر بووە. سەرەڕای ئەوەی ستالین، لە سەرەمەرگی لینینەوە، غەدری لە ترۆتسکی کردووەو پاشان، پێچەوانەی وەسیەتنامەی لینین، هەڵیکوتایە سەر دەسەڵاتدارێتی‌و سکرتێرێتی پارتی کۆمۆنیستی شورەوی. هەتا سەرئێسقانیش، دوژمنایەتی ترۆتسکی کردو دەکرد. کەچی لە تاراوگەوە، لەوپەڕی ژیانی ناهەموارو ترس‌و بیمی تیرۆرکردنیەوە، لەلایەن ستالینەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە باسی ستالینیش دەکات:

" تایبەتمەندی ستالین، لەناو کۆمەڵێك کەسانی کارامەو کارا، ئەوەیە کە لە مانۆڕە ناوخۆییەکاندا، خاوەن چالاکی، سوربون‌و لێوەشاوەیی خۆی بوو."(+)

---

* تأريخ الثورة الروسية. ترجمة: أكرم ديري — الهيثم الايوبي. المؤسسة العربية للدراسات والنشر- الطبعة الثانية — تشرين اول ١٩٧٨. ص(١٦)

+ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٣٦).

ئەمە نمونەی یەکەمە، کە بەشێوەیەك لە شێوەکان، ئێمەومانانی هاوڕێیانی جارانی کۆمەڵە، ئاگاداری ململانێی بۆلشەویك، مەنشەفیك، مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لینینو هاوسەنگەرەکانی هەینو ساڵەهاش گەرچی پەیڕەوی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگمان دەکرد، بەڵام لەژێر کاریگەری تێزەکانی لینینیش بووین.

**دووەم: شۆڕشی یۆلیۆی ١٩٥٢ لە میسر**

**(جەمال عەبدولناسر، خالید محێدین، ئەنوەر سادات)**

شۆڕشی میسرو سەرۆکەکەی، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لەو بارودۆخەدا، بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی عەرەبو پاشان کێشەی فەلەستین، کە سەریهەڵدا، لەو شۆڕشانە بوو، وەکو دیاردەیەکی سیاسی نوێ تەماشا دەکرا. کاریگەریشی لەناو عەرەبو لە رۆژهەڵاتدا، تەنانەت لە کوردستانو لەناو پارتیو شۆڕشی ئەیلولیشدا، بەرچاو بوو. ئەم شۆڕشە، یان بزوتنەوەو دیاردەیە، لەدورەوە پرشنگی جوانی دەهاویشت، بەڵام لەناوەوەو لەناخەوە، وەکو هەموو شۆڕشێکی دیکەی باشتر لەو شۆڕشەش، بەدەر نەبووە لە ململانێ، کێشمەکێش، بەڵکو پیلانو غەدرکردنیش.

خالید محێدین، سەرکردەیەکی ناوداری شۆڕشەکەو هاوڕێی هەرەنزیکی جەمال عەبدولناسر بووە. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی (١٩٥٢) خالید محێدین، هەر زوو، لەسەر رەفتاری نەشیاوی سەرکردەو فەرماندەکان، سیاسەتی جەمال عەبدولناسرو ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای شۆڕش، کەوتە ناکۆکیەوەو گەیشتە بنبەستیش لەگەڵیاندا. سەرەنجام، جەمال عەبدولناسر، پێشنیازی بۆکرد ماوەیەك وڵات بەجێبێڵێو دوای پێشنیازکردنی چەندین وڵات، بۆئەوەی خالید محێدین دووربێ لەو وڵاتانەی کێشەی سیاسیان زۆرە، بەتایبەتی بزوتنەوەی چەپیان تیا بەهێزبووە،

جەمال عەبدولناسر سویسرای بۆ دەستنیشان دەکات. رازی دەبیٚ‌و دەڕوات. دوای ساڵەها، دێتەوەو سەرۆکی میسر ڕێزێکی زۆری لێدەگریٚ. لەوڵاتدا دەمێنێتەوەو کتێبێك دەنوسیٚ. دوای چەندین ساڵ دەربەدەری‌و ئازاری تاراوگە، دوای ئەوەی خۆی لە سەرکردەکانی دیکەی شۆڕشی میسر بە ماندوتر، پاکتر، ڕاستگۆترو ئازاتریش دەزانیٚ، بەڵام ئەم هەستە بریندارەی تێکەڵاوی ڕوداوەکان‌و ڕاستیەکانی مێژوو ناکات. بەویژدانەوە، باسی ڕۆڵی جوامێرانەو پاکی‌و مێژوویی نەك جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر، بەڵکو باسی ڕۆڵی ئەنوەر ساداتیش دەکات، کە بەشێکی ڕەخنەکانی خالید محێدین پێش سەفەرەکەی بۆ سویسرا، بەرامبەر ئەنوەر سادات بووە. بەڵام ڕوداوەکانی مێژووی، وەکو خۆی، بابەتیانە نوسیووە. بە رق، یان کاردانەوە، یاخود تۆڵەسەندنەوە، دوای تیرۆرکردنی ساداتیش، بیرەوەری خۆی نەنوسیوەتەوە. بەمەش خالید محێدین، سەنگ‌و ڕێزی خۆی زیاد کردووە.

### سێهەم: پارتی‌و کوردستان

#### ( بارزانی‌و کێشەی هەمزە عەبدوڵلاو مەسعود بارزانی )

پارتی، لە پەنجاکانەوە، وەکو درێژەکێشانی ململانیٚ ئایدیۆلۆژیەکانی سەرەتای دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان، لەژێر کاریگەری شورەوی‌و حیزبی تودەی ئێران‌و هەتارادەیەك حیزبی شیوعی عێراقیش، کێشە ئایدیۆلۆژیەکانی قوڵتر بوونەوە. بەتایبەتی لەساڵی ١٩٥٨ وە جۆرێك لە ئازادی ململانیٚ‌و بیروڕا دەربڕین، هاتبوە ئاراوە. باڵێك، بەسەرکردایەتی هەمزە عەبدوڵلا، پاشکۆیەتی حیزبی شیوعیان پیٚ پەسەند بوو. باڵەکەی تریش، بە رابەرایەتی برایم ئەحمەدو مام جەلال، دژی ئەو ڕێبازە بون (هەروەکو بەشەکانی تری کوردستان). ئەم کێشەیە کاتێك سەرهەڵدەدات، بارزانی (سەرۆکی پارتی) هێشتا لە مۆسکۆ

دەبێت. دوای هاتنەوەی، سەرەنجام کێشەکان قوڵتر دەبن. هەوڵی جۆراوجۆریش دراوە ئەم کێشەیە، چارەسەر بکرێ، بێهودە بووە. ئەوکاتە، حیزبی شیوعی لە ناو هەمو ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان لەناودا دابەشکرابوو، سیاسەتی پوازکوتاندنی ئایدیۆلۆژی، لەناو حیزبە سیاسیەکانی کوردستاندا، هەبوو. تەنانەت، سەربەخۆیی حیزبە سیاسیەکانی کوردستانی، لە هەژمونگەری حیزبە شیوعیەکان، پێ خراپ بوو. کێشەکانی پارتی دیموکرات گەیشتنە بنبەست. ئیتر بارزانی بریار دەدات، هێزێکی بچوک بەسەرپەرشتی خۆی لە (٣٩/ حوزەیرانی ١٩٥٩) بنێرێتە سەر بارەگای سەرەکی پارتی لە بەغداد. هەمزە عەبدوڵڵاو هاورێکانی (خەسرەو توفیق، نەژاد ئەحمەد، سالح رشدی، حەمید عوسمان، سالح حەیدەری و شەهابی شێخ نوری.. تاد) دەردەکەن و کێشەکە یەکلایی دەکەنەوە. مەسعود بارزانی، لە کتێبی (البارزانی والحركة التحررية الكردية)دا، ئەو کێشانەو روداوەکەش، ئاوا هەڵدەسەنگێنێ:

"راستە هەمزە عەبدوڵڵاو هاورێکانی حیزبیان بەرەو پاشکۆیەتی تەواوی حیزبی شیوعی بەرێوەدەبردو گەر دۆخەکە، وەکو مانگەکانی یەکەمی ساڵی (١٩٥٩) بەردەوام بوایە، حیزب سەربەخۆیی لەدەست دەداو دەشبووە لقێکی حیزبی شیوعی."

راستیشە دەستێوەردانی راستەوخۆی بارزانی، مەسەلەکەی لە بەرژەوەندی سەربەخۆیی حیزب یەکالاکردەوەو سەنگی حیزبیشی گێرایەوە.. بەڵام بەوشێوەیەی ناکۆکیەکەی بێ چارەسەرکرا، لەروانگەی منەوە، شێوەی نمونەیی چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکیانە نییەو زۆر بەتوندیشی دەزانم.

لەبەرژەوەندی حیزب، وا باشتر بوو نەرمترو لەرێگەی رێکخستنەوە کێشەکە چارەسەرکراباو چارەڕوان بونایە هەتا چوارەمین کۆنگرە کە بڕیاردرابو سەرەتای تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ ببەسترێ، یان کاتی بەستنەکەی پێشخرابا." (*)

**چوارەم: رابردوو، شەڕی ناوخۆو لێبوردەیی**

**(مێژووی یەکێتی و مام جەلال)**

ئەگەر رووداوەکانی رابردوو، بەو رقئەستوورییەی نوسەر بخوێنرێتەوە، دەبوایە، کێشەکانی سەردەمی جەلالی‌و مەلایی، دوای بەیانی ئازار لەناو پارتی، کێشەکانی ئەم شۆڕشەش، لەناو یەکێتی، دووبەرەکی‌و یەکترکوشتن‌و غەدرکردن، لەناو لایەنەکاندا، هەرگیز چارەسەر نەکرابان. کە بەیانی ئازاری دا، پارتی‌و بارزانی سەرکەوتو بون. پارتی شۆڕشگێڕ (جەلالی) ژێرکەوتو بون. سەرەڕای چوار ساڵ شەڕی دوبەرەکی، هەلومەرجێك هاتەپێشەوە، دەبوو لێبوردەیی بەسەر رق‌و کینەدا زاڵکەن. هەردوولاش وایانکرد. من پێموایە، ئەگەر سەرکردایەتی بارزانی بڕیاری یەکگرتنەوەی لەگەڵ پارتی شۆڕشگێڕ نەدابا، سەرکردایەتی پارتی شۆڕشگێڕیش (بەتایبەتی برایم ئەحمەدو مام جەلال) هەمان بڕیاری نەبوایە، دەبوایە لە هەلومەرجێکی تری نزیکی ئەوسای عێراقدا، دووبەرەکی‌و کێشەکان، خراپتر خۆی بە دوبەرەکی‌و کێشەیەکی تر بسپێردایە. چونکە بازنەی ئەو کێشانە، تەنها بە دەرکردنی بەیانی ئازار، یان بە چەککردنی پارتی شۆڕشگێڕ، یاخود بە وروژاندن‌و چەپڵەرێزانی خەڵك، (کە هەڵەی ناماقوڵیش بەرامبەر جەلالیەکان دەکرا) کێشەکان کۆتاییان نەدەهات. بۆیە بڕیاری یەکگرتنەوەکە، بۆ هەردوولا شانازییەکی مێژوویی بوو؛ وەکوتر لەم شۆڕشەشدا..

---

* مسعود بارزاني — البارزاني والحركة التحررية الكردية   الكرد وثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ — ص(٨٢، ٨٣). ١٤/تموز ١٩٥٨ — ١١/ايلول/١٩٦١.

کام هێزی سیاسی له مێژووی نەتەوەکەماندا هەیە، هێندەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دوچاری دوبەرەکیو تەنانەت یەکترکوشتنیش بوبێ. بەشێکی جیابونەوەکان، مام جەلالیان دەکردە ئامانجی دوژمنایەتیکردن. بەڵام کاتێك هەلومەرجی لێبوردنو ئاشتبونەوە هاتەپێشەوە، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەوپەڕی سەرکەوتنو بالادەستیی هێزو جەماوەری زۆر زەبەندا، دەرگای دیالۆگی یەکگرتنەوەی لەگەڵ هەموو لایەنەکان، بەبڕیاری پلینیۆمی شەقلاوە- ١٩٩٢، کردەوە. ئەو لایەی غەدری لە یەکێتی کردبوو، یەکێتی لەگەڵی ڕێککەوتەوە. ئەولایەی غەدریشی لێکرابوو، لەگەڵ یەکێتیدا یەکیگرتەوە. ئەمەش لەلایەن هەموو لایەنەکانەوە (یەکێتی، حیزبی سۆسیالیست، ئالای شۆڕش) بەرزبونەوە بوو بۆ ئاستی بەرزی لێپرسراوێتی مێژوویی، بۆ سەرخستنی یەکەمین ئەزمونی دیموکراسی کوردستان.

- **تاوانی شۆڕشگێڕان:**

وا دیارە، شۆڕشەکانی جیهان، بەجیاوازی ڕێبازی سیاسیو ئایدیۆلۆژیو پێگەی چینایەتی رابەرایەتیانەوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان، لە خەسڵەتی دوو دیوی، یان دووفاقی، یاخود پێش سەرکەوتن بەجۆرێكو دوای سەرکەوتن بەجۆرێکی دیکە ساغ دەبنەوە؛ هەموو شۆڕشەکان، لەو دوو خەسڵەتییە، بەدەر نەبون.

سەرکردایەتی حیزبەکان، چەپو ڕاستو ناوەڕاست، هەموو شۆڕشەکان، چینایەتیو نیشتمانی، تێکڕایان لەکاتی ئۆپۆزسیۆنو شۆڕشو ڕاپەڕیندا، بەرنامەو پەیامو پەیمانیان جۆرێکە، لەکاتی هاتنە سەر حوکمیان، هەندێك جار پێچەوانەکەی جێبەجێ کراوە. جاروبار لاشیانداوە. بەڵکو مێژووی شۆڕشو شۆڕشگێڕانو دیموکراتخوازانیش، پڕە لە تاوان، لە هاوڕێ کوشتن، لە سەرکردە

لەناوبردن. لە غەدر. لە دیاگۆگیەت. لە روداوی سەیرو سەمەرەی ئەوتۆ، لەناو لاپەڕەکانی مێژوودا، تانەو تاوانی گەورەن.

لە سەدەی هەژدەهەمەوە، یەکەمین شۆڕشی دیموکراسی لە بریتانیادا وابووە. شۆڕشی دیموکراسی ئەمریکاش هەروا. خۆ شۆڕشی فەرەنسا، تاوانی ئەوتۆی تیا کراوە، ئێستاش شوێنەوارەك شەرمەزاریەکانی لە کوشتنی سەرکردەکانو قەلاچۆکردنی کرێکاران ماوە. لە ئیتالیاو ئیسپانیاو شیللیو ئەمریکای لاتینیش هەروا.

شۆڕشەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهان، لە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە، بۆ شۆڕشی چینو سیستەمەکانی رۆژهەلاتی ئوروپا، لاوس، کەمبودیا.. تاد، نەك لەسەردەمی ستالینەوە، لە روسیادا، بەلکو لەسەردەمی لینینیش، گەیەندرایە رادەیەك کە پەلاماری بلیخانۆفی فەیلەسوفی شۆڕشەکەو مامۆستای لینینیان دا، کە بۆ یەکەمین جار مانیفێستی کۆمۆنیستی کردوە بە روسی، دوای ئەم ئیهانەیەو مالپشکنینی، کۆچی دوایی دەکات. جگە لەم رەفتارە لەسەردەمی لینیندا، پێشێلکاری بەرامبەر رێبازو ستراتیژ کراوە. هەر لەوەی پۆلۆنیا پەلاماردرا، هەتا دەگاتە ئەوەی تاوان بەرامبەر جوتیاران، سەربازە راپەڕیوەکانو بەلکو کرێکارانیش کراوە.

- چین دوور لە کاریگەری ئایدیۆلۆژی:

لە چیندا، نوسینی مێژووی نوێ، لەسەر کەسایەتی (ماو) هەتا دەگاتە پاکتاوکردنی حیزب، پاکتاوکردنی ناوچە ئازادکراوەکان، شۆڕشگێران، لە گەرمەی شۆڕشدا. پاشان دوای سەرکەوتن، بەتایبەتی لەسەردەمی شۆڕشی رۆشنبیریدا، کە رەشبگیریی تیا سەپێنراوە، سەرکردەو رابەری بەتوانای تیا نابوت کراوە؛ پاشان

هەر رابەرانی پارتی کۆمۆنیستی چین، پاشگەزبونەتەوەو ئەو رابەرانەیان هێنایەوەو کردیاننەوە بە گەورەترین دەسەڵاتداری چین.

جگە لەو شارستانیەتە دێرینەی هەزاران ساڵە بەردەوامە، خەباتی رزگاری نیشتمانی چینیەکان، بە رابەرایەتی پارتی کۆمۆنیستو سەرۆکەکەیان ماوتسیتۆنگ، کاریگەریەکی فراوانی لەسەر خەباتی رزگاریو دیموکراسی گەلان دانا. بەڵام بەداخەوە، ئەم سەنگو کاریگەرییە، ماوەیەکی باش، لەسەر ئاستی جیهانو ناوخۆش، دوچاری هەڵدێری گەورە کراوە. کۆمەڵە، لە دامەزراندنیەوە، پەیڕەوی لە سیاسەتو ڕێبازی چینو ماوتسیتۆنگ کردووە. ئێستا (٤٢) ساڵ بەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەو زیاتر لە نیو سەدەش بەسەر سیاسەتی تایبەتی چین، لەناوخۆو دەرەوەدا، تێدەپەڕێ. هێشتا، ئەو مێژووە، هەڵنەسەنگێنراوەو مێژووی پەیڕەویکردنی ڕێبازو سیاسەتی چینیش لەلایەن کۆمەڵەوە، تاوتوێ نەکراوە. لە (چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە)ش، ئەو مێژووەی، وردەکاریەکانی، مەسەلە سیاسیو ئایدیۆلۆژیەکانی، دوای دەرکەوتنی تەواوی ڕاستیەکان، دوای ئەوەی چینو چینیەکانو پارتی کۆمۆنیستی چینیش، لە هەشتاکانەوە، کەوتونەتە ڕەخنەلەخۆگرتنو دەستنیشانکردنی هەڵدێر، لادانو بادانەکانیان، هێشتا نوسەر، دوورونزیك بەو ڕێڕەوەدا گوزەری بابەتیانەی نەکردوەو کوتومت، وەکو جاران دەڕوانێتە ئەو مێژووە. کە لەڕاستیا، بۆ کوردیش، کاتی خوێندنەوەی هەمەلایەنەی ئەو مێژووە هاتووە. بەڵام خوێندنەوەیەك، بابەتی بێ. بەرەنجامی هەبێ. بە مەرامو کاردانەوەش نەنوسرابێ.

کۆمەڵە لە (بەغداد- ١٩٧٠/٦/١٠) دامەزرا. پێش ئەوە بە دوو ساڵیش، لەناو پارتی شۆڕشگێڕی کوردستاندا (جەلالی) لە (بەکرەجۆ)دا گفتوگۆ لەسەر چینو شورەویو ماوتسیتۆنگ هەبووە. بەڵکو لە رۆژنامەی عەرەبی (النور- ١٩٦٨/١٠/١٢)و گۆڤاری (رزگاری—١٩٦٩/٤/٢٠)و رۆژنامەی (هاوکاری-

۱۹۷۰/۱/۹)یش، ئەم مشتومڕە تیۆریو ئایدیۆلۆژییو فەلسەفیانە، نوسراونو بڵاوکراونەتەوە. بەتایبەتی، لەدوای هاتنی (سازمانی ئنقلابی حیزبی تودەی ئێران- ۱۹٦۸). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە چەپەکانی ناو پارتی شۆڕشگێڕان، پاشان دامەزرێنەرانی کۆمەڵەش، دوو ساڵ پێشتر، ماوەیان هەبووە؛ لەو ماوەیەدا، سەرکردەی شارەزای ڕێکخراوێکی ئێرانی، بەئەزمونێکی بەرچاوی جیابونەوە لە حیزبی تودەی شورەوی پەیڕەو، هاتبون خۆیان بگەیەننە شۆڕشی پارتیزانی باڵی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بە ڕابەرایەتی شەهیدان سلێمانی موعینیو مەلا ئاوارەو ئیسماعیلی شەریف زادەو... لە سلێمانیێ بەکرەجۆدا گیرسانەوە. هەروا، ڕۆژنامە، گۆڤار، بارەگاو بنکەکانی پێشمەرگەو حیزب، هەمووی بە ئازادی لەبەردەستیان بووە. کاتیان هەبووە. سەفەریان کردووە. دوای ئەم ساڵە لە گفتوگۆ، لە نوسین، لە باسو خواستی فەلسەفیو تیۆریو ئایدیۆلۆژی، کە کۆمەڵە دادەمەزرێنن، ئایدیۆلۆژیەتو ڕێبازی کۆمەڵەیان لەوکاتەدا، بە چینو ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ بەستەوە. دژایەتی شورەویو ڕۆژهەڵاتی ئۆروپا کرا. با لێرەدا بپرسین:

ئایە، هەڵبژاردنی ئەو ڕێبازە، بە لێکۆڵینەوەی ورد، دوای ئەو ساڵانە کراوە؟

ئەمە گرنگترین پرسیارە، هەتا بزانرێ پرۆسەی دامەزراندنی کۆمەڵە تەندروست بووە، یان نەء؟

پێش ئەوەی بیروڕای خۆم دەرببڕم، دەمەوێ پێشەکیەك لەسەر وەڵامەکە، لەسەر بنچینەیەکی دیالکتیکی لەسەر قۆناغەکانو ڕێڕەوی پەرەسەندن، هەروەها، بردنەوەی ڕوداوەکان بۆ ناو ئەو ڕێڕەوەو سەرەنجام، ئەنجامی لۆژیکی دەربخرێ، بڵێم:

هەڵبەتە، فەلسەفەی دیالکتیك؛ ڕێڕەوی سەرهەڵدان، پەرەسەندن، نشونماکردن، بەرە بەرە گەورەبونو لەناوچون، پێکەوەدەبەستێ. هەموو دیاردەو

دەركەوتەیەكیش، بەپێی لۆژیكی دیالكتیك، دەبێ ببرێتەوە دۆخی سەرهەڵدان، پاشان نشونماو دواسەرەنجام. لەم روانگە دیالكتیكیەوە، ئەگەر بەدابڕاوی لە روداوەكانی سەردەمو روداوەكانی ناو چین، ململانێكانی ناو چینو چینو شورەوی، سەیری دامەزراندنی كۆمەڵەی ماركسی – لینینی بكەینو پاساوی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ، وەكو رێكخراوێكی بێ زانیاریو هەواڵ لەو روداوانە سەیر بكرێ، دەتوانین بڵێین:

كۆمەڵەش.. هەر دەبوو، بە رێڕەوی پەرەسەندندا تێبپەڕێو قۆناغی ئەزمونكاری ببڕێ، پاشان، دوای ئەزمونێكی شیاو، بەخۆیدا بچێتەوەو هەڵەكانی راستبكاتەوە. گەر بەدابڕاوی سەیری مێژووی دامەزراندنی كۆمەڵە بكرێ، وا دەكەوێتەوە. بەڵام..

كاتێك كۆمەڵە دادەمەزرێ، پێشینەی بۆ رەخسێندراوە. هەواڵە جیهانیەكان زانراوون. بەرنامەو كێشمەكێشەكانی ناو خودی چینو، چینو شورەوی، نەك كوردستان، بەڵكو جیهانی تەنیوەتەوە. ئینجا كۆمەڵە، لەسەر ئەو رێبازە، ساغبۆتەوە. ئەمە زەمانی شێخ مەحمودی نەمر نییە، بە مانگێك تەلەگرافێكی دەستنەدەكەوتو زۆر كەم ئاگای لە جیهان بووە. زەمانی راپەرینی چلەكانی بارزانیەكانیش نەبووە، بێتەلو تەنانەت رادیۆیەكی شەخسیشیان لە شاخدا نەبووە. شۆڕشی ئەیلولیش نەبووە، بەهەزار ئەملاوئەولا، بەچەند ساڵێك، بێتەلە شكاویان پێكەوەناوەو كەمێك زانیاریان دەستكەوتووە.(*) ساڵی (١٩٧٠) ساڵی

---

* مانگێك لەمەوبەر، خۆم لە (شەوكەتی مەلا سمایل)م بیستووە، كە یەكەمین جار، ساڵی ١٩٦٢ لە پارچەی شكاوی بێتەلە دەستكەوتوەكان، جیهازێكی بێتەلی پێكەوەناوەو خستویەتیە كار. دەستیكردووە بە چاودێریكردنی بێتەلەكانی حكومەتو بە سەلیقەیی خۆی، شیفرەو نهێنیەكانی دۆزیونەتەوەو بروسكەكانی ساغكردۆتەوە. كە بروسكە ساغكراوەكانی بۆ بارزانی بردووە، سەرەتا زۆر بایەخی نەداوەتێ. بەڵام پاشان، خۆی ناردویەتی بەدوایداو هەموو رۆژێك داوای بروسكەی ساغكراوەی دوژمنی لێكردووە.

گەورەترین ململانێی سەردەم بووە لەنێوان، چین و شورەوی. سەردەمی جەنگی سارد بووە لەنێوان جەمسەرەکانی رۆژئاواو رۆژهەلات. سەردەمی رادیۆ، تەلەفزیۆن، بێتەل، تەلەفۆن، فڕۆکەخانە، دەرچونی هەزاران کتێب، گۆڤار، رۆژنامە.. تاد. سەردەمێك بووە، تەنانەت کۆمەڵە خۆیشی کتێبخانەی لە بەغداد دامەزراندووە. نامیلکەکانی (ماو، کیم ئێل سونغ و لین پیاو)یان بەهەزاران تیراژ، وەردەگێڕاو چاپیان دەکردن. لەسەردەمێکی ئاوای پێشکەوتودا، کۆمەڵە دادەمەزرێ و ئەو ستراتیژەی بۆ گەڵاڵەدەکرێ.. کە پڕۆچێن بێ.

ئەگەر، دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، ئەو دیاردەو دەرکەوتانەیان ورد خوێندبێتەوە، کە لەو سەردەمەدا، ململانێ و کێشمەکێش هەبووە لەنێوان شورەوی و چیندا، بەڵکو لە پەنجاکانەوە، لەناو خودی چیندا، ئینجا، دوای وردبونەوە لە مەسەلە تیۆری و کێشمەکێشەکان، کۆمەڵەیان بەو رێبازە چینییەو بەو پاشکۆیەتیە بۆ ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ، دامەزراندبێ. کەوابێ هەڵەیەکی بونیادی گەورەیان کردووە، چونکە چین لەناو خۆیدا، دوچاری جۆرەها قەیران بووبوو. کێشەکانیان گەیشتە رادەی زۆر ناخۆش، بەتایبەتی لەوکاتەدا، وتیان (شۆڕشی رۆشنبیری) بۆ سەرکوتاندنی ریڤینیزم و راستڕەوان، بەرپادەکەین. کە هیچی وا نەبوو. واش دەرنەچوو. خۆشیان پاشگەزبونەوە. بۆئەوەی بزانرێ کێشەکانی چین لەکەیەوە سەریهەڵداوە. چۆن چۆنی گەیشتۆتە ئەنجامدانی تاوانی مەترسیدار لەسەر تێکۆشەران و شەرعیەت و چارەنوسی چین و پارتە حوکمڕانەکەی، وا چاکە پانۆرامەیەکی مێژووی سەرهەڵدان، قولبون، تەقینەوەو تاوانکردن، دەوروبەری بیست ساڵیش پێش دامەزراندنی کۆمەڵە، بخەینە پێش چاو، هەتا بزانرێ کە کۆمەڵە دامەزراوە، چۆن چۆنی، ئەو راستیانەی بیست ساڵ پێشتر، کە بەدونیادا بڵاویشکراونەتەوە، لەبەرچاو نەگیراوون:

تشرینی یەکەمی (١٩٤٩) کۆماری چینی میللی دامەزرا. ئەمەش وەرچەخانێکی مێژوویی بوو، بۆ چین و تەواوی گەلانی ئازادیخواز.

١٩٥٨؛ بەناوی قەڵەمبازی مەزن، دەستکرا بە دروستکردنی تەلاری بەرزو هۆڵی گەورە گەورە، سەرپشکەوتن. ئەمەش وایلێکردن، لەو باوەڕەدابن دەتوانن لەبواری پیشەسازیشدا، سەرکەوتنی گەورە بەدەستبێنن. هەڵمەتێکیان لەمبارەشەوە دەستپێکرد. سەراپا خەڵکیش بەقسەی دەکردن. گەرچی بەرهەم زیادی کرد، بەڵام فشاری ئایدیۆلۆژیان گەیاندە رادەیەك لە گۆڤاری (شیکان)ی تایبەت بە شیعر، بڕیار بدەن بەرهەمی شیعر زیادبکەن و لە سەرگوتاردا گفتیان دابوو (٢٠) هۆنراوەی داهێنراو بنوسرێ. لەوانە داستانێکی مێژوویی و (١٥) پارچە پەخشان!

هەڵبەتە، زۆری نەبردووە، لەبەر نەبونی پلان و نەخشە، کێشەی ئابوری گەورە سەریهەڵداوە: قەیرانی گواستنەوە، کەمبونی کەرەسەی خاو، دابەزینی ئاستی وزە، پیسبونی ژینگە، تەنانەت داپاچینی ملیۆنەها دار لەناو سەرما،.. تاد.

ئەو شکستانە، لەناو پارتی کۆمۆنیستدا، رەنگیدایەوەو بەرە بەرە کەوتنە رەخنەلێگرتنی تاکپەرستی و نەبونی ستراتیژی زانستی. ئەم رەخنەیە لەناو هەشتەمین کۆنگرەی حیزبەکەدا (ئەیلولی ١٩٥٦) خرایەروو. باسی بڕیاری بەکۆمەڵیش پەسەندکرا.

لەهەمووی سەیرتر ئەوەبووە، لە کۆنگرەکەدا، ئەو هەموو کێشەیە هەبووە. قەیران سەریهەڵداوە. تاکپەرستی رەخنەی لێگیراوە. پیشەسازی لاواز بووە. ئاستی ژیان نزم بووە.. کەچی گوتوشیانە: سیستەمی سۆسیالیستی بونیات نراوەو ناکۆکی سەرەکیش لەنێوان کرێکاران و بۆرژوازیدا نەماوە. بەڵکو ناکۆکی لەنێوان پێویستی پەرەسەندوی خێرای خەڵك لە ئابوری و روناکبیریدا لەبەرامبەر بێتوانایی بەدیهێنانی ئەو پێویستیانەی خەڵکدایە. لەسەر ئەم پرنسیپانەش، کۆنگرە بون بە دوو باڵەوە، باڵێکی داوای بەدیهێنانی سۆسیالیزمی بە قۆناغ و شێنەیی دەکرد. باڵەکەی تریش، داوای سەپاندنی سۆسیالیستی بە قەڵەمبازی گەورە دەکرد. هەر لەم کۆنگرەیەدا (لیوتشاو تشی)و (دینگ شیاو پینگ) دژی توندڕەوی چەپگەراو

سیاسەتی پەرستنی ماو وەستان. لەمەشەوە، بناغەی دووبەرەکی لەناو پارتی کۆمۆنیست، دارێژراوە.

- لە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی کە لە تشرینی یەکەمدا (١٩٥٨) کراوە، بەراشکاوی باسی دۆخی مەترسیداری کۆمۆنەکان، سیاسەتی ئابوری قەڵەمبازی گەورە، دابەزینی ئاستی گوزەرانی خەڵك، بەڵکو هەندێك ناوچە کەوتبونە دژایەتی حیزبیش. (ماو) هەستی بە فراوانبونی فشارەکە لەسەر خۆی کردبوو، بۆیە کەوتە پاشەکشە لە بڕیارەکانی. بەڵام وەکو مانۆڕا تەنانەت ماو بۆ سەرۆك کۆماریش خۆی هەڵنەبژاردەوە.
- لەساڵی (١٩٦٤) وە.. ماو کەوتۆتەوە داڕشتنی نەخشەی نوێ بۆ هێرشێکی تر، دژی ڕاستڕەوە بۆرژواکان!! سەیرەکەش لەوەدایە لە بواری هونەرو ئەدەبەوە، دەستیپێکردووە. لەمەشەوە، پزیسکی شۆڕشی بەناو (ڕۆشنبیری) دەستیپێکرد. ئەمەش لەساڵی (١٩٦٥)وە لە شانۆگەریەکەوە تەقیەوە بەناوی (لێبوردنی های) لە نوسینی نوسەری چینی (ووهان).

بۆ ڕێکخستن و ئاراستەکردنی (شۆڕشی ڕۆشنبیری) لەمانگی ئایاری (١٩٦٦)دا، ماو، سەرکردایەتی (ناوەندی شۆڕشی ڕۆشنبیری) کرد. کە ئەمانەیان تیا بوو: (١- لین پیاو. ٢- جیانگ تشینگ- هاوسەری ماو. ٣- تشن بودا – وەزیری موخابەرات، سەرۆکایەتی ناوەندەکەیان دەکرد). هەر ئەوکاتە لەژێر دروشمی (بارەگای سەرکردایەتی بۆردومان بکەن) واتا سەرکردایەتی حیزبی کۆمۆنیست، دەستیان بە هێرشکردنە سەر نەیارانی ماو کرد. بەتایبەتی دژایەتی (لیوتشاو تشی)و (دینگ شیاو پینگ). بەرەسمیش شۆڕشە ڕۆشنبیریەکەیان ڕاگەیاند. لە (٥) جێگری سەرۆکی حیزب، تەنها (لین پیاو) یان هێشتەوە. تەنانەت (شو ئین لای) یشیان لێخست.

ئەوەی جێگەی تێڕامانی توێژەرانی پارتی کۆمۆنیستی چین و تەواوی پارتە چەپەکانی جیهانن، سەریان لە بڕیارێك لەوکاتەدا سوڕماوە، کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

"هەموو خوێندکار، شۆڕشگێڕەکان، لە هەر هەوڵێك بۆ دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات، کە دەیدەن، هەر تاوانێك بکەن، جگە لە کوشتن و سوتاندن و ژاراویکردن و دزینی موڵکی

دەوڵەت، لێیاندەبوردرێ. بەڵام باقی کردەوەکانیان لە لێدان، تەوهین پێکردن، بارمتەگرتن هەتا مردن، ئابلۆقەدان، بە رای سەرۆک ماو رەوایە. ئەنجامدەرانی سزانادرێن. ئەم بڕیارەش زەمینە رەخساندن بووە بۆ دامەزراندنی بەتالیۆنەکانی پارێزەرانی سوور لە خوێندکارو لاوی هەرزەکار." (*)

- لە (١٨/ ی ئابی ١٩٦٦) لە گەورەترین خۆپیشاندانی خوێندکاران و لاواندا لە مەیدانی (تیان ئان مین) لەناوەڕاستی (پەکین- بەیژین)دا، بەتالیۆنەکانی پارێزەرانی سور بەئامادەبون و بڕیاری ماوتسیتۆنگ، دامەزرا. بەمەش، ئاراستەی خوێندکارو لاوانی بۆ تێکوپێکشکاندنی (جیهانی کۆن) دیاریکرد. بەئامادەبونی ماو و (لین پیاو)ی هاوڕێی فێستیڤاڵی (١١) ملیۆنی خوێندکاران و لاوان، دەستپێکرد.

هاوینی (١٩٦٦) تیپەکانی پارێزەرانی سور، سەرۆکایەتی زانکۆی بەیژین و بارەگای حیزبیان داگیرکرد. سەرۆکی زانکۆکەیان بە دیل گرت و کڵاوێکی کاغەزین و سەبەتەی خاشاکیان خستە سەری و بەهوتافی بەرگریکردن لە ماو، دژایەتی کۆنەپەرستی، دەیانگێڕا. دوای لێدانێکی زۆر، سەرۆکی زانکۆ بەچۆکدا هات. سودی نەبوو. ناچار گریاو داوای بەزەیی کرد. وەڵامەکەی، لێدان و جنێوی زۆرتر بوو. لە دوا کاری ناشریندا، مرەکەبی رەشیان بەروخساریا پژاند. هەروەها، بەرامبەر (٥٠) مامۆستای تری هەمان زانکۆ، هەمان رەفتار ئەنجامدرا.

لە (١٧) ئەندامی مەکتەبی سیاسی تەنها (٣) کەسیان لێیانەدراو لە مەیدانەکانی بەیژیندا، نەکرانە داهۆڵ. ئەو سێ کەسەش (ماو، لین پیاو، شو ئین لای) تەنانەت کچ و کوڕی سزادراوەکانیشیان دەگرت و ناچاریان دەکردن، لەبەردەم خەڵکدا بڵێین: باوکمان خیانەتی لە سەرۆک ماو کردووە.

* تجارب الصين من التطرف الى الاعتدال – ترجمة: محمد خير الوادي – دار الفارابي – بيروت – لبنان – الطبعة الاولى ٢٠٠٨ – ص(٣٣).

دوای ئەوەی سەرۆك کۆماری چین (لیو تشاو تشی) ناچارکرا واز لە سەرۆکایەتی بێنێ. وازیان لێنەهێنا. بە لێکۆڵینەوەی ساختە، کردیانە جاسوس، تێکدەر.. تاد. پاشان گیرا. ئەشکەنجە درا. تەنانەت نەیاندەهێشت دەرمانی نەخۆشی شەکرەکەیشی بخوات. سەرەنجام، لەگۆ کەوت. نەیانهێشت سەری بتاشێ، قژی هەتا سەرشانی هات. بەم شێوەیە، سەرۆك کۆماری چین مایەوە، هەتا ساڵی (١٩٦٩) بەحەسرەتی ئەو تاوانەوە، مرد.





**وێنەی سەرەوە: لیو تشیاو تشی دوچاری لێدان دەبێت**

**وێنەی ناوەند: هاوسەری تشیاوتشی بەدەست پاسەوانانی سوورەوە**

**وێنەی خوارەوە: لیو تشیاو تشی لەژێپێلەقەی پاسەوانانی سووردا**



دوای چوار ساڵ لەو روداوانە (١٩٦٩) کۆنگرەیان بەستو سیاسەتو ستراتیژی ماویان چەسپاندەوە. (١٩٧٠) دەستوری پەسەندکراویان تێهەڕاندو ماوتسیتۆنگیان کردە پێشەوای دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا. لین پیاویش جێگرەوەی. هەمان ساڵ، لین پیاو لە هەوڵی کودەتایەك شکستی خواردو لەکاتی هەڵهاتنی، رۆژی ١٣/ی ئەیلولی ١٩٧٠ لە سنوری کۆماری مەنگۆلیا، کەوتەخوارەوەو مرد. (١٩٧٤)یش، ماو هەستی بە پیلانگێڕی هاوسەرەکەی کردو، رەخنەی لێگرت. (١٩٧٥) بەئاشکرا دژی کەوتە قسەکردنو ناوی لێنان (چوار چەتەکە) (١٩٧٦) هەر (چوار چەتە)کە گیران.



وێنەی چوار چەتەکە

چین؛ سەرەنجامی ئەو کێشانە، جێگیربونی دۆخی سیاسی، بەخۆیەوە نەبینی. هەتا ساڵی (١٩٨١) کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیست کۆبونەوەو دۆخەکەیان، بەتایبەتی شۆرشە رۆشنبیریەکەیان، بەوردی هەڵسەنگاندو دوای ستایشی شۆڕشی چینو رزگارکردنی رۆڵی ماو، بەراشکاوی رەخنەشیان لە ساڵانی (١٩٥٦ – ١٩٦٦) هەتا سەرەتای هەشتاکان گرتو بڵاویانکردەوە کە هەڵەی کوشندەی هاوڕێ ماو، لە دە ساڵی بونیاتنانی سۆسیالیزمدا کە لە (١٩٥٦ وە هەتا ١٩٦٦) واتا پێش بەرپابونی شۆڕشی رۆشنبیری، بێبەری نەکرد، راپۆرتەکە کوتومت دەڵێ:

**هاوڕێ ماو، ململانێی چینایەتی، کە هەر بوونی نەبووەو تەنها لە سنورێکی دیاریکراوی کۆمەڵی سۆسیالیستیدا هەبووە گشتاند، لەسەر بیروڕاکانی خۆی کە بۆ دژایەتی راستڕەوەکان دەریدەبڕین، سوور بوو.**

هەروەها لەو هەڵسەنگاندنەدا هاتووە:

**"هاوڕێ ماو و هەندێك لە هاوڕێکانی، بەدەستکەوت و سەرکەوتنەکانیان لەخۆبایی بوبون. هەوڵی بەخێرایی بونیاتنانی ئابوریان دا. لە توانستی بەڕێوەچونی خۆیی مرۆڤیشیان پێ لێ هەڵبڕی، بۆیە دەستپێشکەریان لە قەڵەمبازی گەورە بۆ پێشەوە کردو بەشێوەیەکی شێتگیرانەش کۆمۆنە میللیەکانیان، بەبێ پشکنینی وردو تاقیکردنەوەی پێشینە، دەسەپاندو سەرەنجام هەڵەی چەپگەرایی.. بەشێوەیەکی ترسناك تەشەنەی سەند." (*)**

**لەکۆتاییدا راپۆرتەکە جەخت دەکاتەوە کە:**

**"شۆڕشی رۆشنبیری گەورە کە (١٠) ساڵی (لەساڵی ١٩٦٦ وە هەتا ساڵی ١٩٧٦) ی خایاند، حیزب و دەوڵەتی، لە دامەزراندنی کۆماری چینی میللیەوە، دوچاری خراپترین کارەسات و زۆرترین زیان کرد." (+)**

ئێستا دوای ئەو پانۆرامایە، کە لە ساڵی (١٩٥٦) وە، چواردە ساڵ پێش دامەزراندنی کۆمەڵە، هەتا ساڵی (١٩٧٠) کە ساڵی دامەزراندنی کۆمەڵەیە، روداوەکانمان تێکڕا رونکردەوە. گەر بێتو بمانەوێ بگەڕێینەوە سەر وردەکاریەکانی دامەزراندنی کۆمەڵە، سەر چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەو رێبازە پاشکۆیە، بگەڕێینەوە بۆ پەسەندکردنی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ، هەق نییە بپرسین:

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو — لاپەڕە (٥٧).
+ هەمان سەرچاوەی پێشوو — لاپەڕە (٥٨).

ئایە، ئەو جۆرە هەڵبژاردنە، لەو هەلومەرجەدا، کە (١٤) ساڵی رەبەق پێش دامەزراندنی کۆمەڵە، کێشەی خەتەرناك، ملمڵانێی ترسناك، توندڕەوی لەرادەبەدەر، رەفتاری سەدەکانی ناوەڕاست، باشترین سەرکردەکانی حیزب، شۆڕش، هاوڕێکانی ماو، کراونەتە داهۆڵو لەسەر شانۆ گاڵەو گاڵتەیان پێکراوەو لەناو سەدان هەزار کەسدا، ئەتك کراوون. پاشان دەریشکەوتووە هەڵە بووە. خۆیان رەخنەیان لێگرتووە. بەناچاری سەرکردە سزادراوەکان دەهێننەوەو هەر ئەوانیش چین لە پاشاگەردانی، لە توندڕەوایەتی، رزگاردەکەن. ئایە:

روداوەکانی شۆڕشی رۆشنبیری: تاوانە ئەنجامدراوەکان، زیانو کارەساتەکان، وەکو تیزی ماوتسیتۆنگ، لە جێبەجێکردندا، لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی چینو لە بونیادنانی سیستەمی دیموکراسیو سەپاندنی سۆسیالیزم، ئایە چینی لە هەڵدێری مێژوویی نزیك نەخستۆتەوە؟ بێگومان روداوەکان، دەڵێین: بەڵێ.

چەند خەتایەکی گەورەیە، کەسایەتیەك چەندیش گەورە بێ، چەند رۆڵی مەزنی لە رزگاری نیشتمانەکەیدا گێڕابێ، بەڵام بیەوێ سۆزی جەماوەر، دڵسۆزی لایەنگرانیو دەسەڵاتەکەی بۆ سەپاندنی بۆچونی خۆیو تۆڵەسەندنەوە بەکاربێنێ. گەورەیی، پاساو نییە بۆ سەپاندنی ستراتیژی هەڵەو بۆ رشتنی قینو تۆڵەسەندنەوە.

چینێکی تازە رزگارکراوی نیمچە دەرەگایەتی، گە جارێ لەسەرەتای پەیوەندی سەرمایەداریو سەرهەڵدانی پیشەسازیدا بووە، ئاخر چۆن دەشێ، دوای (٧) ساڵ لە رزگاری (١٩٤٩) بۆ (١٩٥٦) رابگەیەندرێ کە قۆناغی سۆسیالیزمی تێپەڕاندووە. لەکاتێکدا، لە رۆژئاوادا، زیاتر لە (١٥٠) ساڵیش، هەر لەو هەلومەرجەدا، هێشتا لەسەر پرۆسەی دیموکراسی، کێشمەکێشیان هەبوو. دەریشکەوت، هەتا ئێستاش چین، نەیتوانیووە سۆسیالیزم بونیات بنێ. بەڵکو هێندەی پەیوەندی سەرمایەداریو بازاڕی ئازاد، پەرە پێدەدەن، نیو هێندەش

باسی سۆسیالیزم ناکەن. سۆسیالیزم ئێستا لە چیندا، تەنها بۆ تێرکردنو خزمەتگوزاری خەڵك هەیە. نەك بۆ بنەماو پەیوەندیە ئابوریەکانو هێزی بەرهەمهێنان. نەك بۆ یەکسانی لەنێوان کرێکارو سەرمایەدار!!

من ناتوانم بڵێم: دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، تەواوی ئەو راستیەیان زانیووەو گوێیان بە هیچی نەداوە. ناشتوانم لەو سەردەمەدا، کە دەنگوباسەکان، هەواڵەکان، ململانێکان تێکرا بڵاودەکرانەوە. بەتایبەتی رۆژئاواو شورەویش دژی چین بونو هەموو هەواڵێکیان بۆ دژایەتیکردنیان، لێدەقۆزتنەوە، بۆیە ناتوانم بڵێم دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، بەشێکی ئەو راستیانەی چینیان نەزانیووە. بەڵام دەتوانم بڵێم: دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، ئەو زانیاریانەی هەیانبووە، یان زانیویانە، بەقوڵی بیریان لێنەکردۆتەوە. بەرەنجامی بابەتیان لێهەڵنەهێنجاندون. بەڵکو لەبەرئەوەی چین وڵاتێکی پێشتر داگیرکراو بوو، پاشان لەسەردەمی (کۆمینتانگ)دا نیمچەدەبەرەگ، شۆڕشی چەکداری رزگاریشی تیا بەرپاکرابوو (هەروەکو کوردستان) شورەوریش ئەوکاتە، بە ریڤیژینیزمو دژایەتی خەباتی شۆڕشگێرانەی کرێکارانو گەلانی ئازادیخوازان ناسێنرا؛ بەپێچەوانەشەوە ماوتسیتۆنگ وەکو تیۆرسێنی شۆڕشی درێژخایەن بووە جێگەی متمانەی شۆڕشگێران. بۆیە لەژێر کاریگەری بیروڕای چەپگەرای مێژووی پارتی کۆمۆنیستی چینو ماوتسیتۆنگدا، کۆمەڵە کەوتە ژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژیەتی جەمسەری چین، دیارە ئایدیۆلۆژیەتیش گەر بە وردیو قوڵی بیری لێنەکرێتەوەو پەسەند نەکرێت، سەرەنجام لێکدانەوەی بابەتی دەشێوێنێت. هەر ئەمەش وای لە سەرکردایەتی کۆمەڵە کردووە، کەمتر قوڵایی کێشەکان لێکبدەنەوە. بەدڵسۆزیەکی دەروێشانەوە، بەبێ ئەوەی لەبەرامبەردا هیچ هاوکاریەکیان وەرگرتبێت، هیچ

جۆره پشتیوانیەك كرابن، یان چەكو بەڵێنی بەرپابونی شۆڕشیان پێدرابێ،(*) بەباوەڕێكی پتەوەوە، دوای مێژووی پارتی كۆمۆنیستی چینو سەركەوتنەكانیان، تەنانەت شۆڕشی رۆشنبیریش قبوڵ بكەنو بە راسترین رێبازی پاراستنی شۆڕشی سۆسیالیستیشی بزانن. نەك هەر هێندە، بەڵكو دوای ئەوەش، تێزی سێجیهانی چینو ماوتسیتۆنگیشیان، هەتاڕادەی بەعس بە ناكۆكی لاوەكی زانین، قبوڵ كرد.(+)

---

* ساڵی (٢٠٠٦) كە وەفدێكی رەسمی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان، بریتی بوین لە: ١- د.كەمال فوئاد (سەرۆكی وەفد). ٢- د.ئەرسەلان بایز. ٣- ئازاد جوندیانی. ٤- كافیە سلێمان. ٥- هاوژین مەلا. ٦- مەلا بەختیار. سەردانی چینمان كرد، لە كۆبونەوەی رەسمی پێمگوتن: شەهیدان شیهابو جەعفەرو ئەنوەرو سەدان هاوڕێی ترمان بە ئەستێرەی سورو بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگەوە، لەزیندانەكانو سەنگەرەكاندا، بەرەو پیری سێدارەو مەرگ هەنگاویان دەنا، بەداخەوە ئێوە متەقتان لێوەنەدەهات. بەڵكو پەیوەندی باشیشتان لەگەڵ بەعسی عێراق هەبوو. لەوەڵامدا گوتیان: ئەم راستیانەمان هەر نەزانیووەو نەبیستووە.

+ تێبینی: زۆربەی ئەو زانیاریانەم لەسەر چینو شۆڕشی رۆشنبیری، لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتووە:

١- جان أسمين: الثورة الثقافية الصينية. ترجمة: ذوقان قرقوطي. ص(١٢١-١٢٢).

٢- تجارب الصين من التطرف الى الاعتدال، الطبعة الاولى ٢٠٠٨. بەتایبەتی لە لاپەڕە(١٨) بۆ لاپەڕە(٦٠).

# چۆن چەپکێک و
# کام مێژووی کۆمەڵە ؟!

ناخۆشترین نوسین، ئەو نوسینەیە بەناچاری بینوسیت. بەڵام لەبەر بێچاری، چارە هەر ئەوەیە، ئەم جۆرە نوسینەش بنوسی.

لەو ماوەیەدا کاك برایم جەلال بەناو کتێبی (چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە)ی نوسیووە. لەبەرئەوەی لەساڵی (١٩٧٦)وە ناوبراو باش باش دەناسم، ئەم کتێبەم نەخوێندەوە. لەڕاستیدا، حەزیشم نەدەکرد لەکاتی خوێندنەوەدا ناچارىم وەڵامی بدەمەوە. چونکە پێشوەخت لەبەرئەوەی باشی دەناسم، سور دەمزانی بە چ بیروڕایەکەوە، دەنوسێ. بەڵام کاتێك ڕۆژنامەکان چەند بڕگەیەکیان لەم بابەتانە بڵاوکردەوەو مقۆ مقۆ لەسەریان وروژا، هات بەخەیاڵما چەند وتارێك لەسەر بابەتەکان بنوسم. بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر شەهید ئارام‌و شەهید ئازادو خۆمن. بەڵام ئەو خەیاڵەشم، نەکردە دوا بڕیار.

لەسەر فەیسبوك.. لەگەڵ هاوفەیسبوکێکم، کە بە نامەو بیروبۆچونو هەستیا، دیارە، مێژووی من دەزانێ‌و چاودێرێکی وردی نوسینەکانم‌و هەوڵەکانمە، بە خەفەتێکی قوڵەوە جارێکیان پێی وتم؛ - ئەرێ تۆ بۆ وەڵامی ئەم نوسەرە نادەیتەوە؟

وتم: - لەبەرئـەوەی باشـی دەناسـم، پـێم بـاش نییـە جـارێ بکەومـەوە نـاو مشتومڕێکی ئاواوە.

وتی: - تۆ کتێبەکەت خوێندۆتەوە؟

وتم: - باوەڕ بکە نەء.

وتی: - دە بیخوێنەوە، ئەوسا دوا بڕیار بدە.

ئەم قسەیە لەبەرئەوەی مامۆستا فازیل کەریمیش پێی وتبوم، زیاتر خستمیە کەلکەڵەی خوێندنەوەی کتێبەکـەو سـەرلەبەری بابەتـەکانم سـەرەڕای سـەرقاڵیم، لەماوەی (٤) رۆژدا خوێندەوە. لە پەرێزو پەراوێزی بابەتەکاندا، بابـەت بابـەتو لاپـەڕە لاپـەڕە، تێبینیـەکانی خـۆم دەنوسـی. سـەرەنجام بـۆم دەرکـەوت، کـاکی نوسـەر، رقـی لـە سـنوری رق تێپەڕانـدوەو تۆڵەسەندنەوەشـی، نـەك بەرامبـەر زیندوەکان، بەڵکو بەرامبەر شەهیدە رەمزەکانیش، گەیاندۆتە ئاستێك، جگە لـە وەڵامی ناچاری، چارێکی دیکەی لەبەردەم ئێمەومانانی نەهێشتۆتەوە. هەر هیچ نـەبێ، نـەك بـۆ ئەوانـەی کتێبەکـەیان خوێندۆتـەوە. (کـەم تـا زۆر نـازانم چـەند باوەڕیان بە هەڵبەستراوەکانی نوسەر کردووە یان نا؟) بەڵکو وەڵامەکە، تەنها بـۆ خوێنەری ئێستا نییە. چونکە هیچ نەبێ، خوێنەری ئێستا، لەخۆمان بێ، یان لـە خەڵکی تر، زۆر راستی دەزانن‌و دەشزانن نوسەر پێی لێهەڵبڕیوە، ئـەوەی زۆرتـر خەمی منە، مێژووە.

مێژوو... هەموو رووداوێك، بەسەرهاتو نوسراوێك، تۆماردەکات. (٥٠) یان (١٠٠) سـاڵی دیکـە، بابـەتی ئـاوا، گـەر وەڵام نەدرابێتـەوە، بەشـێوەیەك لەشـێوەکان، رەنگـە ببێتـە جێگـە بـاوەڕی بەشـێکی نـەوەکانی ئاینـدەو مێژوونووسانیش.

لـەم وەڵامـەدا، خوێنـەر دڵنیـا دەکـەم، بـەم هـەموو بوختـان، ناوزڕانـدن‌و لەبەرچـاونەگرتنی (٤١) سـاڵ خـەباتی بێپسـانەوەم، لەلایـەن نوسـەرەوە،

بەدڵنیاییەوە، بڕیارمداوە بە کاردانەوە وەڵام نەدەمەوە. چونکە دڵنیام نوسەر، بەم نوسینەی، خۆی هاوێشتۆتە ناو چ زەلکاوێکی ناپاکیەوە. تازە باوەڕناکەم، تەنانەت کفنی برا شەهیدەکانیشی، پاکی بکەنەوە.

لەگەڵ هەموو ئەم کەتنەی، بەهۆی رقی ئەستوریەوە، من هەوڵ دەدەم، بە بەڵگەو شایەتو لۆژیکەوە، راستیەکان رونبکەمەوە. هەروەها درۆکانی (کە ئێجگار زۆرن) بەدرۆ بخەمەوە. لە کوێش راستیو ماندووبونی ئەم زاتە هەبێ، لەبەر ئەمانەتی مێژوویی، بۆ مێژوو باسی دەکەم. لەئێستاشەوە دەیڵێم: تەنانەت کاکی نوسەریش، کە ناخی، ئاستی تێگەیشتنی، وەفای بۆ مێژووی کۆمەڵەو شۆڕشو هاوسەنگەرەکانی ئاوایە، کە لە (٥٠٦) لاپەڕەدا، بە رقو بوغزو تۆڵەسەندنەوەی سیاسی نوسیویەتی، سەرەڕای ئەو جۆرە تێگەیشتنەی، دەڵێم: ئەم برایەش، لەو مێژووەی خەباتدا، لایەنی گەشی هەیە. بەڵام بەم ئەقڵیەتەی، نەك مێژووی هاوسەنگەرەکانی، بەڵکو هی خۆیشی شێواندووە. بەهیوام، ئەم وەڵامە، بۆ ئەو مێژووەی کە مێژووی هاوبەشی هەمومانە، بەخزمەت بزانێ.

## پێشکەشەیکی نەرگسیو پێشەکیەکی ناکۆک

نەرگسیەت؛ زاراوەیەکە بەوکەسانە دەوترێت کە ئاشقی خۆیانن. بەڵکو لە ئەشقی خۆیاندا، تواونەتەوەو جوانی کەسی دیکە نابینن. نوسەر، نەك لە گێڕانەوەی سەرگوزشتەکانی کۆمەڵەو شۆڕشدا، بە شکاندنی گەورەو بچوکی مێژووی کۆمەڵە، بە شەهیدەکانیشەوە، ویستویەتی نەرگسیەتی خۆی رۆچێنێتە هەموو روداوەکانەوە، بەڵکو لەدوای پێشکەشی کتێبەکە، لە سوپاسو پێزانینیدا، لە لاپەڕە (٤) دا دەنوسێ: (سوپاسو پێزانینی بێپایان بۆ ئەو کەسەی کە تەنها خۆم دەزانم چەند ماندو بووە).

ئەم پێزانینە هەقوایە تەمومژەکەی لێبڕەوێنینەوەو ئەو کەسە دەربخەین کە نوسەر مەبەستێتی. دەپرسین؛ ئەو کەسە کێیە کە تەنها (کاکی نوسەر) دەزانێ چەند ماندووە:

- هاوڕێیەکیەتی؟ بۆ دەیشارێتەوە؟
- شەهیدێکە؟ هەقبوو ناوی هێنابا.

هەرکەسێك بوبی، شەهید یان زیندوو، چۆن کتێبەکەی پێشکەش کردۆتە دوو برا شەهیدەکەی کوردستانو بنەماڵەو خێزانەکەی (کە هەقی خۆیانە) ئاواش، لەم پێزانینەدا دەبوو ناوی پێزانراویشی هێنابا. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم پێزانینە نە هیچ کەسێکی زیندوو، نە کەسێکی شەهیدیش دەگرێتەوە، بۆیە نوسەر ناوی نابا. ئەو کەسە تەنهاو تەنها خۆیەتی. بەڵێ خۆیەتیو خۆی لێگۆڕیوین. لەم پێزانینەی خۆیدا، دەیەوێ پێمان بڵێ:

بتانەوێو نەتانەوێ، لەهەمووتان ماندوترم، تێکۆشەرترم. ئەوەش منم برایم جەلال، بەئارەزووی خۆم، مێژوتان دەنوسمو دەتانخەمە قەفەسی تاوانو چۆنیشم

بـوێ حوکمیشـتان لەسـەر دەدەم. بـەم بـەخۆنازین و پێزانینـە، دەیـەوێ گـڕی نەرگسـیەتی دابمرکێنێتـەوە. دوای دامرکاندنـەوەی ئـەو گـڕەو بەرزکردنـەوەی قەڵـەمی نەرگسـیەتەکەی، ئینجـا بکەوێتـە وێـزەی مێـژوومان و هـەمومان.
دەفەرمون خوێنەری ئازیز، ئەی ئەوانەی ئـەم نوسـینەی نوسـەرتان خوێندۆتـەوەو زانیاریتان لەسەر گوڵ و گەڵاو دڕکـەکانی کۆمەڵـە نییـە، کـە نوسـەر بـەئارەزوی خۆی، گوڵبـژێری کـردون و چەپکە گـوڵێکی ژاکـاوی لـێ پێکهێنـاوە. فـەرمون، وەڵامی ئێمەش بخوێننەوەو پاشان نوسینەکەی ئەو و ئەمەی ئێمە بەراورد بکەن، دوای دەرکەوتن و سەلماندنی راستیەکان، ئەوسا حوکمی بابەتی بدەن.
بـەجارێ، لـەم پێشـەکیەدا، پێشـەکییە ناکۆکەکـەی نوسـەر هەڵبسـەنگێنین، پاشان بێینەوە سەر بابەتەکانی دیکەی.
لە پێشەکیە (٥) لاپەڕەییەکەیدا، لە نیو پەرەگرافی لاپەڕە (١٠)دا دەڵێ:
"هیوادارم خوێنەری بەڕێز لێم ببورن، کە لە ناوەرۆکی ئـەم مێـژووە کورتـەدا وەك پێویست باسی حزب و ڕێکخراوەکانی تری کوردستانم نەکردبێ. لەبەرئـەوەی بابەتی ئەم مێژووە تایبەتە بە کۆمەڵە، نەك هیچ پارت و ڕێکخراوێکی تر، بۆیـە بەپێویسـتم نـەزانیوە تـەنیا لـەو شـوێنەدا نـەبێ، کـە پەیوەنـدیان بـە مێـژووی کۆمەڵەوە هەبێ باسیان بکەم، و هەرگیز بەوە لێك نەدرێتەوە کە لە رۆڵ و رادەی تێکۆشان و دڵسـۆزی و خـەبات و قوربانیـەکانیانم کـەم کردبێتـەوە. بەپێچـەوانەوە هەموو حزب و ڕێکخراوەکانی بەشداربوو، لە شۆڕشی نـوێدا لەگـەڵ کۆمەڵـەدا و کۆمەڵەش لەگەڵ ئەواندا تەواوکـەری یـەکترو بـەردەوامیی شۆڕشـی نـوێ بـوون، بەهـەموو هەڵـە و کـەم و کـوڕی و مێـژووە تاڵەکانیانـەوەو بەهـەموو سـەروەری و سەرکەوتنەکان و ئامانجە پڕ شکۆکانیانەوە. جگە لەمەش شـارەزاییەکی ئـەوتۆی دیوی ناوەوەی ئەو حزب و ڕێکخراوانەی تر نیم"

خۆزگە، لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی، نوسەر رەچاوی ئەم پەرەگرافەی خۆی کردبا، ئەوسا دڵنیام بابەتەکەی باش دەردەچوو. بەڵام کوتومت پێچەوانەی ئەم قسانەی، سەراپا مێژووی لایەنەکانی دیکەی سڕیوەتەوە. بە خائین، لادەر، خۆفرۆش، تێکدەرو پیلانگێڕ ناوی بردون. کەچی لەم پێشەکییەدا خۆڵەمێشیان لەچاو دەکات.

بەڕاستی سەیرە، کەسێك کتێبێکی وا زل بنوسێ، سەرپاکی دژایەتی‌و دوژمنایەتی هەموو لایەنەکان بێ، کەچی بشیەوێ بەم پێشەکییە هەموو لایەنەکان چەواشەو بێدەنگ بکات. بۆئەوەی بشزانن نوسەر چەند نوقمی ئەندێشەی خۆپەسەندی بووە، ئەم پێشەکیەی خۆی هەر زوو بیردەچێتەوەو لە زۆربەی بەشەکانی کتێبەکەدا، خۆی بەدرۆدەخاتەوە.

پێش کۆتایی پێشەکیەکەی، لە لاپەڕە (١١)دا ئەمەی خوارەوە دەڵێ:

"لە هەر ئاستێکی لێپرسراویدا بووبم، ئاگاداری زۆربەی رووداوەکانی ناوەوەی بووم‌و بەشداری هەموو چاکەو خراپەکانیشم‌و لە هیچی پەشیمان نیم‌و شانازیش بەهەموویەوە دەکەم. جگە لە هەڵوەشاندنەوەی، کە بە گەورەترین هەڵەی مێژوویی شۆڕشی کوردو بەرپرسانی هەڵوەشاندنەوەی لەناو کۆمەڵەو یەکێتیی نیشتمانیشیی دەزانم"

جارێ.. ئاگاداری "زۆربەی روداوەکانی ناوەوە" نەبوی. تەنها ئاگاداری ئەو روداوانە بوی کە خۆتی تیا بوی؛ ئەگەر مێژووی کۆمەڵەو روداوەکانی، تەنها ئەوەندە بن کە نوسەر زۆربەیانی دەزانێ، ئەم رێکخراوە هەر بۆ هەڵوەشانەوە باش بووە. بەش بەحاڵی خۆم کە بەرپرسیاری تەواوی رێکخستنەکانی کۆمەڵە،

لەسەرانسەری کوردستاندا، بوم، ئینجا ناتوانم لافی ئاگاداریون لە تەواوی رووداوەکان، لێبدەم.

ئاخر کەسێك دوو ساڵ دوای شۆڕش هاتبێتە ریزی شۆڕشەوە، کەوابێ سەدان رووداوی مەگەر بیستبێ، دەنا ئاگای لێنەبووە: کەسێکیش پێش هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە (١٩٨٨) ساڵی (١٩٨٧) چووبێتە دەرەوەی وڵات، کەوابێ، ئەو ساڵانەش، کە پڕن لە کارەسات، سەرکەوتن، شکست، تراژیدیای ئەنفال‌و کیمیاباران، لەمیش ئاگادار نییە. گریمان، هەر (٢٢) ساڵەکەی تەمەنی کۆمەڵە، نەخێر (٢٢) ساڵیی تریشی بخەرە سەر، تەنانەت رۆژێکیش نوسەر، جێی نەهێشتبێ‌و شەوێکیش لەو (٤١) ساڵە نەخەوتبێ، هێشتا ناوبراو، بەقەد خۆی لە رووداوەکان دەزانێ. بەتایبەتی ئەم زاتە، لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەوە، هەتا ئێستاشی لەگەڵ بێ، سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی تام نەکردووە. لە مێژووی شۆڕشیشدا، سەراپای کوردستانی نەدیووە. ئاخر ئیتر چۆن "زۆربەی رووداوەکان" دەزانێ؟

وەکو تر، کە دەڵێ: هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە بە گەورەترین هەڵەی مێژووی شۆڕشی کوردو بەرپرسانی هەڵوەشانەوەی لەناو کۆمەڵەو یەکێتیی نیشتمانیی دەزانم.

جارێ.. قسەی ئێستا باجی لەسەر نییە. وەکو وایە تفەنگ بە مردووەوە بنرێ.کە کۆمەڵە هەڵوەشایەوە، دەزانین نوسەر لە ئەڵمانیادا دەژیا. بەڵام بۆچی هەڵوێستی دژی هەڵوەشاندنەوەکە دەرنەبڕی؟ رەنگە بڵێ: خۆ من لە کۆنفرانسی هەڵوەشاندنەوەکە نەبوم. ئەی خۆ ئەوکاتە دەیتوانی بەیاننامەیەك دەربکات‌و هەڵوێستی بڵاوبکاتەوە. بۆ بڵاوی نەکردەوە؟ تەنانەت بۆچی لێدوانێکیشی دژی هەڵوەشێنەرانی کۆمەڵە دەرنەبڕی؟ دیارە لە دوو حاڵەت، ئەم بێدەنگیەی، بەدەر نییە:

یەکەمیان: یان هەڵوەشاندنەوەکەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی قبوڵ کردووە؟

دووەمیان: یاخود لەترسا، لە وڵاتی غەریبیشا، سەرەڕای ئەوەی داخی چۆتە دڵ، کۆمەڵە هەڵوەشێندراوەتەوە، بەڵام چی بکا، نەیوێراوە هەڵوێست دەربڕێ؟ ئەمەشی هەر لەبەر دوو هۆ بووە:

١- لەبەر ترس‌و ترسنۆکی، نەکا لەپاشەڕۆژدا، گەر هەڵوێستی دژی هەڵوەشاندنەوەکە دەربڕیبا، دڕکەکەی لەژێر قاچ دەربکەن.

٢- دوور نییە حسابی بۆ بەرژەوەندی پاشەڕۆژی خۆی نەکردبێ!!

ئێمە بیناسین، هەزاران (کەم) لە دوری کوردستانیش نەیوێراوە هەڵوێست دەربڕێ. هەم لەبەر ترسنۆکی‌و هەم لەبەر بەرژەوەندی پاشەڕۆژەکەی بووە. ئەگینا، کەسێك لە مێژووی خۆیا، زانیبێتی مەترسی لەسەر خۆی نییە، مێشی کردبێتە گامێش، ئەوکاتە چۆن چۆنی لەبەرامبەر ڕوداوێکی مێژوویيدا، کە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەیە، ئەو کۆمەڵەیەی بەبێ لێکدانەوە، وەسفی جۆراوجۆری لەم کتێبەدا دەکات، بەڵام کە هەڵیشیان وەشاندۆتەوە؛ نە ترسی گرتنی هەبووە؛ نە هێزی نێردراوەتە سەر؛ نە کەلەبچەی کراوەتە دەست؛ نە پلینیۆمی بۆ سزادانی بەستراوە، سەرەڕاش، نەیوێراوە فزەی لێوە بێت.

وەکو تریش.. منیش دەڵێم: هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، هەڵەیەکی ستراتیژی بوو. بەڵام کاکی نوسەر، کەمۆکەیەك ویژدانت بخەرەکار، ئێمەی ئەو هاوڕێیانەی لەسەر ڕێبازو ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵە، کە لە ساڵی (١٩٧٩)وە دەترساین‌و مەترسیەکەشمان لەم‌و لەو کۆبونەوانەدا، دەخستەڕوو، نوسەریش لێت بیستوین؛ مشت‌ومڕت لەگەڵ کردوین؛ بەرپەرچت داوینەتەوە، ئایە ئەوکاتە جەنابت، بەتوندی، بەکردەوە خۆتت شەتەك نەدابوو بە هەڵوەشێنەرەکەی کۆمەڵە، کە

کاك نەوشیروان مستەفای سکرتێری ئەوسای کۆمەڵە بوو.. هەروەها بەوانی تریش؟!

بیرتە.. چیت دەوت، چیت دەنوسی، چۆنت بوختان بۆ هەڵدەبەستین، چەندت راپۆرت لەسەر دەنوسین، بیرتە ئەی هاوڕێکەی لەمێژینەی کۆمەڵە؟! بیرتی بخەرەوە، کەمێك رۆژمێری ویژدانت هەڵبدەرەوەو بزانە: پێش هاتنی هاوڕێیانی زیندان، چیت دەکرد؟ دوای هاتنی ئەوانیش، چیت نەکرد؟

لەو باوەڕەدام، چەند کەسێکی وەکو تۆ نەبوایە، کێشەکانی هاوڕێیانی کۆمیتەی هەرێمەکانو هاوڕێیانی زیندان، قابیلی چارەسەرکردن بوون. لە کۆمیتەی هەرێمەکاندا زۆربەمانو لەناو هاوڕێیانی زیندانیش کاریگەرەکانیان، ئامادەی دیالۆگو چارەسەری کێشەکان بوین. بەڵام ئاخو داخ.. دەڵێم:

**رەبی موی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ**

**هەرکەسێ گوڵشەن بەدەردی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ**

**(حەمدی)**

لەکۆتایی ئەم پەرەگرافەی زانینی "زۆربەی رووداوەکانی کۆمەڵە" دا، نوسەر ئاوا حوکم دەدات: هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە گەورەترین هەڵەی مێژوویی شۆڕشی کوردو.. تاد.

دەپرسم: ئایە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە (کە زۆر زۆر بڕیارێکی خراپ بوو) لە بڕیاری بڵاوەپێکردنی شۆڕشی ئەیلول، دوای خیانەتنامەی جەزائیر، ترسناکتر بوو لەسەر کورد. بێگومان نەخێر.

لە مێژووی سەدەی رابوردودا، رێکخراوی گەورەو حیزبی گەورەو گچکە، لەچەپەوە بۆ راست، هەڵوەشاونەتەوە. بەڵام هیچی هێندەی هەرەسی

شۆڕشـــەکانو بڵاوەپێکردنـــی ڕاپەڕینـــە چـــەکداریەکان، زیـــانی بـــۆ کـــوردو چارەنوسەکەی نەبوو.

- خۆیبونی کوردستان، نەما.
- حزبی هیوا، نەما.
- ژ.ك، نەما.
- حزبی رزگاریو شۆڕش (مارکسیو چەپ بون) نەمان.
- پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان (جەلالی) نەما.. هتد.

نەمانی حزبی هیوا.. حزبی باشتر کـە پـارتی دیموکراتی کوردسـتان جێگـەی گرتەوە، زیانێکی ئەوتۆی نەبوو.

نەمانی ژ.ك.. حزبی دیموکرات جێگەی گرتـەوە، قـازانجی هـەبوو. بـەڵام کـە کۆماری کوردستان روخا، هەموو نەتەوەی کورد جەرگی بڕا.

حزبی رزگـاریو شـۆڕش.. کـە هەڵوەشـانەوە، زۆربـەیان لـەناو پارتیـداخۆیان دۆزیەوەو یەکگرتویی ریزی کوردایەتیش بـۆ ئـەو هەلومەرجـە لەوسـاوە بناغـەی دانرا. ئەگینا پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ئەوکاتەو دوای شۆڕشـی (١٩٥٨)یـش، لەکوردستاندا باڵادەستتر دەبوو. وەکـو پەیوەنـدی حزبـی دیموکراتی کوردسـتانی رۆژهەڵاتو حزبی تودەی دەخولقاند. بەڵام لـە شەسـتەکاندا پـارتی سـەربەخۆیی خۆی، زۆر باشتر لە هێزەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستانو پەیوەندیان بە حزبـە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردسـتان، پاراسـتو پەرەپێـدا. ئەمـەش، لەراسـتیا، بـۆ زیرەکـیو دووربینـی، بـرایم ئەحمـەدو مـام جـەلال دەگەڕێتـەوە. هەروەکو چـۆن، دابڕینـی حیزبـی دیموکراتی کوردسـتانی ئێـران، دوای راپـەڕینی گەلانی ئێران (١٩٧٩) واتا دوای (٤٣) ساڵ بۆ هەڵکـەوتویی شـەهید د.قـاسملۆ دەگەڕێتەوە.

لــه بــاری ســتراتیژو جیــاوازی ئایدیۆلۆژیــەوە، بــۆ ململانــێ سیاســیەکانو پێشکەوتنو ئاراستە جیاوازەکان، بێگومان هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵـە، زیـانێکی گەورە بوو، بەڵام گەورەترین هەڵەی مێژوویی لەناو شۆڕشی کورددا نـەبوو. گـەر هاتبـاو لـەو هەلومەرجـەدا، شۆڕشـی کوردسـتان هەرەسـی پێهێنرابـا، ئەمـەیان ترســناکترین هەڵــە دەبــوو لەمێــژووی شۆڕشــی کــورددا، ترســناکتریش لــە هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلولیش. چونکە ئەوسا رێکەوتنامـەی جـەزائیر دژی مۆرکراو هەرەسی هێنا، بەڵام کۆمەڵە بەنهێنی هـەبوو، مـام جـەلال لـە ئاسـۆی بەرەنگاریـدا، رابـەری جـێ ئومێـد بـوو. هـەنگینێ بـەعس نەیـدەتوانی لـەو ماوەیەدا، دوا نەخشەی شۆڤێنیەتی بسەپێنێ. بۆ چاوبەستەکیش بـێ، پێویسـتی بە چەواشـەکردنی دەوڵـەتان، سـۆڤیەت، هەنـدێك وڵاتـی دیکـەو نـاو خـەڵکیش هەبوو. بەڵام لەدوای سەرکەوتنی لە جەنگی عێـراق- ئێـرانو بـەو مەزنخوازیـەی سەدام، دوای راگیرانی جەنگ، گەر شۆڕشی کوردستانیش بـڵاوەی پێکرایـە (کـە هەبون وایان بیردەکردەوە) هەڵبەتە، ئەمە نەك گەورەتر، بـەڵکو کارەسـاتبارترین بڕیاری مێژووی کۆنو نوێی کوردایەتی دەبوو.

# <u>بەشە وەڵامی یەکەم</u>

## رقی دانەمرکاوەی نیو سەدەی (جەلالی – مەلایی)

١. قەتماغە هەڵدانەوە

٢. ئەمەیانت لە چی‌و ئەوەیانت لە چی؟

## ١

# قەتماغە هەڵدانەوە

مێژوو، ڕێڕەوێکی بەردەوامی ڕوداوەکانە. نەك هەر ئەو ڕوداوانەی لە ڕابردو و ئێستادا ڕویانداوە، بەڵکو مێژوو، لە ڕوداوە ڕونەداوەکانی ئایندەشدا، درێژدەبێتەوە. بەتایبەتی لە بواری سیاسەتدا. لە هەر چرکەساتێکدا کە ڕوداوێکی سیاسی کۆتایی دێ، لەهەمان چرکەدا، پرۆسەی زەمینەسازی بۆ ڕوداوی دوای خۆی چەکەرە دەکات. کەواش بێ، هیچ ڕوداوێکی مێژوو، بەمانای ئاوابونی هەمیشەیی، یان دەرهاویشتنی ڕوداوەکە لە ڕێڕەوی مێژوو، یان لە تەواوی ڕوداوەکان نییە. بەڵکو پێویستە بزانرێ، ئەو ڕوداوە خۆی، بە ڕوداوی دوای خۆی سپاردووە. بەڵام لەژینگەیەکی دیو بەشێوەو شێوازی دیکە. زۆرجار، بەگەوهەری نوێشەوە. بەڵام ئەم گەوهەرە نوێیە، سەراپا دابڕاو نییە، لە گەوهەری ڕوداوەکانی پێش خۆی.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەدا، هەڵەیەکی کوشندەیە، سیاسەتمەدار، یان نوسەری سیاسی، قەڵەم وەکو تەور، بۆ دابڕ دابڕکردنی ڕوداوە مێژووییەکان، بەکاربێنێ. بەم دابڕ دابڕکردنەش، ماف بە خۆی بدات بەئارەزووی خۆی بکەوێتە وێزەی ڕوداوەکان. بەتایبەتی ناکرێ سیاسەتمەدار، یان نوسەری سیاسی، هەرگیز بیری بچێتەوە کە کاتێك لەسەر ڕوداوە مێژووییەکان دەنوسێت، ئەم نوسینە، نوسینی مێژوو وەکو مێژوونوس نییە. بەڵکو تەنها خوێندنەوەیەکە بۆ هەندێك لایەنی مێژوو. جیاوازیەکی گەورەش لەنێوان مێژوو نوسینو خوێندنەوەی مێژوو،

لەروانگەی سیاسەتمەدار، یان نوسەری سیاسیەوە، لەگەڵ نوسینی مێژوونووس هەیە. دیقەت لەم دیقەتەی، نوسەرو لێکۆڵەر (محەمەد حسنین هەیکەل) بدەن، دەڵێ چی:

" لەسەر هەمان رێگا رۆیشتین، هەر دەشبوو بڕۆین. هێشتاش لەسەری بەردەوامین، وەرگۆڕانە گەورەکانی مێژوو، دە ساڵ، یان بیست ساڵ، یاخود سی ساڵ، یەکالآیان ناکەنەوە." (*)

بەداخەوە، نوسەر رەچاوی هیچ بنچینەیەکی زانستی لە نوسین‌و خوێندنەوەی رووداوەکانی مێژوو نەکردوەو بەئارەزوو، گاسنی لە وەردی ئەو رووداوانە چەقاندووە.

لە بەشی یەکەم: ژانەکانی گەل‌و لەدایکبونی کۆمەڵە، نوسەر لە لاپەڕە (١٤– ٢١)دا، باسێکی لەسەر جیابونەوەی شەستەکان‌و شەڕی ناوخۆی ناونراو بە جەلالی- مەلایی، نوسیووە. تیایدا، پێچەوانەی پێشەکی ئەم کتێبەی، کە گوایە هەستی هەموو لایەك رادەگرێ، پێچەوانەی رێزگرتن لە لایەنەکانی دیکەی کوردایەتی (خۆی گوتەنی) وەکو فریشتەیەك قسە لەو رووداوانە دەکات‌و دەیەوێ لە خوێنەری بگەیەنێ کە ئەم هەمیشە دژی شەڕی جەلالی- مەلایی بووە.

لەژیانمدا نە جەلالی‌و نە مەلایی بوم. دوای بەیاننامەی ١١/ی ئازار تێکەڵاوی سیاسەت بوم‌و بوم بە کۆمەڵە.. وەکو رێکخراوێکی چەپ. واتا: وەکو نوسەر، لەسەرەتای جیابونەوەی پارتی‌و شۆڕشی ئەیلول، ساڵی (١٩٦٤) نەچومەتە هەمەدان. لەبەر کەمیی تەمەنم، بەشێکی ململانێ‌و ناکۆکی‌و یەکدی

* محمد حسنين هيكل / سنوات الغليان — الجزء الاول — الطبعة الاولى — مركز الاهرام للترجمة والنشر. ١٩٨٨ - ص(٢٦).

کوشتنەکان، نەبوم. بەلام ئێستا، دوای ئەزمونێکی درێژی سیاسەت، کاتێک ئاوڕ لەو مێژووە دەدەمەوە، ناتوانم، تەنها لەبەرئەوەی کۆمەڵە ساڵی (١٩٧٠) دامەزراوە، بەبێ گەڕانەوە بۆ قۆناغەکەو ڕێڕەوی روداوەکان؛ بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو زەمانەو راوەستان لەسەر ئەو زەمینە سیاسییە، حوکم لەسەر ئەو دوبەرەکیە بدەم. ئەو دووبەرەکییە، لەخۆڕا رونەداوە، بەلام ئایە هۆیەکانی دووبەرەکیو شەڕی ناوخۆ، بایی ئەوە بون پارتی ببێتە دوو کەرتو دوو لەشکرو دوو شەڕگە، بەدڵنیاییەوە باوەڕم وایە، نەخێر. با بزانین کاکی نوسەری ساڵەها جەلالی، ئێستا چۆن لە لاپەڕە (١٤)دا ئەو دوو باسکەی پارتی هەڵدەسەنگێنێ:

"بەکرەجۆ، لەگەڵ ئەوەی بنکەو بارەگای سەرەکی سەرانی باسکی (جەلالی) بوو، مەڵبەندی کێشانی نەخشەو پلانی خۆشکردنی شەڕی ناوخۆیی لایەنێکی شەڕەکە بوو"

جارێ وشەی "سەران" لە زمانی کوردیدا، بۆ سوککردنی سەرکردایەتی لایەنێك بەکاردێ. پاشان بەکرەجۆ، دوای قولبونی سێ ساڵی ناکۆکیەکانو چەندین جار شەڕو پێکدادان، کرایە لەشکرگایەکی جەلالیان.

لە بەشێکی دیکەی ئەم باسەیدا، گوایە بێلایەن نوسیویەتیو دەیەوێ لە خوێنەری بگەیەنێ کە بە چاوی رەخنەگرێکی بابەتی دەڕوانێتە دووبەرەکییەکە، بڕوانن ئەم بەناو چەپە، چەند لە نوسینەکەیدا بابەتییە لە باسکردنی مەلاییدا؟ لە لاپەڕە (١٦-١٧)دا دەڵێ:

"پارتی باسکی (مەلایی) تا ناوچەوانی لە پاشکۆیەتی سیاسەتی حوکمی ئێراندا نقوم ببوو، تا ئەو ڕادەیەی کە بوو بە پارێزەری ئاسایشی سنوری ئێرانو عێراقو زامنکەری هێمنیو ئارامی رۆژهەلاتی کوردستان بۆ فەرمانڕەوایی شای ئێرانی، و ببووە بەشێك لە هێزی چەکداری محەمەد رەزا شا بۆ پاراستنی ئارامی

ناو ئەو بەشەی کوردستان، لەلایەکی تریشەوە ببوون، بە ڕاوکەری کەسایەتیە کوردیو ئێرانیە شۆڕشگێڕەکان چ لە سەرانو ئەندامانی حزبی دیموکراتو چ لە ئەندامانو سەرانی سازمانی أنقلابی ئێران، کە لەدواییدا بوونە سازمانی زەحمەتکێشانی ئێران"

ئەم دوو پەرەگرافە لەسەر باسکی جەلالیو باسکی مەلایی، بە زەقیو ڕەقی دیارە کە نوسەر، بە ڕواڵەت بێلایەنە، ئەگینا بە گەوهەرو بە باوەڕ، هەمان برایم جەلالەکەی سەردەمی جەلالییە.

هەرکەسێك بیەوی بە ئەدەبیاتی ئەوسای جەلالیدا بچێتەوە، باوەڕناکەم لەم نوسینەی ئێستای نوسەر، دوای (٤٨) ساڵ لە جیابونەوەکەو یەکتر تۆمەتبارکردنەکانیان لەو هەلومەرجەدا، نوسینێکی توندترو تووڕەتر بدۆزێتەوە. چی ماوە بە مەلایی بڵێ؟ هەرچی جنێوی فەرهەنگی دوبەرەکی ئەوسا هەیە، بۆی هەڵڕشتونەتەوە. بۆیە ئەم جۆرە نوسینە، بەم کۆنە قینەی نوسەر رشتویەتی، ناچێتە خانەی باسی زانستیەوە. بەڵکو جونەوەی جنێوەکانی ئەو سەردەمە شومەیە. جێی داخیشە، دوای زیاتر لە نیو سەدە لەو دوبەرەکییە، هێشتا مێژوونوسو باسنوسان، بەشێوەیەکی زانستیانە، ڕوداوەکانی ئەو مێژووەیان لێکنەداوەتەوە. ڕەنگە هۆیەکی گرنگی ئەم تۆخن نەکەوتنەی ڕوداوەکانی ئەو دۆخە، پەیوەندی بەوەوە هەبێ، کە لەدوای (١٩٧٥) وە، هەلومەرجێکی چارەنوسساز دوچاری کورد هات. لەم هەلومەرجەشدا، وا هەڵکەوتەوە، لەناو دوو جەمسەری سەرەکی کوردایەتیدا، بارزانیو مام جەلالو خەڵکێکی زۆر لە هەردوو ئاراستەکەی دوبەرەکی شەستەکان، لەناو یەکێتیو پارتیدا، هاتنەوە مەیدانو برەودان بە خەبات. دڵنیاشین، ڕۆژگارێکی نزیك بەرێوەیە کە توێژەرو مێژوونوس، کەشکۆڵی پڕ لە بەڵگەیان لەسەر ئەو ڕوداوانە هەڵڕێژنو بیسەلمێنن:

نە ئەوەی جەلالیەکان بە مەلاییەکانیان وتووە، هەر هەموی راست بون؛ نە ئەوەی مەلاییەکانیش بە جەلالیەکانیان گوتون، راستو دروست بون. ئەمەیان با لێگەڕێین بۆ مێژوونوسانو مێژوو! گەرچی جەلالیەکان شکاشن.

## ٢

## ئەمەيانت لە چیو ئەوەيانت لە چی؟

لە پێشەکیەکەیداو لەم بەشەی یەکەمی نوسینەکەیدا، پەیتا پەیتا دەیەوێ بە خوێنەری بگەیەنێ کە لە سەردەمی جەلالیەکانداو لە بەکرەجۆ و لەناو روناکبیراندا، رێبازی کۆمەڵەو مارکسیزمو ستراتیژی کوردستانیەتی کۆمەڵەی رەنجدەران، بنەچەکەی ساغکراوەتەوە. بۆ نمونە لە لاپەرە (١٤-١٥)دا دەڵێ:

"بە بنکەیەکی دالّدەی کەسایەتیە شۆڕشگێڕەکانی ئێرانیو کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان کە زۆربەیان هەڵگرانی بیری چەپو کەسایەتی ناو حزبە چەپە جیاجیاکانی ئێرانی بوون، ئەوانە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر لاوە چەپەکانی ئەو باسکەو پەیدابوونی برەوی چەپی کوردستانیو بیری مارکسیزم- و بیری ماوتسی تونگ"

دوای لاپەڕەیەك ئەو قسانەی بیردەچێتەوەو سەراپا پێچەوانەیان دەکاتەوەو دەنوسێ:

"پارتی باسکی (جەلالی) کە ئەمانیش نقومی پاشکۆیەتی سیاسەتی حوکمی بەعس ببوونو ببوونە بەشێك لە هێزی چەکداری بەعسیەکان بۆ لێدانی باسکی مەلاییو بەرژەوەندی شای ئێرانی لە ناوچەکە، بێ شك دەبوونە مەڵبەندی دالّدەی تێکۆشەرانی ئێرانی لەبەر ئەم دوو هۆ گرنگە.

١- دوژمنی دوژمنم دۆستمە.

٢- بۆ بە بەرداکردنی بەرگی پێشکەوتووخوازیو نوێخوازی بە تانو پۆی باسکەکەیانداو هەڵفڕیواندنی جەماوەری زۆری رۆشنبیران بەو ناوەوە."

ئەمەیانت چەندی بە چەند؟ لەپێشدا بە شانوباهۆی بەکرەجۆو بڵاوکردنەوەی مارکسیزمو ئەندێشەی ماوتسیتۆنگدا هەڵدەدەی. کەچی لەم پەرەگرافەو لەم دوو خاڵەدا، ئەو بۆچونەت پوچەڵ دەکەیتەوە، واتا:

بەو دوو خاڵەی سەرەوە، پرەنسیپەکانی مارکسیزمو ئەو هەوڵانەی مام جەلالو روناکبیران، ئەوکاتە داویانە، رەتدەکاتەوەو بەکوردیەکی پەتی لە خوێنەری دەگەیەنێ، لە بەکرەجۆدا، لەبەر (دوژمنی دوژمنم دۆستمە) چەپەکانی ئێران داڵدە دراوون. (*) هەروەها، جەلالیەکان تێکرا، بە پێشکەوتنخوازو دواکەوتنخوازیانەوە، بەقسەی نوسەر، راستیان نەکردووە کە باری مارکسیزمو شۆرشگێرێتیان کردووە، ئەو قسانەیان پەردەپۆشکردنی هەڵەکانیان بووە. گەر ئەمەی مەبەست نەبێ، بۆ دەڵێ:

"٢- بۆ بە بەرداکردنی بەرگی پێشکەوتووخوازیو نوێخوازی بە تانو پۆی باسکەکەیانداو هەڵفڕیواندنی جەماوەری زۆری رۆشنبیران بەو ناوەوە."

---

* نوسەر خۆی، لە خوێندکارەکانی فێرخوازی تیۆری بەکرەجۆ نەبوو.

## بەشە وەڵامی دووەم

### دامەزراندنی کۆمەڵە، هێڵەکانی شەهید ئارام و عێراقچێتی

١. دوای ٤١ ساڵ شێواندن
٢. کۆمەڵەو سێ دەستەی دامەزرێنەر !
٣. کۆمەڵەو ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ
٤. دژایەتی عێراقچێتی‌و ئەندامەتی پەرلەمانی عێراق
٥. ئارام‌و عێراقچێتیەکەی پەرلەمانتارەکەی عێراق
٦. هۆنینەوەی نوسەر!
٧. رۆشتنی عێراقیەکان‌و مانەوەی ئارام!!
٨. هەڵبەستنی ئاواش؟!
٩. هەڵبەستنێکی تریش!!
١٠. هەمدیس هەڵبەستراو!!!
١١. رقی سەردەمی کرانەوە
١٢. هەرەس‌و هەڵوێستی کۆمەڵە
١٣. بەرەنگارینەکردن و پاساوی نەزۆك

١

## دوای ٤١ ساڵ شێواندن

دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی- ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ لە (١٩٧٠/٦/١٠) لە دوا چارەکە سەدەی بیستەمدا، گرنگیەکی مێژوویی هەیە. زۆر گرنگتر لە مێژووی دامەزراندنی رێکخراوە چەپەکانی مێژووی کوردستان،(*) چ لقی حیزبی شیوعی عێراق لەسەرەتاوە، چ رێکخراوە چەپەکانی دیکەی (شۆڕش- ١٩٤٥) و (رزگاری – ١٩٤٦) هەروا لە سەنگی هەرێمی قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعیش. سەرەڕای بیری عێراقچیێتی هاوزای کۆمەڵەو رێکخراوە چەپو کۆمۆنیستەکانی تریش لە هەشتاکاندا، ئێستاشی لەگەڵدابێ، دامەزراندنی هیچ رێکخراوێکی چەپ، چارەکێکی کۆمەڵە، کاریگەری لەسەر رووداوەکان نەبووەو نییە.

ئێستا کە (٤٢) ساڵ بەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەدا تێدەپەڕێو (٢٣) ساڵ لەمەوبەریش، بەهەڵەیەکی مێژوویی، لە بارودۆخێکی ترسناکی کوردایەتیدا، کە بواری راپرسی، باسو خواستی دیموکراسی بە رێکخراوەکانو ئەندامو کادرانی کۆمەڵە نەبوو، تەنانەت لەناو هاوڕێیانو کادرو بەرپرسانی سەر سنوری کۆمەڵەش، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، نە بە نوسراو، نە بە کۆبونەوەی

* پاشان، دوای دروستکردنی هەرێمی شیوعی ئەرمەنیەکان، ئینجا هەرێمی شیوعی کوردستانیان دامەزراند، کە ئەمەش بۆ تێڕوانینی لاوازی حیزبی ناوبراو لەمەڕ بزوتنەوەی رزگاری کوردستان دەگەڕێتەوە.

بەردەوامو فراوان، مشتومالّی ئازادانە نەکرا، کە ئەوکاتە لەسەر لاپەڕەکانی ئۆرگانی "بەرەی کوردستانی" زۆر مەسەلە مشتومڕی لەسەر دەکرا، بەڵێ لە هەلومەرجێکی ترسناکی سیاسی، لە بارێکی ڕێکخراوەیی سەرکوێرکردنی سیاسی، سەرکوتکردنی ئۆرگانو ڕێکخراو و کادرانی کۆمەڵەدا، باری دەرونی شکستی ئەنفالەکانو ژیانو ژیواری ئاوارەیی کادرو پێشمەرگە، کرایە پاساوی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، تەنانەت لەبری کۆنفرانس، پلینیۆمێکی زەمینە نەڕەخسێندراوێکی بۆ بەسترا؛ بویستریو نەویستری، هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، لەسەر دەستی ئەوانەی پێیانوابوو، کۆمەڵەو شۆڕشی کوردستان، هێندەی پەیوەندی بە کوردستانیەتی چوار پاچەییەوە هەیە، زۆر لەوە کەمتر پەیوەندی بە کێشە دیموکراسیەکانی عێراقەوە هەیە، لەسەر دەستی هاوڕێیانی پەیڕەو چوار پارچە، بەبێ هەڵوێستی لێبڕاوی سەرکردەیەك، کادرێك، کەسێكو پۆلێك لەم هاوڕێیانە، کۆمەڵەی چوار پارچەکەی کوردستان، لەسەر سنوری دوو پارچەی باشورو ڕۆژهەلاتی کوردستان: بە هەڵە کوژرا، بەبێ کفن نێژرا، فرمێسکیشی بۆ نەڕێژرا.

ئێستا دوای (٤٢) ساڵ بەسەردامەزراندنی ئەم ڕێکخراوەدا، کە نوسەر، هێندەی لێی زانیوەو توانیویەتی، یەکێك بووە لە ئەندامە دڵسۆزە دانەبڕاوەکانی کۆمەڵە، ئاخۆ ئەرکی نوسەرانی مێژووی کۆمەڵە چییە؟ ئایە بەهەمان پێوانەکانی زەمانو زەمینەی سەرهەڵدانی کۆمەڵە، حوکمی لەسەر بدەن؟ یان بابەتیانە دامەزراندنو قۆناغەکانی (٢٨) ساڵەی کۆمەڵە هەڵبسەنگێنن؟

زۆر لەو نوسینانەی بنچینەی زانستیان نییە، یان بە رق، یاخود بە سۆزی سیاسی پەتی نوسراوون، هەر زوو ژاکاوون. بەلام ئەو نوسینانەی زانستین، بابەتین، لۆژیکینو بەڵگەدارن، بێگومان نەمرن. با دیقەت لە نوسینی مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ترۆتسکی بدەینو بەراوردی بە کتێبەکانی ستالین بکەین،

بزانین کامیان کتێبن‌و لە یادەوەری مێژووشدا کامیان مانـەوە، کامیشـیان تـەنها هەلپەرست سودیان لێوەرگرت‌و تەنها چەواشەکراوەکانی فریودا؟

ترۆتسکی.. لەو کەسانە بـوو لیـنین‌و لینینیسـتەکان، هەرچـیەکیان لەدەسـت هـات دریغیـان لـە نـابوتکردنی نـەکرد، سـتالینیش (٣٠) سـاڵ زیـاتر تـەواوی دەزگاکانی راگەیاندنی شورەوی‌و رۆژهەلاتی ئۆروپاو چین‌و کۆریا.. تاد، هاوکـات سەدان حیزبـی گـەورەو بچـوکی جیهـان، پیایانـدا هەڵـدەداو دەیـانکردە رابـەری هەڵکـەوتوی بونیاتنـەری سۆسـیالیزم‌و کۆمـۆنیزم. بـەڵام مێـژوو کـام لـەم دوو کەسایەتیەو کام نوسینی مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەری بەجوانی پاراست؟ سـەدان نمونـە لەسـەر مێـژووی حیزبـەکان، شۆڕشـەکان، روداوەکـان هـەن، سـەرجەمیان پێویسـتیان بـە پیاچـونەوەو شـەنوکەو کردنـەوە هەیـە. دەمێکـە لـە رۆژئـاواو رۆژهـەلاتی ئۆروپـادا، دەزگاکـانی چـاپ‌و نوسـەرو مێژوونوسـان، سـەرقاڵی توێژینـەوەی روداوەکـانی سـەدەی رابـوردون. ملیۆنـەها بەڵگـە دەسـتکەوتون، نوسراوە رەسمیەکان‌و نوسەرە کاسەلێسەکان سەراپا بەتاڵ دەکەنەوە.

ئێمەش، هەقوایە لـە روانگـەو میتـۆدی زانسـتیەوە مێـژووی شۆڕشـەکانمان‌و کۆمەڵەکەمان هەڵبسەنگێنین. نەك بە سۆزی پەتی، یان کینەو رق.

لەم پێودانگەوە، با بێینە سەر چەند دێڕو پەرەگرافێکی نوسەر، با بزانین چۆن دەدوێ، لە لاپەڕە (٩)دا ئاوا دامەزراندنی کۆمەڵە باسدەکات:

"کۆمەڵە بەرپەرچدانەوەیەکی بابەتی‌و خۆیی باری دراوی خوارووی کوردستان بوو، بۆ ئەو بارودۆخەی ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠ کە گەلی کوردی لەو پارچـەیەی کوردستاندا تێ کەوتبوو"

هەرچیەك بە زۆرەملێ، یان فێڵ، بۆ ماوەیەك بویسترێ بسەپێندرێ، هەرگیز ناتوانرێ نوسینێك بنچینەی زانستی نەبێ، بچەسپێندرێ.

کۆمەڵە، بەرپەرچدانەوەی بابەتی نەبوو. بەڵام دەستپێشخەریەکی خۆیی گەورە بوو. کاتێك دەوترێ بابەتی، دەبێ هەلومەرجە بابەتیەکە بسەلمێندرێ. ئاشکرایە هەلومەرجی بابەتی، ئەو هەلومەرجە بابەتییەیە کە سەرەنجامی قوڵبونی ناکۆکیەکان، لە رادەبەدەری چەوساندنەوە، بەبنبەست گەیشتنی دەسەڵات لە چارەسەرکردنی کێشەکانو رازینەبونی یەکجارەکی خەڵك بە سیستەمەکان، باری بابەتی دەخولقێ. گەر لەڕوانگەی مەتریالیزمی مێژووییشەوە باری بابەتی دیاری بکەین، دەبێ بڵێین: هەتا ئەوکاتەی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان نەبنە کێشەی گەورەی لەچارەسەرکردن نەهاتوو بۆ هێزەکانی بەرهەمهێنان، باری بابەتی نارەخسێ. لە کوردستانی دوای بەیانی ئازار، باری بابەتی لەم چەشنە نەخولقابوو. بەڵکو خۆشیەکی لەرادەبەدەر بەسەر گەلی باشوری کوردستان زاڵبوو.. بەعسیش خەریکی ریفۆرمی بەعسیانەو خۆشکردنی گوزەرانی خەڵكو ئاوەدانی بوو. وڵاتەکە شێوەیەك لە شێوەکانی بوژانەوەی، بەهۆی زیادبونی نرخی نەوتو زیادکردنی رێژەی بەرهەمهێنانو هەناردەی نەوتەوە، بەخۆوە دەبینی، بەڵام بوژانەوەیەك لە چوارچێوەی ستراتیژی ناسیۆنالیزمی گۆشەگیری عەرەبیدا. هەرچی چۆنێك بوبێ، قسەمان ئەوەیە باری بابەتی، لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵەدا، لەبار نەبوو.

لەڕووی خۆییشەوە، نوسەر خۆی دەڵێ: "بەکرەجۆی جەلالیەکان مەڵبەندی رۆشنبیرانو چەپەکانی ئێران بوو بۆ بڵاوکردنەوەی مارکسیزم بیری ماوتسیتۆنگ"، هەر نوسەر دەڵێ: "لەمەشەوە بناغەی دامەزراندنی کۆمەڵە دارێژرا". کەوابێ: باری خۆییەکەش، لەناو روناکبیراندا چەکەرەی کردووە، نەك لەناو بزوتنەوەی چینایەتی کرێکاران، رەنجدەران، خۆپیشاندانی فراوانی

نارەزایـانو خوێنـەواران. لەراسـتیدا، فـراوانترین نـارەزایی، لەوکاتـەدا هەسـتی پێکرابێ، نـارەزایی بـووە بەرامبـەر جەلالیـەکان. بـەڵکو رەفتـاری ناشایسـتەی خرۆشـاوی خـەڵکییان، بەهانـدانی پارتیـەکانو هەلپەرسـتو رق لـە دڵـەکان، بەرامبەر دەکـرا. (*) ئـیتر نـازانین نوسـەر، زیرەکـی روونـاکبیرانو چـەپەکان، لـەو هەلومەرجـەدا، بـۆ لێکدانـەوەی وردی رووداوەکـانو ئاینـدە، لـە دامەزرانـدنی رێکخراوێکی بچوکی وەکو کۆمەڵە، بۆچی هێندە گـەورە دەکـاتو دەیگەیەنێتـە خەملێنی باری بابەتیو خۆیی؟ راستیەکەی ئەوەیە، رووداوی هەرەسی (١٩٧٥)و دامەزراندنی یەکێتی، بەرپابونی شۆڕشو رۆڵی کۆمیتەی هەرێمەکان، لەوکاتەدا نەبوایە، ئاسان نەبوو کۆمەڵە لەو هەلومەرجـەدا ببێتـە ئـەو هێـزە بـەهێزە، کـە ئیستا نوسەر سەردەمی دامەزراندنەکەشی قەبە دەکات.

---

* ئەم تێکچونو تێکچڕژانەی نێوان جەلالیو مەلاییەکان، زۆری نەخایاند. دوای سێ مانگ گفتوگۆی هەردوو باڵەکەی پارتی دەستپێیکرد. پارتی شۆڕشگێڕ باشی کرد کە بڕیاری یەکگرتنەوەی دا لەگەڵ پارتی- بارزانی. بارزانیش کارێکی باشتری کرد کە یەکگرتنەوەی سەلماندو سەرپەرشتی پرۆسەی یەکگرتنەکەشی کرد.

## ٢

# کۆمەڵەو سێ دەستەی دامەزرێنەر !

من، لەو کەسانە نیم بتوانم وردو درشتی سەرگوزشتەی دامەزراندنی کۆمەڵە لە ساڵی (١٩٧٠) بنوسم. بەڵام کەسێکیشم لە سەرەتای کۆمەڵە، لە ئەڵقە رۆشنبیریەکانی کۆمەڵەوە، تێهەڵچومەتە جیهانی سیاسەتو ڕێبازی چەپ. لەدوای (١٩٧٥) یشەوە، گەر نوسەر پێشتر زیاتر لە منی لەسەر چۆنیەتی دامەزراندنی کۆمەڵەی زانیبێ، (هەرواشە) ئەوا لەوەبەدوا، نۆرەی من دێ زیاتر لەو بزانم. ئەویش بەحوکمی بەرپرسیارێتیم لە کۆمەڵەو شۆڕشدا.

نوسەر.. باسی سێ دەستە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵە دەکات. لە لاپەڕە (٢٢) دا ئاوای دەخاتەڕوو:

"کۆمەڵە لە سێ دەستەی بە شێوە لە یەك جوداو بە ناوەرۆك لێك نزیك پێکهات، دەستەیەکیان بە نوێنەرایەتی شەهیدی سەرکردە شەهاب شێخ نوری،و دەستەیەکیان بە نوێنەرایەتی مام جەلالو دەستەی سێهەمیش بە نوێنەرایەتی نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانیان"

ئەم سەرگوزشتەیە، هی خۆی نییە. کاك نەوشیروان مستەفا، لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا (مالیمۆس - ١٩٨٠) بەوشێوەیەی گێڕایەوە کە نوسەر دوبارەی کردۆتەوە. گێڕانەوەو دوبارەکردنەوەکە، ڕێیان تێدەچێ. بەڵام ئایە کوتومت وایە؟ ئایە وردەکاریەکەی چۆنە؟ ئایە بۆچی دەستەی شەهید شیهاب،

سەرەڕای پەیوەندیەکی گەرمی نێوان خالەشیهاب‌و مام جەلال، لە بەغداد، دەستپێشکەرییان لە دامەزراندنی کۆمەڵە کردو سەرەتا مام جەلالیان ئاگادارکردو مامیش کاك نەوشیروانی ئاگادارکرد؟ ئەمەیان بۆ؟

بۆچی پێکەوە، هەرسێ رابەرەکە (مام، شەهابی شێخ نوری‌و نەوشیروان مستەفا) پێکەوە لەیەك کاتدا، کۆنەبونەوەو کۆمەڵەیان دانەمەزراند؟

هەموان دەزانین پەیوەندی مام‌و شەهید شەهاب باش بووە، ئەی پەیوەندی شەهید شەهاب‌و کاك نەوشیروان چۆن بووە؟

هەمومان دەزانین مام جەلال لە رابەرەکانی تری کۆمەڵە کارامەتر، زیرەکتر، خاوەن کەسایەتیەکی گەورەو کاریگەرتریش بووە. بەلام لەهەمان کاتیشدا دەزانین، لە مێژووی خەباتی چەپدا، لەسەردەمی باڵی هەمزە عەبدوڵلاوە، شەهید شیهاب ماندوترو گومناو بووە. زۆریشی بەسەرهاتووە. هیچ بەرپرسیارێتیەکیشی لەناو باسکی (جەلالی)دا نەبووە. تەنانەت ئەندامیشیان نەبووە. بەلام لەنزیکەوە دۆستی مام‌و چەپەکانیان بووە. بەلام شەهید شیهاب، نوسەر و تیۆرسێن نەبووە. سەرکردەیەکی ناوداریش نەبووە. لەبەرامبەردا، نەوشیروان مستەفا، ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی جەلالی بووە. خاوەن ئیمتیازو نوسەری سەرەکی گۆڤاری رزگاری (١٩٦٩/٤/٢٠) بووە. لە نوسین‌و رەخنەو لێکدانەوەشدا کارامە بووەو هەیە، باشە..

بۆچی مام جەلال دەستپێشکەری لە دامەزراندنی کۆمەڵەو پێکەوەبەستنەوەی دوو رابەرەکەی تری نەکرد؟ئەی بۆچی نەوشیروان مستەفا وای نەکرد؟ ئەی کە کۆمەڵە دامەزرا، بۆ مام جەلال کرایە سکرتێری کۆمەڵەو نەوشیروان نەبووە ئەندامی سەرکردایەتیش. بەڵکو وەکو دامەزرێنەریش باس ناکرێ؟

وەکو لەناو وڵاتدا، لەبەر هەر هۆیەك بوبێ، کاك نەشیروان بەوشێوەیە قایل بووە بێتە ناو کۆمەڵە،(*) بەڵام ئایە خۆی پۆستی نەویستووە، یان پێی نەدراوە؟ ئەمەیان لێدەگەڕێین بۆ ئەوانەی وردتر شارەزان. بەڵام لەبەرچی دوای سەفەری نەوشیروان مستەفا بۆ ڤییەننا (١٩٧٢) ئەو ماوەیە بۆ لە کۆمەڵە دابڕا؟ بۆچی کۆمەڵە پەیوەندی پێوەنەدەکرد؟ لەبەرچی لە توانای نوسینی ئەو سودیان وەرنەدەگرت؟

نوسەر بەحساب شۆڕەسواری ساڵانی (١٩٧٠ – ١٩٧٥)ی دامەزراندنو گەشەکردنی کۆمەڵەیە؛ شەهید شەهاب لە ماڵیا لە کەرکوك خۆی شاردۆتەوەو خۆیشی زۆر بە دڵسۆزی دەزانێ، کەچی دوورونزیك، نە توخنی ئەو پرسیارانەو نە خۆی لەقەرەی وەڵامەکانیشیان دەدات. ئەمەیان، تەنانەت لە نوسینی کتێبێکی لەم چەشنەی نوسەریش، کەلێنێکی گەورەو پرسیارگەلی بێوەڵامن. کەچی بە بۆنەو بەبێ بۆنە، دەیان جار لە کتێبەکەدا، باسی عێراقچێتی سەرەتای کۆمەڵە، هەتا جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش دەکات، شەهید ئارامیش دەکاتە هێڵی عێراقی.. ئەمەیان نە راستەو نە دروستیشە. لەمەودوا دەشیسەلمێنین.

کاتێك ئەو پرسیارانە دەکەم، وەڵامی کەمترین لەو پرسیارانەم لە مام جەلالو کاك نەوشیروان بیستووە. ئەوەی دەشیزانم ئێستا دەینوسم. بەهیوام، وەکو نوسەرم لێنەقاومابێ لە تێکەڵوپێکەڵکردنی راستیەکانو هەڵگێڕو داگێڕی رووداوەکان.

---

* ئەوەی من زانیومە، دوای سەفەرەکەی کاك نەوشیروان بۆ دەرەوە (١٩٧٢) ئیتر دوابڕیاری داوە، گروپەکەی لەگەڵ کۆمەڵەدا، تێکەڵاو ببێ.

## ٣

# کۆمەڵەو ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ

نوسەر، ئێستاش، وەکو باسێکی زانستیو گێڕانەوەی مێژوویی باسی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ ناکات، بەڵکو وەکو شانازی پێوەکردنێك. کە هەقوایە، ئێستا، دوای (٤١)ساڵ لە دامەزراندنی کۆمەڵە، ئیتر وردەکاری لە گرتنەبەری ڕێبازی ماو، بەچاوی رەخنەگرتنەوە، باسبکرێ.

ساڵی (١٩٧٠) ڕێك (٣٤) ساڵ بەسەر سەرکەوتنی شۆرشی چینو (٤٩) ساڵیش بەسەر دامەزراندنی پارتی کۆمۆنیستی چیندا، تێدەپەڕێ.

لەو نیو سەدەیەدا، بەتایبەتی لەدوای جیاکردنەوەی هێڵی چینو شورەوی، هەروەها دوای مشتومڕێکی قوڵی هەمەلایەنەی ئەزمونە بەناو سۆسیالیستەکان، داگیرکردنی چیکسلۆفاکیا لەلایەن شورەویەوە، دورکەوتنەوەی رۆمانیاو یوگسلاڤیا لە ئۆردوگای شورەوی، بڵاوکردنەوەی سەدان کتێبو تێزو ڕێبازی جۆراوجۆر لەسەر مارکسیزم، ماویزم، جیڤاریزم.. دروستکردنی زۆربەشیان لە رۆژهەڵات، ناو فەلەستینیەکان، ئەمریکای لاتین، هیندستان، بەڵکو ناوبەناو لێبونەوەی باڵێك لەم حیزبو رەوتێك لەو حیزب لە ئێرانو تورانی ئەم جیهانەدا؛ لەکاتێکدا، بەتەواوی زمانەکانیش، رۆژهەڵاتیو بێگانە، ئەدەبیاتی حیزبەکان، رابەرەکان.. بڵاودەکرایەوەو لە کتێبخانەکانی عێراق، تورکیا، ئێران، بە زمانەکانی عەرەبی، تورکیو فارسی، هەروەها ئینگلیزیو زمانانی دیکەش، زۆروزەبەند بون.

نەك بیری ماویزم، بەڵكو بنچینەكانی ماركسیزمیش، دەمێك بوو مشتومڕی لەسەر هەبوو. لە ئەڵمانیادا، دوای دووەمین جەنگی جیهان، فێرگەی فرانكفۆرت، لەسەر پیاچونەوەو هەڵسەنگاندنەوەی ماركسیزم، دروست بوو. فەیلەسوفو بیرمەندی گەورە كاریان تێدەكرد (هابرماس، ئەدرنۆ). ماویزم، جگە لە وڵاتە دواكەوتوەكان، لە یەك وڵاتی رۆژئاوادا، برەوی نەبووە. بەڵكو نەشبوە مایەی مشتوماڵی تیۆریو ئایدیۆلۆژی. ئەو گروپو رێكخراوانەی بەناوی ماویزمیشەوە، لە رۆژئاوادا دامەزران، هەر زوو پوكانەوەو هەرگیزیش، نە توانییان یەك چەكدار بەرنە شاخو نە توانیشیان یەك كورسی پەرلەمان لە رۆژئاوادا، ببەنەوە. تەنانەت لەناو رێكخراوەكانی فەلەستینیشدا، جگە لە (مونیر شەفیق)و چەند كەسێكی دیكە، رێكخراوی مۆدێل ماوی، كوتومت دانەمەزرا. ئەوانەی هەتارادەیەك لەژێر كاریگەری چینو ماودا هەڵدەسوڕان، زۆری نەخایاند یان بونە پرۆ شورەوی، یان لە پاشكۆیەتی چین وازیان هێنا. وەكو: بەرەی رزگاریخوازی میللی فەلەستین (جۆرج حەبەش)، بەرەی دیموكراتی فەلەستین (نایف حەواتمە)، بەرەی میللی فەلەستین - القیادة العامة- (ئەحمەد جبریل).. تاد. خۆ یەمەنی دیموكراسیش، هەر مایەی باسكردن نییە كە لەنێوان چینو شورەوی تەراتێنیان دەكرد، شكستیشیان خوارد. لە تەواوی ئێرانیشدا، یەك رێكخراوی پرۆ چینی، بە سازمانی ئینقلابی تودەی ئێرانیشەوە، سەنگو كاریگەریان لەسەر روداوەكان نەبوو. (كورشی لاشایی)[*] یش، راستە ئاستێكی تیۆری بەرزی هەبووە، بەڵام سەركردەیەكی ناوادارو هەڵكەوتوو نەبوو. هەروەها هاوڕێكانیشی.

---

* كورشی لاشایی؛ دامەزرێنەری (سازمانی ئینقلابی حیزبی تودەی ئێران)ە، لەو تێكۆشەرانە بووە كە (١٩٦٨) بە نامەی د.كەمال فوئاد هاتۆتە كوردستانو لە بەكرەجۆدا، وانەی ماویزمو ماركسیزمی بە چەپەكان وتۆتەوە. یەكێك بووە لە هاوڕێ خۆشەویستەكانی مام جەلال.

لەوەزیاتر نامەویٚ لەسەر جەنجاڵیە تیۆریەکان بنوسمو لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژگارە سەبارەت بە چەپ هەڵبدەمەوە. تەنها ئەوەش پێویستە بڵێم: لەو سەردەمەدا، کاریگەرترین شۆڕشی ڕزگاری، شۆڕشی ڤێتنام بوو، چین لە شۆڕشی ڤێتنامدا (٣٠٠ هەزار) جەنگاوەری شەڕی دەکرد. کاروانی هاوکاری چین بۆ ڤێتنام، هەتا سەرکەوتن، نەدەبڕایەوە. بەڵام ڤێتنامیەکان، پاشکۆی چینو دێوانەی ماو نەبون. سەربەخۆیی سیاسیو ئایدیۆلۆژی خۆیان پاراستبوو. سەرەنجام، یەکەمین وڵاتیش، دوای ڕزگاری لەگەڵ ڤێتنامدا تێکچوو، هەتارادەی لەشکرکێشی کردە سەر وڵاتی ڤێتنامیش، چین بوو.

لەبەرامبەر نەخشەیەکی تیۆریو ئایدیۆلۆژیو سیاسی ئاوادا، کۆمەڵەی مارکسی — لینینی — ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ دادەمەزریٚ. دەستبەجێش، دەبێتە پەیڕەوی چینو پرکێشی دژایەتی شورەویش. ئایە، دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، لە پارتی کاری ڤێتنام، چینو بیری ماویزمیان باشتر دەناسی، ئاوا پانەوپان کەوتنە ناو چەقی ململانێکەوە؟

ئایە لەو هەلومەرجەدا، دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، لە ئەلقە ڕوناکبیریەکانی بەکرەجۆدا، یان بەغداد، پرسیاری نوێی ناباو، لەسەر مارکسیزمو ماویزم کراوە؟ کە دەبوایە، ئەو پرسیارانە کرابان، لێکیشدرابان، ئینجا ڕێبازی کۆمەڵە دیاریکرابا.

کاتێك حیزبی شیوعی عێراق دادەمەزریٚ، سەرجەم (٥) کتێبی وەرگێڕدراوی مارکسی لەبەردەستیان نەبووە سودی لێوەربگرن. تەنانەت ئەودەمە تێکڕا (٢٠) کتێبی سەرچاوە ڕەسەنەکانی مارکسیزم- لینینیزم، وەرنەگێڕدرابووە سەر زمانی عەرەبی. هەربۆیە، ئەو حیزبە، مێژوویەکی لاوازی لەڕووی تیۆریەوە لە چلەکانو پەنجاکاندا هەیە. بەڵام لە ئەدەبیاتی نیشتمانیو هاندانی خەڵکدا، قوڵبون. بەڵام سەردەمی دامەزراندنی کۆمەڵە وا نەبووە، سەدان سەرچاوەی جیاواز هەبووە.

زمانزان زۆر بون. ناکۆکیو مشتومڕ پەلوپۆی هاویشتبوو، کەچی کۆمەڵە، بەوشێوەیە دادەمەزرێ.

ئێستا کە نوسەر، باسی ئەو مێژووە دەکات، هەق نییە تەنها شەڕ بە (مەلایی)و (جەلالی)و (حیزبی شیوعی) بفرۆشێ. ئەویش بەهەمان پێوەرەکانی جاران، نەك بەچاوی رەخنەی سەردەم. هەقە، بابەتیانە هەقی بابەتەکەو باسەکەو روداوەکە، بدات. نەك بە سۆزی پەتی، بەبێ لێوردبونەوە لە بنجو بنەوانی دامەزراندنی کۆمەڵە، بناخفێ. با دیقەت بدەین، دەورانی خۆپەروەردەکردنی کادرانی کۆمەڵە، بەهۆی مام جەلالو رێکخراوی شۆڕشگێڕی حیزبی تودەی ئێران، مامۆستاکانی، ئەو دەورانە چی بە کادرەکانی فێربونی ماکسیزم لە بەکرەجۆدا، ساڵانی ١٩٦٨ – ١٩٦٩ دەڵێن:

" زۆرترین ئەو لاوانەی لە بارەگای تاڵەبانی بون، بڕوای رێبازی چەپیان هەبوو، بەڵام خوێنەواریو ئاگاداریەکی ئەوتۆیان نەبوو، تاڵەبانی پێی خۆش بوو بەهۆی هاتنی ئێمەوە بۆلایان ببێتە مایەی پێشکەوتنو وریایی ئەوانو رێڕەوی چەپ بەهێز ببێ." (*)

ئەم قسانە لەگەڵ قسەکانی نوسەر ئاسمانو رێسمانی بەینە. بەڵام ئەگەر بمانەوێ، ئەو قسانە شەنو کەو بکەینو لەو زەمانو زەمینەیەوە، حوکم لەسەر بەشدارانی خولەکانی پەروەردەی مارکسستیو ماویزم بکەین، دەڵێین: بێگومان، هەر ئەو لاوانەی، (ئیرەجی کەشکۆلی) باسیان دەکات، چەند تێکۆشەرێکیان کۆمەڵەیان دامەزراندو زۆربەی ئەوانی تریشیان، لە کادرە پێشکەوتوەکانی کۆمەڵە بوون. بەرە بەرە لەگەڵ ئاڵوگۆڕی روداوەکاندا، رۆڵێکی بەرچاویشیان

* نگاهی از درون به جنبش چپ ایران – گفتوگو به ایرج کشکولی – نوسینده: (حمید شوکت) – نشر اختران – چاپ اول، زمستان ١٣٧٩. ص(١٢٥).

گیرا. ئەوساو پاشانیش زانراوە، کە رابەرانی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی حیزبی تودەی ئێران، خۆیان گۆشکراوی خولەکانی پەروەردەی ماویزمی چینی بوون، هەر ئەمانیش کاریگەریەکی فراوانیان لەسەر کادرانی کۆمەڵە هەبووە. با بزانین ئیرەجی کەشکۆلی خۆی چی دەڵێت:

" کوتومت پێچەوانەی شورەوی، کە حیزبە دۆستەکانیان، بەهەموو شتێکی خۆیان زاخاودەدا، چینیەکان جەختیان دەکردەوە کە تەنها بە ئەزمونەکانی چینمان ئاشنادەکەن. ئەمانە زۆرتر پشتئەستور بە وتارو نوسینەکانی ماوتسیتۆنگ، مەسەلە تیۆریەکانیان پێدەوتینەوەو جاروباریش، تەرکیزیان دەکردە سەر مارکسو لینینش. "(+)

هەر ئیرەج لەهەمان لاپەڕەدا، سەرسامیی خۆی بەرامبەر بە سادەیی تێگەیشتنی فەلسەفەی ماوتسیتۆنگ دەردەبڕێت. واتا، پتر لە مارکسو ئنجلس. ئەمە لەکاتێکدا ماوتسیتۆنگ خاوەن فەلسەفە نەبووە. کەمترین باسی لەسەر فەلسەفە هەیە، بەلآم تێگەیشتویەکی قوڵ بوو لە فەلسەفەی مارکسیزمو باشیشی لەگەڵ خەباتی نیشتمانیو شۆڕشگێڕانی چیندا، موتوربەر دەکرد.

ئێستا کاتێك سیاسەتی چین، بەرامبەر ئەو مێژووەی ماوتسیتۆنگو تێزە تیۆریەکانی دەخوێنینەوە؛ کاتێك چارەنوسی سازمانی ئینقلابی ئێرانی لەبەرچاو دەگرین؛ کاتێك سەرەنجام، هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە دێنینەوە یاد؛ ئەوسا دەبێت تێبگەین، سەرەڕای ئەوەی دامەزراندنی کۆمەڵە، لەو هەلومەرجەدا، کارێکی گەورە بوو، بەلآم هەڵە ئەنجامدراوەکانی ئەوسا، لە باری ئایدیۆلۆژیو سیاسەتی پاشکۆی ماویزمەوە، لەناو کۆمەڵەدا، لە دامەزراندنەوە، هەتا دوای هەرەسی

+ گفتوگو با کورش لاشایی – نگاهی از درون به جنبش چپ ایران – حمید شوکت، نشر اختران – چاپ اول ۱۳۸۱– چاپ سوم ۱۳۸٦ – ص(٥١).

١٩٧٥ كاریگەری نالەباری هەبووە، کە ئێستاش ئاسەواری ئەو کاریگەریانە لە دەروونی بەشێکی کادرو هاوڕێیانی کۆمەڵەدا هەر ماوە. لەدوای پەلاماردانی سەرکردایەتیو کادرانی کۆمەڵەش، دوای تەسلیمکردنەوەی خاڵە شیهابو هاوڕێکانی، دوای کێشمەکێشەکانی دیکەی فیکریو سیاسیو ئایدیۆلۆژی لەناو شۆڕشدا، هەموو ئەم روداوانە، چەندین بازنەی پێکەوەبەستراوی بەردەوامیی کێشەکانی ناو کۆمەڵەن، کە بەشێکی ئەم کێشانە، سەرچاوەکەی بۆ چۆنیەتی دامەزراندنی کۆمەڵە، لەسەر ئەو بنچینە ئایدیۆلۆژیە سیاسیەی پاشکۆیەتیەی چینو ماو، دەگەڕێتەوە.

رەنگە، دورکەوتنەوەی مام جەلالو پاشان خاڵە شیهاب، هەروەها ساردبونەوەی هەندێك لە هاوڕێیانی کۆمەڵە، بەنۆرەی خۆیان، کاریگەری نالەباریان لەسەر رەوتی کۆمەڵەو رێڕەوی قۆناغەکانی هەبوبێ. وەلێ ئەوەی کە ئەڵقەیەکی ونی باسنەکراوی ئەو رۆژگارەیە، ئەوەیە کە بۆچی ماوەی ساڵێك، شەهید شیهاب لە سوریاو لوبنان نزیکی مام جەلال دەبێت، بۆچی ئەوکاتە هەردووکیان بەوردی بیریان لە رێبازی کۆمەڵە نەکردۆتەوەو ئەزمونی شۆڕشی فەلەستینو رێکخراوە چەپەکانیان، کە هیچیان وەکو کۆمەڵە پاشکۆی چین نەبون، لەبەرچاونەگرتووە؟ ئەمە پرسیارێکە، پێویستە لەئایندەدا وەڵام بدرێتەوە. بۆئەوەی وروژاندنی ئەم پرسیارانە، سەبارەت بە رێبازی کۆمەڵە، هەمەلایەنە بێت، جەخت لەسەر ئەم پرسیارانەش دەکەین:

- ئایە، هەر لەبەرئەوەی وڵاتێکی ژێردەستە بوین، راست بوو بەو چەشنە پاشکۆیە، بوین بە ماویو پرۆچینی؟

- ئایە، بەو ڕەوتو ڕێبازە، بەوجۆرە ئەدەبیاتە، سەرکردایەتی کۆمەڵە، بە خەباتی ژێرزەمینیش، توانیویەتی ئەندامو کادرانی کۆمەڵە، گۆشی مارکسیستانە بکات؟
- ئایە، سەرکردایەتیو کەرەسەی تیۆریو ئایدیۆلۆژی کۆمەڵە، بایی هێندە کاریگەر بون، ڕێکخراوێکی بیر تۆکمە پێبگەیەنێو بیگەیەنێتە ئاستێك بتوانێ بەرامبەر بەعس، پارتی، حیزبی شیوعی، شورەویو ڕۆژهەڵاتی ئۆروپا.. ململانێی پێبکات؟ ئەگەر وایە، بۆچی لەمێژووی خەباتی ژێرزەمینی کۆمەڵەدا، یەك باسی تیۆریو فەلسەفییو ئابوری تێروتەسەل، نابینرێ؟

با بەجۆرێکی دیکەش بپرسین:

- ئایە، ڕێکخراوێك، بە پەروەردەی لاوازی فەلسەفیی، بە ئەدەبیاتی کەمو نهێنی، بەو ڕێبازە ئایدیۆلۆژیە، بە سەرکردایەتی تەرخاننەکراو، بە نەبونی چاپخانەو چاپەمەنی بەردەوام.. لەبەرامبەر چەندین جەمسەری بەهێزدا، ئایە ڕێکخراوی ئاوا توانیویەتی ئەرکەکانی ڕێکخراوەیی خۆی بەپێی بەرنامەی دورونزیك، ڕاپەڕێنێ؟

لە وەڵامدا دەتوانین بڵێین: گەر خۆشەویستی کۆمەڵەو ڕێزی قوربانیو فیداکاری لێدەربکەین، بەراشکاوی دەتوانین بڵێن: کێشەکانی ناو کۆمەڵە، هەر لەوکاتەوە بەناوی عێراقیو کوردستانی، پاشانیش لەسەر ناکۆکی سەرەکیو ناکۆکی لاوەکی، لەبەر ڕۆشنایی تێزی سێجیهان، هەروەها، کێشمەکێشەکانی تریش لە ڕێکخستنەکانی سلێمانی ساڵی (١٩٧٤) و (١٩٧٥).. تێکڕا بەڵگەن کە کۆمەڵە، بە کەرەسەیەکی ئایدیۆلۆژی لاواز، بڕیاری چارەسەری کێشە فکریەکانی داوەو ڕووبەڕووی ئەرکی قورسیش بۆتەوە.

ئێستا، دوای (٤٢) ساڵ لە دامەزراندنی کۆمەڵە، دەرکەوت نەك کۆمەڵە لـە پەیڕەوکردنی ڕێبازی ماو، بەو پاشکۆیەتیە هەڵە بوو، بەڵکو چـین خۆیشـی لێـی پاشگەز بۆتەوە. کەوابێ:

ئەوکاتـە، هەرکەسـێك، لـە دامەزرێنـەران، کـادران، ئەنـدامانی کۆمەڵـە، ڕەخنەی لە گرتنەبەری کوێرانەی ڕێبازی ماویزم گرتبێ، ڕەخنەکەی لەجێی خـۆی بووە، بەڵکو گوێلێنەگرتنیان هەڵە بووە.

بۆئەوەی لێکدانەوەیەکی خـراپ بـۆ بۆچـونەکانم نـەکرێ، بەتایبـەتی لەلایـەن نوسەری کتێبەکەوە، دەڵێم: سەرەڕای ئەو هەڵانـەی باسمکردن، بـەڵام لـەو ئـانو کاتـەدا، دامـەزرانـدنی ڕێکخراوێکـی چـەپ، کـارێکی گـرنگو پێویسـت بـووە. ڕۆژگاری دوای (١٩٧٥)یش سەلماندی، دوربینیش بووە. لەشۆڕشیشدا، کۆمەڵـە، دیسان سەرەڕای کەموکوڕیو هەڵەو هەلپەرستی، ڕۆڵێکی مێژوویی گێڕا.

سـەیر ئەوەیـە، کۆمەڵـە کـە بەوشـێوەیە دامـەزراوەو بـەنهێنی کارەکـانی ڕاپەڕاندووەو بڕیاریشیان داوە، بە کاوەخۆ، خەریکی پەروەردەکردن بن، کەچی لە لاپەڕە (٢٩) دا نوسەر ئاوا باسی خۆی دەکات:

"دوو ڕۆژ دوای لەدایکبوونی کۆمەڵە (فەرەیدون عەبدولقادر) ببینمو هەواڵی لـەدایکبوونی کۆمەڵـەی پـێ ڕاگەیانـدم. بـێ هـیچ دوودڵییـەك خۆشـحاڵیو ڕەزامەندی خۆم بۆ کـارکردن لـە کۆمەڵـەدا دەربـڕیو بـە نامەیـەك بـۆ دەسـتەی دامەزرێنەرانم نارد. دوای ڕۆژێك وەڵامەکەم بە پەسەندکراوی درایـەوە. واتـە لـە ١٩٧٠/٦/١٤ وەك ئەندامێك لە ریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵـەدا دەسـت بـەکار بووم.."

ئـەم بـەڕێزە، یـان یـادەوەری تێکچـووە، یـاخود وادەزانـێ خوێنـەر دیقـەت بەکارناهێنێ. ئاخر کۆمەڵەیەك هەر لەسـەرەتای دامـەزرانـدنیا، کێشـەی ئـەوەی

بوبێ لەناو سێ دەستەدا، کام دەستە دامەزرێنەرە، کێ دەبێتە سکرتێر، نەوشیروان مستەفا چی لێبکەن. لەکوێ کاك فەرەیدون بەم هەموو سەرقاڵییەی لەناو ئەو کێشانەدا، فریاکەوتووە دوای دوو رۆژ نوسەر رێکبخاتو دوو رۆژیش دوای ئەوە، بە نامەی رەسمی پەسەندکردنەکەی بۆ هاتبێتەوە. نەوەڵڵا دوای دوو ساڵیش لە کۆمەڵەدا، نامەی رەزامەندیو پەسەندکردن بۆ هیچ کەسێك هاتۆتەوە.

ئەم جۆرە کەسانە، هێندە نوقمی خۆپەسەندین، تەنانەت نازانن رۆژمێری خۆشیان بەجوانی رێکبخەن. ئاخر بیوتایە ناڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵ کراوە. ئەنەیسە؛ بیوتایە ئاماژەیان پێداووم کە شتێك دەبێ، قەیناکە؛ بیوتایە لە قسەکان تێگەیشتم رێکخراوی نهێنی هەیە، یان دەبێ، یاخود بەتەمابێ، قبوڵمانە. بەڵام بەوشێوەیە کە دوای دوو رۆژ لە دامەزراندن بوبێتە ئەندامو دوای چوار رۆژ پەسەندەکەی بۆ گەڕابێتەوە. ئەمەیان بۆ نوسەر ئاساییە، بەڵام گاڵتەکردنیشە بەئەقڵی خوێنەر.

## ٤

# دژایەتی عێراقچێتیو ئەندامەتی پەرلەمانی عێراق

کەم کەس هەیە لەناو یەکێتیدا، بەئەندازەی نوسەر، خوو بە کێشەوە بگریو لەپەسا بیلێتەوە. یەکێك لەو کێشـە خووپێوەگرتوانـەی، عێراقچـێتییە. لەسـاڵی (١٩٧٨)وە، کە هاتۆتەدەرەوە، هەتائەمڕۆ، ئەم کراسەی عوسمان ناشواتەوە! لـەم باسانەشدا، خوێنەری وشیار هەستی پێدەکات کە بە مەرام، چۆن چۆنی، بەزۆری زۆرداری دەیـەوێ شـەهید ئـارامو[*] سـەرەتای بـیری عێراقچـێتیو کۆمیتـەی هەرێمەکان، لێك گرێبدات. ئەم برادەرە نازانێ، کە کێشـەیەك هێنـدە وترایـەوە، لـەڕووی سـایکۆلۆژیەوە، بەڵگـەی ئەوەیـە راسـت نییـە. یـان جێگـەی گومانـە. بۆئەوەی ئەمـەش بسـەلمێنین، واچـاکە جـارێ قسـەکانی ئـەو ریزبکـەین، ئەوسـا بۆچونی خۆمان دەربڕین. لە لاپەڕە (٣٢)دا، لەژێر سەردێری "سەرهەڵدانی بـیری عێراقچێتی"دا، وای دادەڕێژێ:

"هـەر پـاش لـەدایکبوونی کۆمەڵـە، بەماوەیـەکی زۆر کـورت، هەنـدێ لـە ڕۆشنبیرانی بیرچەپو بێـزارو بڕوان[illegible] بـە حزبـی شـیوعی عێراقـی هـەردوو باڵەکەی لیژنەو قیادەی مەرکەزیو هەندێ لە ڕۆونـاگبیرو بـیر چـەپەکانی پـارتی شۆڕشگێڕی ناسراو بە (جەلالی) چووەنە ناو ریزەکـانی کۆمەڵـەوە بـەو هیوایـەی

[*] شەوی ٨/ی مانگ، لە کاك فەرەیدون عەبدولقادرم پرسی؛ ئەرێ کاك ئارام قەت عێراقی بووە؟ لەوەڵامدا گوتی: قەت شتی وا نەبووەو کوردستانیەکی بەرچاوڕۆشنیشی بووە.

بتـــوانرێ (کۆمەڵــەی مارکســـی لینینـــی کوردســـتان — بـــیری مـــاو) ببێتـــە ئەلتەرناتیڤی هەردوو باڵی حزبی شیوعی لە عێراقو پارتیش لە کوردستاندا"

دوای لەدایکبونی کۆمەڵە بە ماوەیەکی کـورت، ئـەو هـەموو خەڵکـە لـەناو حزبیەکانی شـیوعیو رۆشـنبیرانەوە هاتبنـە نـاو کۆمەڵـە، هـەموو ئەنـدامێکی سەرەتاکانی کۆمەڵە هەتا سـەرەتای هەشـتاکانیش بـاش دەزانـن، ئەمـە لەتـەك پرنسـیپو دیسـپلینی ئەوسـای کۆمەڵـە نـەدەگونجا. کۆمەڵـە تـاك تـاك، دوای دڵنیابون، ئەندامو لایەنگری وەردەگرت. پاشان، ئێستا خـۆ لـە خـەباتی نهێنیـدا نین، ئەوانە کێن کە لە حیزبەکانەوە هاتونەتە ناو کۆمەڵە؟ هـیچ نـەبێ "هەنـدێ لە رۆشنبیرانو بیر چەپ بە حیزبی شیوعی هەردوو باڵەکەی" وەکو نوسەر دەڵێ، خۆ ئەو (هێند)ە، دەبێ لایەنی کەم (١٠) کەسێك بوبن، دە نـاوی چـوار کەسـت هێنابا هەتا خوێنەر بـاوەڕی بکردبـا. مـن، جگـە لـە حەمـەی مـیرزا سـەعیدی خوالێخۆشبوو، کەسی دیکە شك نابـەم. بـا لەمـەیان گـەڕێینو بیکەینـە خـاتری خۆشەویستی نوسەر بۆ کۆمەڵە.

ئینجا لە لاپەڕە (٣٣)دا دەنوسێ:

"سـەرهەڵدانی بـیری عێراقچـێتی لـەناو کۆمەڵـەدا هـەر لـەناو دەسـتەی دامەزرێنەرەوە تا ئەڵقەکانی رۆشنبیری تەنیەوە، ئەوەش بوو بەهۆی سەرهەڵدانی مشتومڕێکی تێرو پڕو چڕ لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا."

ئـەم چـەند دێـڕە چـی دەگەیـەنێ؟ قسـەکانی پێشـووی ئێمـە ناگەیـەنێ کـە کۆمەڵــە، رێبـــازو ئایدیۆلۆژیەکـەی، بـــەبێ توێژینـــەوەی وردو هەڵســـەنگاندنی هەمەلایەنە، پەسەندکردووەو بەبێ پێوەری ئایدیۆلۆژیو رێکخراوەییش سـەرەتا، هەرکەسێك گوتبێتی چـەپو مارکسـیزم، وەرگـیراوە، گـەر وانـەبێ، چـۆن دەبـێ

ڕێکخراوێکی تازە دامەزراو، (لەدەستەی دامەزرێنەرەوە تا ئەڵقەکانی ڕۆشنبیری تەنیوەتەوە) واتا:

لەسەرەوە بۆ خوارەوە، دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، لەبەر هۆی جۆراوجۆر، ئەندامیان وەرگرتووە. تەنانەت دەستەی دامەزرێنەریش بەرچاوی بۆ دیاریکردنی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە ڕۆشن نەبووە. چ جای بۆ خوارەوە. دەی کاکی نوسەر، ئەم چەشنە دامەزراندنە، بەرپەرچدانەوەی بابەتیو خۆیی بوو وەکو لە لاپەڕە (٩) دا دەفەرموی. یان ڕێکخراوی دەستەیەك روناکبیری شارەزاو شۆڕشگێڕی بیر جیاوازی کوردستان بون.

بەش بە حاڵی خۆم، دیالۆگ بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی وەکو کۆمەڵە بەپێویست دەزانم. هەروەکو لەسەردەمی (باسکی جەلالی)داو لە بەکرەجۆدا کراوە. بەڵام دوای دوو ساڵ دیالۆگ، ئینجا کۆمەڵە دادەمەزرێ، سەرەنجام وا دەکەوێتەوە کە دەستە دامەزرێنەرەکەشی عێراقچیی تێدەکەوێ. ئەمەیان، هەم لەڕووی فکریەوە، هەم لەڕووی پاراستنی نهێنیەکی ڕێکخراوی فرەدوژمنی نهێنیشەوە، هەڵەیەکی قورسە.

لەمەیاندا، نوسەر ناتوانێ بڵێ ئەم حاڵەتە لەبەر دیموکراسیبونی کۆمەڵە رویداوە. ئەمەیان وا نییە. ڕێکخراوێکی تازە دامەزراو، کە جارێ سەرەتای خەباتێتی، ناتوانێ لافی دیموکراسیبون لێبدات. دیموکراسی، پرۆسەیەکی دورودرێژی حیزبیو سیاسیو تاقیکردنەوەی دەستاودەستکردنی سەرکردایەتیو سکرتێرو ئۆرگانە باڵاکانە. قبوڵکردنی رەخنەو رای جیاوازە.

هەموو ڕێکخراوێك، بەتایبەتی ڕێکخراوی وەکو کۆمەڵە، کە دوای ساڵەها مشتومڕ دامەزراوە، پێویستە بەدیقەت سەرکردایەتیو ئەندامو ئەڵقەکانی هەڵبژێرێ. کە هەڵەی قورسی کرد، ئیتر بەوە داناپۆشرێ باسی دیموکراسی بکرێ.

## ٥

# ئارامو عێراقچێتیەکەی پەرلەمانتارەکەی عێراق

ئەم تێکەو لێکەیە لەسەر عێراقچێتی، دەهێنێو دەبا، سەرەنجام، هەموو جارێك لە دەیان شوێندا، خڕ خڕ دێتەوە سەر شەهید ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکان، دوای ئەوەش، بەرۆکی سالار عەزیز، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامیو ملازم عومەرو کادرەکانی دیکە دەگرێ. گوایە، لە قۆناغی جیاوازدا، ئەمانە عێراقی بوبن. هێندە رقی لە شەهید ئارامە، ئاشکرا بۆی هەڵدەبەستێ. فەرمون بزانن، لەسەرەتای کۆمەڵەوە، دوای باسکردنی شەهید فازیلی مەلا مەحمود، دووەمین کەس دێتە سەر شەهید ئارامو لە لاپەڕە (٣٣)دا ئاوای بۆ هەڵدەبەستێ:

"شاسوار جەلال ناسراو بە (شەهید ئارام) کە دوای ئاشبەتاڵو گرتنی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ١٩٧٥دا، کۆمیتەی هەرێمەکانی دامەزراند. شەهید ئارامیش وەك هاوڕێکانی تری لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا نەما، بەڵام گرتنی بە کۆمەڵی ئەندامانی سەرکردایەتیو سکرتێری کۆمەڵەی بە هەل زانی بۆ دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکانو کۆکردنەوەی زۆربەی ئەندامە کۆنەکانی خاوەن رەوتی عێراقچێتی لە ناویدا."

ئێجگار سەیرە، گەوهەری مرۆڤێك هێندە کینەڕێژو بوغزاوی بێژ بێ، دوای (٣٣) ساڵ لە شەهیدبونی ئارام، لە مەرگیشدا، کێلەکەی بەرناداو بوختانی

ئاشكراى بۆ هەڵدەبەستێ. بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کە ئارام، دەیان هاوڕێی زیندوی ماوون. سەدان تێکۆشەری شایەتیشی هەن. بەڵگەی نوسراو و کۆبونەوەی جۆراوجۆری دەیسەلمێنن کە ئارام کێ بووەو نوسەریش چۆن بەپێچەوانە باسی دەکات.

جارێ، نەشیاوە بۆ نوسەر، ئەو بوختانە هەڵدەبەستێ، گوایە شەهید ئارام، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، لە ریزەکانی کۆمەڵەدا نەماوە. ئەم تومەتە دوورونزیك راست نییە. دەیان بەڵگەش هەن بوختانەکە بەتاڵ دەکەنەوە. باشترینیان ئەوەیە کە ئارام، وەکو رێکخستن لە زینداندا (نامەوێ ناوی بێنم) کەسێك خۆی نەگرتو زمانی لێدابوو کە ئارام رێکخستنەو بەرپرسیارێتیشی هەیە. ئەمە یەکەم؛ دووەم، گەر شەهید ئارام رێکخستنو بەتەنگ چارەنوسی کۆمەڵەوە نەبا، گەر دووربا لە کاری رێکخراوەیی، ئەی بۆچی ئەمیش هەوڵی خۆدەربازکردنی، دوای ئەمری گرتن دەرچونی نەدا؟ کە ئەشیتوانی بەئاسانی بگاتە سوریا، یان دەرەوە. (*) کەسێك باوەڕی بە رێکخستنێك نەمابێ، دوای توشبونو هەڵهاتنی، دوای ئەوەی رێکخراوەکەی دوچاری هەڵدێری گەورە بوبێ، رێکخراوەکەی لەسەر ساجی عەلی بێو توانای بەڕێوەبردنی کادرێکی خۆیشی نەبێ، یەکێکی وەکو ئارام، چۆن شان دەداتە بەر رێکخراوێکی جەزرەبەلێدراو، گەر باوەڕی پێی نەمابێ، یان لە ریزەکانیا دورخرابێ؟!

دوای ئەوەی رێکخراوەکەی لێشی دەقەومێ، بەهەموو توانایەکەوە بۆی تێبکۆشێ هەتا باری گلاوی رێکخراوەکە نەك راستبکاتەوە، بەڵکو بیشیگەیەنێتە ئەو ئاستەی ململانێ لەگەڵ هێزە باڵادەستەکانیش بکات.

---

* رەفیق پشدەری، بەڵێنی دابوو کە کاك ئارام، بەسەلامەتیو بە سەیارەی کەمال پشدەری برای، بگەیەنێتە سنوری سوریاو ئاودیویشی بکات، شەهید ئارام رەتیکردەوەو گوتی: رۆژی تێکۆشانە لەناو وڵاتدا.

ئەوە سەبارەت بە وازهێنانی شەهید ئارام. دەربارەی ئەوەش گوایە لەسەرەتای کۆمەڵەوە، لە رەوتی عێراقچیەکان بوبێ، لەمیشدا گوناحێکی گەورە ئەنجامدەدات. نوسەر، یەکەمین کەسە لەسەر ئەو مێژووە، لەسەر ئالاهەڵگرانی عێراقی، قسە بکات و شەهید ئارامیش بکاتە هاوسەنگەری شەهید فازڵی مەلا مەحمود، یان فوئاد قەراغی و کەسانی دیکە. پێشتر کەس قسەی وای نەکردووەو دڵنیاشین پاشتریش کەس نادۆزینەوە قسەی وا لەسەر شەهید ئارام بکات. چونکە دوورزنزیك راست نییە. شەهید ئارامیش لەو کەسانە نەبووە بیرورایەکی هەبوبێ، لەناخیا شاردبێتیەوەو باسی نەکردبێ. نەك لەکاتی دامەوزراندنی کۆمەڵە، بەڵکو ساڵی (١٩٧٧)یش، شەهید ئارام لەگەڵ شەهید فازڵی مەلا مەحمودو قیادە مەرکەزیەکانی (وحدة القاعدة) لەسەر کوردستانی و عێراقی، ململانێی دەکرد. -

دووورونزیك، چەند لەگەڵ شەهید ئارام بوم، شەوانم لەگەڵ بردۆتەسەر. رۆژم لەگەڵ کردۆتەوە. سەدان کۆبونەوەو دانیشتن و پێکەوە قسەکردنمان هەبووە. باسی جیهان، عێراق، مارکسیزم، کوردستان، لایەنەکان و ململانێکان، ئەوەی هەبوەو پێشبینی کردووە، بۆی باسکردوم. بۆ یەك جاریش هەستم پێنەکردووە ئارام، باوەری بە حیزبی سەرانسەری کرێکارانی عێراق بوبێ.

گوایە شەهید ئارام "گرتنی کۆمەڵێ ئەندامانی سەرکردایەتی و سکرتێری کۆمەڵەی بە هەل زانی بۆ دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکان" هەتا بتوانێ، دیسان گوایە "زۆربەی ئەندامە کۆنەکانی خاوەن رەوتی عێراقچێتی" کۆبکاتەوە.

بەزەییم پیادێتەوە، ئاوا جڵەوی بوختانکردنی پێ توند ناکرێ.

مرۆڤ.. بگاتە رادەیەك رق بە شەهید ئارام، یان هەر شەهیدێکی دیکە، برێژێ. قورسە بتوانی حوکمی لەسەر بدەی. هەرچیەکی پێبگوترێ، یان هەرچی

چۆنیٚ وەڵامبدرێتەوە، ناتوانی بۆ چرکەیەکیش گیانی پاکی شەهیدەکە ئاسودە بکەیت. گوناحێکی گەورەیە بوختان بۆ زیندوو بکرێ، چ جای بۆ شەهید. کە نوسەر نەك بوختان، بەڵکو لەوەش خراپتر، هەوڵێکی زۆریش دەدات لەنێوان شەهید ئارام‌و شەهید شەهابدا، ناکۆکی هەڵبەستێ، هەتا لەپەنای شەهید شەهاب‌و لەژێر پەردەی دڵسۆزی بۆ رێبازی راستەقینەی کۆمەڵە، رق‌و کینەی خۆی برێژێ. دوایی دێینەوە سەر ئەم باسەو باسی دەکەینەوە، کە ئەم جۆرە ئاکارە لە سیاسەتدا، بۆ هەڵبەستنی ناکۆکی لەناو شەهیدو هاوسەنگەرەکان، چ جۆرە رەوشتێکی نزمی سیاسەتە، کە دەگمەنن ئەوانەی پەیڕەوی لە سیاسەتی وا، بەرامبەر شەهیدەکانیش دەکەن.

ئارام کۆمیتەی هەرێمەکانی دروستنەکرد. سەرکردایەتی کۆمەڵە پێش رۆشتنیان دروستیانکرد. دوای ئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە، زۆربەیان گیران، کۆمەڵە بێ سەر مایەوە. کوت‌ومت دەتوانین بڵێین: کۆمەڵە.. بێ سەرو.. شوێن مایەوە. لەوکاتەدا، شەهید ئارام خۆی شاردبوەوە. من‌و شەهید ئازاد هەورامی‌و کاك سالار عەزیزیش خۆمان شاردبوەوە. دوو مانگ زیاتر، پەیوەندی رێکخستن نەما. لێرەو لەوێ هەوڵ درا، سەری نەگرت. من کەسوکاری کاك سالارم دەناسی‌و لەرێگەی ئەوانەوە، دۆزیمەوە. هەتا منی ناسیەوە، قیر وتی چەق. لەسەر چارەنوسی کۆمەڵەو ئەو دۆخە نالەبارەی هاتۆتە سەری، قسەمان زۆر کرد. پێم وت: دەبێ هەوڵ بدەین‌و چیمان پێدەکرێ بیکەین. یەکسەر قبوڵی کردو گوتی: من لێرە خەڵك دەناسم‌و پەیوەندیان پێوەدەکەم، منیش گوتم: منیش هاورێ ئازاد هەورامی، رێکخستنەکانی بەغدادو خانەقین، خەڵکی تریش دەناسم. سەر لە هەموویان دەدەم. یەکسەر چومە کەرکوك‌و شەهید ئازادم بینی. سەرگوزشتەکەم بۆ باسکردو ئەویش تەواو ئامادەبوو. گوتیشی (فستق فرۆش) بەرپرسیاری هەولێرەو هاورێمە دەیدۆزمەوەو دێینە

سلێمانی. کاتو ژوانگەی یەکتربینینمان لە چاخانەکەی (عەریف عەلی) تەنیشت حەمامی شەعب، لە سابونکەران دانا. کورتیەکەی.. ئەوان هاتن. خۆمان کۆبوینەوەو ڕێککەوتین. ئینجا کاك سالارمان بینیو بەرنامەمان دانا. دوای دوو یان سێ کۆبونەوەی چوارقۆڵی (سالار، ئازاد هەورامی، عەبدولرەزاقو مەلا بەختیار) ڕێککەوتین لیژنەی سەرپەرشتی کاتیی دروست بکەین، ئەو لیژنەیە یەکەمین کۆبونەوەی لەماڵی کاك ئەمینی برای کاك سالار، لەسەرەتای مانگی (١١/١٩٧٥) دا کرد. ئەم چاوپێکەوتنانەو دوو کۆبونەوەیە، نە کاك ئارام ئامادە دەبوو، نە ناوی کۆمیتەکەشمان نابوو. تەنها کاك سالار قسەوباسەکانی بۆ شەهید ئارام دەگێڕایەوە. سەرەنجام، مِن داوام کرد، کۆبونەوەی ئایندە، کاك (شاسوار)یش ئامادەبێ. قسەوباس کرا لەسەرئەوەی کە ئارام بەرپرسی هیچ شارێك نییە. گوتمان: بۆ نوسینو کاری دیکە، زۆر پێویستە.

(لەلاپەڕە ١٨١ دا، دێمەوە سەر وردەکاری سەرگوزشتەی کۆمیتەی هەرێمەکان)

## ٦

## هۆنینەوەی نوسەر!

لە درێژەی چەسپاندنی بۆچوونەکانی، نوسەر لەسەر چۆنیەتی عێراقچێتی بەردەوامو عێراقچێکانی گەلێ گەورەو قەبە کردووە، هەتا دەریبخات کە ئەو رەوتە گوایە چەند لەسەر کۆمەڵە، مەترسیدار بوون! لەمەشدا مەرامی ئەوەیە ئەو مێژووە درێژەپێبدا هەتا دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکانو کۆمیتەی هەرێمەکانیش گرێبداتە شەهید ئارامو سەرەنجام رقو کینەی برێژێتە (ئاڵای شۆڕش)و بشڵێ: ئەو تاوانەی کراوە بەرامبەر مەلا بەختیارو هاورێکانی.. هەقو رەوا بووە. ئەمەیان دوایی وردتر دێینەوە سەری. ئێستا با خوێنەر دیقەت بداتو بزانێ لە لاپەرە (٣٤)دا چۆنی (رازاندۆتەوە!!):

"هەر دوولا، واتە (عێراقیو کوردستانی) تەقەلای ئەوەیان دەدا، کە ڕاستیو رەوایی بۆچوونەکانی خۆیان بسەلمێنن، بۆ ئەمەش پەنایان دەبردە بەر دەیان سەرچاوەی کوردی خۆماڵیو عێراقیو ناوچەییو دەرەوە، لە هەموو بوارەکانی (مێژوویی، فەلسەفی، ئابووری، جیۆپۆلیتیکی، ئەزموونی گەلانو وڵاتانی شۆڕشگێڕی سەرکەوتوو ژێرکەوتوو، گەلانو وڵاتانی داگیرکراو نیمچە کۆلۆنی، نووسینەکانی مارکس، ئەنگلز، لینین، ستالین، هۆشی منە، ژەنەراڵ جیاب، ماوتسی تونگ، لین بیاو، ئەنوەر خۆجا، منیر شفیق.. هتد)."

رێکخستنێکی نهێنی، لەبەرامبەر موخابەراتی عێراقو پاراستنی پارتیدا، لەهەلومەرجێکدا (باسکی جەلالی) تێکشکاوە، نوسەر، ئەو مشتومڕە لابەلاو نهێنییەی لێکردوینەتە سەردەمی جیهانگیریو لیبرالیەتی رۆژئاوامان بیردەخاتەوە. بۆئەوەی ئەم قسانەشی بۆ بچێتەسەر، سەیر بکەن ناوی کام رابەری بەناوبانگی جیهانیمان بۆ ریزدەکات، هەتا کوردستانیو عێراقچیێتی ساغبکاتەوە. من دەپرسم:

هۆشی منە، ژەنەراڵ جیاپ، ماوتسیتۆنگ، لین پیاو، ئەنوەر خۆجا.. چ پەیوەندیەکیان بەو مشتومڕەوە هەیە لەسەر کوردستانیو عێراقچیێتی. ژەنەراڵ جیاپ، دەبێ باسی مۆشەکی کوردستانیو پارتیزانی عێراقچیێتی، لە کام نوسیندا کردبێ. ئاخر لە ڤێتنامدا، کێشەی نیشتمانیو رزگاری هەبووە؟ جیاپیش سوپاسالاری شۆڕشی رزگاری بوو. هەرگیز خۆی لە قەرەی نوسینی تیۆریو ئایدیۆلۆژی لەم چەشنە نەداوە.

## ٧

# رۆشتنی عێراقیەکانو مانەوەی ئارام !!

لەدرێژەی ئەم باسەدا، سەرەنجام لە لاپەڕە (٣٤)دا دێتە سەر ئەوەی گوایە:

"ئەو ململانێ ناوخۆییە ماوەی نزیکە ساڵێکی خایاند، تا دواجار بڕیاردرا کە بۆ ماوەی (٢) دوو مانگ هەردوو بۆچوونەکە بە بەڵگەکانیانەوە بخەنە بەردەم ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە تا لەماوەی ئەو دوو مانگەدا بەشێوەیەکی دیموکراتیانە رای خۆیانی لەسەر بدەنو لەئەنجامدا زۆرینە بەلای کام لایەندا بوو، ئەوەیان بمێنێتەوەو ئەوی تریان بێ (تكتل و أنشقاق) وەك تاك لە کۆمەڵە بچنە دەرەوە. لە ئەنجامدا لە مایسی ١٩٧٢ لایەنی کوردستانی زۆربەی هەرەزۆر دەرچوو، ئەوانەش کە لایەنی بیری عێراقی بوون لە کۆمەڵە چوونە دەرەوە."

من هیچ قسەیەکم لەسەر ئەم پەرەگرافە نییە، با بەبێ مشتومڕ لە نوسەری قبوڵ بکەین کە بابە وایە، بەڵام گەر شەهید ئارام عێراقی بوو، بۆچی کۆمەڵەی جێنەهێشت؟ خۆ ئەمیش دەیتوانی ڕێکخستن جێبێڵێو لەگەڵ هاوڕێ عێراقیەکانیدا، ماڵئاوایی لە کۆمەڵە بکات. خۆ ئەوکاتە، نە کۆمەڵە دەسەڵاتو زیندانی هەبوو، نە نوسەریش زیندانەوان بوو (هەروەکو ساڵی ١٩٨٦ بوو بە زیندانەوانی ئێمە) هەتا شەهید ئارام لەترسا نەیوێرابێ، دوای بیروباوەڕی خۆی بکەوێ. لەبەرئەوەی باوەڕی بە کوردستانیەتی کۆمەڵە هەبوو (نەك عێراقچێتیەکەی نوسەر) بۆیە لەناو کۆمەڵەدا مایەوەو کە شەڕی (١٩٧٤-

١٩٧٥)یش لەنێوان عێراقو گەلی کوردستاندا هەڵگیرسایەوە، شەهید ئارام چووە ریزی پێشمەرگەو نوسەر لەشاردا مایەوە. ئەمە لەکاتێکدا وەکو خۆی لە پەراوێزی لاپەڕە (٣٥)دا وای باسدەکات گوایە بەشێکی یادەوەریەکانی کیم ئێل سۆنگی وەرگێڕاوە. من زانیاریم هەیە کە بابەتەکانی کیم ئێل سۆنگ، حلمی عەلی شەریفو شەهید ئارامو کاك نەوشیروان وەریانگێڕاوون. تەنانەت شەهید ئارام بۆی گێڕاومەتەوە، دوای وەرگێڕانی بابەتەکانی کیم ئێل سۆنگ، خەڵاتیان بەناوی سەرۆکی کۆریاوە، لەلایەن سەفارەتی کۆریای باکورەوە پێدراوە. ئیتر نازانین نوسەر، لە پاداشتی وەرگێڕانەکەی، کێ خەڵاتی داوەتێ؟

لە (١٩٧٠)شەوە هەتا هاتنەدەرەوە، لەسەر لاپەڕەی هیچ رۆژنامەو گۆڤارێکدا، نەماندیوەو نەمانبیستووە، نوسەر، تاقە ستونێکیشی نوسیبێ. یان لاپەڕەیەکیشی لەسەر هیچ بابەتێك وەرگێڕابێ. بابەتە وەرگێڕاوەکانی ئەوکاتەی ماو و کیم ئێل سۆنگ، ئاشکرا چاپ دەکرانو لە کتێبخانەی (بیری نوێ)ی کۆمەڵە لە بەغداد- شەقامی سەعدون، دەفرۆشران. نازانین بۆ هەڤاڵانی تر بەئاشکرا بابەتەکانیان وەرگێڕاوەو نوسەریش بە نهێنی؟! مەگەر خۆی وەڵام بداتەوە.

دەیگێڕێتەوە لە مانگی (١٩٧٤/٣)یشدا، سیخوڕەکانی ئەمن چاودێرییان کردووەو مەترسی لەسەربووە. بەپێی بڕیاری ئەوسای کۆمەڵەش، ئەوەی مەترسی لەسەربوبێ، یان عەسکەری لەسەربوبێ، دەبوو بچێتە دەرەوە. نوسەر سکرتێری کۆمەڵە لەماڵیان خۆی شاردۆتەوە. بڕیارەکەش باش دەزانێ. لەلایەن سیخوڕەکانیەوە چاودێریش کراوە. لە لاپەڕە (٥٧)دا دەڵێ:

" لە مانگی ١٩٧٤/٣ دا هەستم بەوە کرد بوو، کە سیخوڕەکانی (أمني کەرکوك) چاودێریم دەکەن."

نوسەر نەچووە دەرەوە. چونکە تەنها بە قسەو رستەی بریقەدار، شۆڕشگێڕ بوو. دەیزانی چونەدەرەوە، رووبەڕوی مەرگیشی دەکات. بۆیە توخنی چونەدەرەوە نەدەکەوت. لەم شۆڕشەدا وایکرد، هەتا توانی خۆی خلافاند، کە زانی چاری نەماوە، بەو مەرجە هاتەدەرەوە بکرێتە ئەندامی سەرکردایەتی. ئەمەیان چیرۆکێکە لەکاتی خۆیدا دێمەوەسەری و بۆتان دەگێڕمەوە. کە نوسەر چ کۆمەڵەیەك، چ کوردستانیەك بووەو.. پاشان چۆن چۆنی لەتەنگانەدا کوردستانیشی جێهێشت.

## ٨

## هەڵبەستنی ناواش ؟!

ئەم برایە، کە خەیاڵی نەرگسیەت داگیری دەکات، ئیتر ئاگای لە پانایی رووداوەکان نامێنێ، لەبەرئەوەی رۆڵێکی ئەوتۆی لە مێژوودا نەبووە، هەمیشە هەوڵ دەدات، داستان بۆ خۆی یان بۆ گێڕانەوەکانی دابتاشێ. ئەوەی لای گرنگە، لەوکاتانەدا خەیاڵی نەرگسیەتی ئاسودە بکات، ئیتر چش لە مێژوو، چش لە راستیەکان، چش لە هاوڕێکانی‌و چش لەوەی ماوەو نەماوە. لە باسی خاڵە شیهابدا.. ئێوە لە لاپەڕە (٥٥)دا دیقەت لەم هەڵبەستنانە بدەن:

"زۆربەی رۆژەکانی هەفتە جلوبەرگی کاری دەپۆشی‌و دەرۆیشت بۆ کار بۆ ناو کرێکارانی کورەی گەچەکان یان بۆ ناو کرێکارەکانی مەیدانی حەسیرەکە و جوت قاوە."

ئاخر کەسێکی گەورەو سکرتێری رێکخراوێکی نهێنی، کە موختەفی بوبێ، کاری هەڵەی وا چۆن دەکات؟ چۆن دەشێ باوەڕت پێ بکرێ کە خاڵە شیهاب زۆربەی رۆژانی هەفتە، بە جلی کرێکاریەوە، چوبێتە ناو (کورەی گەچەکان)و (مەیدانی حەسیرەکە)و (جوت قاوە). کاری وا، نە شەهید شیهاب پێویستی پێی بووە، هەتا بیسەلمێنێ بەرگی چینی بۆرژوازی بەتەواوەتی لەخۆی داماڵیوە، چونکە خاڵە شیهاب لەو تاقیکردنەوەیە دەرچوبوو، پێویستی بە شانۆگەری واش نەبوو. لەڕووی خۆپاراستنیشەوە، سکرتێری کۆمەڵە، کە خۆی دەشارێتەوە،

چۆن سەرچڵێتی وا دەکات؟ چۆن خۆی دەخاتە بەردەم هەڕەشەی گرتن، هەر بۆئەوەی نوسەر پێی بڵێ پرۆلیتار؟!

گەر خاڵە شیهاب، شانۆگەری وای پێشکەش کردبێ، جگە لە نوسەرو هاوسەرەکەیو ئەوپەڕەکەی دوو سێ هاوڕێی دیکە، خۆ کەسی دیکە، پێی نەزانیووە کاری وا دەکات.

کارکردن بەوشێوەیە، لەکاتی خۆشاردنەوەدا، کەسایەتی چینایەتی کۆمۆنیستی بۆ کەس دروست ناکات، هێندەی زیانی پێدەگەیەنێ. خۆ ئەمە بزوتنەوەی بەرینی خەباتی کرێکارانو سەندیکایی نییە، هەتا خاڵە شیهابو هاوڕێکانی، بێنە ریزی پێشەوەو ببنە رابەریشی. ئەمە کارێکی سەرچڵانەیە، ئەوەی دوورونزیك شەهید شەهابی ناسیبێ دەزانێ، ئەم رابەرە هەڵکەوتووە، سەرچڵ نەبووە. رەنگە، جارێك دوو جار، یان زیاتریش، چوبێتە مەیدانەکە هەتا لەنزیکەوە دۆخی ژیانی کرێکاران بزانێ. بەڵام کرێکاریکردن هەتا ئێوارە، لە خاڵە شیهاب نەوەشاوەتەوە.

## ٩

# هەڵبەستنێكى تريش !!

نوسـەر، بـەردەوام داسـتانو سەرگوزشـتە هەڵدەبەسـتێ. هـەتا خەياڵـە نەرگسيەكەى، لە كوردستانيەوە، بـۆ شۆڕشـگێڕێتى، لـە شۆڕشگێڕێتيشـەوە بـۆ ئينتەرناسـيۆناليزم تێربكـات. واتـا: خەياڵەكـەى نوسـەر، سـنور شـكێنەو رێسابەزێنە. بخوێننەوە بزانن لە لاپەڕە (٥٨)دا چى دەڵێ:

"لـە مـانگى ١٩٧٣/١٠ نوێنـەرێكى بـەرەى گـەلى رزگـارى ئـەريتيرى، كـە ئەوكات (عثمان سالح سبى) رابەرايەتى دەكرد، هاتە كەركوك و لە ماڵى بەندە كۆبونەوەى لەگەڵ نوێنەرەكە كراو پاشان لەو توانـا كەمـەى ئـەو كـاتى كۆمەڵـە يارمەتيان درا."

ئەم هاوڕێيەى خاڵە شيهاب، لە پەناى ئەو شەهيدە گەورەيەدا، توند دەسـتى گرتـووە بـە چـەترى ئارامگاكەيـەوە هـەتا ئەوپـەڕەى خۆهەڵكێشـان، خـۆى هەڵبشێكێ.

ئاخر، نوێنـەرى ئـەريتيريا لەعێراقـدا، سـاڵى (١٩٧٣) چ پێويسـتى كـردووە خاڵە شيهابى خۆشاردوو، ببينێ؟ گەر بۆ مۆركردنى ستراتيژى خـەباتى نـاوكۆيى گەلان بوبێ، راستە. گەر بۆ هێنانى لەشكرى ئەريتيريا بووە بـە هانـاى شۆڕشـى كورستانەوە، هەق بووە. گەر بۆ گەياندنى چەكو تەقەمـەنى بـووە بـۆ كۆمەڵـە،

یان پرۆتۆکۆڵی دووقۆڵی بووه، قبوڵمانه. که هیچی ئەوانە نەبوبیّ. خاڵه شیهاب لەکاتی خۆشاردنەوەدا، ئەویش لە شاری کەرکوکداو لەناو ماڵێکدا، بۆچی نوێنەری ئەریتیریا ببینیّ؟

خاڵه شیهاب، لە خەباتیّ نهێنیدا، کارامه بووه. گومانم نییه که هەڵەی وای نەکردووه، دڵنیام مانای راستەقینەی خۆشاردنەوەی بۆ کەسایەتی خۆی باش زانیووه. بەتایبەتی، ئەو (وەکو نوسەر دەڵێ) لەماڵی نوسەر خۆیدا بووه. مەعقول نییه لەهەمان ماڵدا، گەر کەسێکی واش گریمان ببینیّ، چاوپێکەوتنەکە بکات. وەکو نوسەر دەیگێرێتەوە، خاڵه شیهاب کە زۆربەی هەفتە جلی کرێکاری لەبەرکردبیّو چوبێتە ناو کرێکارانەوە، ئیتر چ پێویستی کردووه لەشوێنی ئیختیفای خۆیدا، نوێنەری ئەریتیریا ببینیّ؟ خۆ لە بازاڕو چایخانەدا دەیبینی. یان دەیبردە (مەیدانی حەسیرەکە) هەرچی چۆنێك ئەم داستانە ئینتەرناسیۆنالیستییە تاوتویّ بکریّ، دەزانریّ، ئەمیش بەرهەمی خەیاڵه نەرگسیەکەی کاکمانه.

## ١٠

## هەمدیس هەڵبەستراو !!!

شەڕی داسەپێنراوی بەعس بەسەر کوردستان، هەڵدەگیرسێ. سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیارێکی باش دەدات کە ئەوەی لەخۆی دەترسێ، ئەوەی دەبڕێ بۆ سەربازی، با بچێتە ریزی شۆڕش. بەمەش، کۆمەڵە، سەرەڕای ئەو ناکۆکییە ئایدیۆلۆژی‌و سیاسییە قوڵەی لەگەڵ سەرکردایەتی بارزانی‌و پارتیدا هەیبوو، بەڵام خۆی لە شۆڕشەکە دانابڕێ. هەڵوێستێکی زۆر بەجێ بووە. پێموایە ئەم هەڵوێستانە چ لە شۆڕشی ئەیلول‌و شۆڕشی نوێدا، کۆمەڵە لە رەوتە چەپەکانی دیکە، کە لەناو شەوارەی تیۆریدا دەسوڕانەوە، جیادەکاتەوە. بەهەموو حسابێك، دەبوایە نوسەر بچێتە دەرەوە. بەڵام نەچووە، لە لاپەڕە (٦٠)دا نەچونەکەشی بەوە پاساودەداتەوە گوایە:

" کە جگە لە شەهید شاهاب و شەهید جەعفەر، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی و زۆربەی ئەندامانی تری رێکخستنەکانی کۆمەڵە، کە دەکرێ و دەتوانن بەشداری شەڕی چەکداری بکەن، بڕۆنە دەرەوە.."

شەهید جەعفەر، راستە نەچووە دەرەوە. بەڵام شەهید شەهاب خۆی بێنەگیراو سەرەڕای ئەوەی، لە هەموو کەسێك، بەڵکو لەسەروی هاوڕێیانی کۆمەڵە، مەترسی لە پاراستن هەبوو. لە کوردستاندا ناسراوترین سەرکردەی

کۆمەڵە بوو، پارتی‌و پاراستنیش دەیانزانی شەهابی شێخ نوری، مارکسیستیەو دژی پارتییەو ڕێکخراویشی هەیە، ئینجا کە شۆڕش هەڵگیرسایەوە، جوامێری خالە شیهاب وای لێکرد گوێنەداتە ئەو مەترسیانە، تەنانەت بڕیاری سەرکردایەتی کۆمەڵەش وا بووە، لەترسی پاراستن خالە شیهاب نەچێتەدەرەوە، بەڵام پێی پەشم بوو نەچێتە دەرەوە. بۆیە بەبێ گوێدانە مەترسییە ڕاستەقینەکان کە لەسەری هەبون، ئەویش وەکو سەدان هەزار کوردی ئازادیخواز، خۆی گەیاندە شۆڕش‌و سەنگەری بەرەنگاری. پارتی‌و پاراستنیش دەیانناسی، دەشیانزانی کێیەو چ مێژوویەکی پڕ لە ململانێی لەگەڵ پارتی‌و بنەماڵەی بارزانی‌و بۆرژوای کوردستاندا، هەبووەو هەیە، ئینجا، کارێکی زۆر باشیان کرد کە بۆئەوەی کەلێن نەکەوێتە ریزی تێکۆشەران‌و روحیەتی خەڵکەکە، نەك خالە شیهاب‌و لیستێك لە هاوڕێیانی ناسراوی کۆمەڵەیان نەگرت، بەڵکو کەمترین فشاریشیان لەسەریان هەبووە. بەڵگەشم کە پاراستن دەیانزانی شەهید شەهاب کێیەو چەندیش دژیانە. تەنها ئەم بەڵگەیە لای من هەیە، بۆ مێژوو باسی دەکەم.



لەراستەوە: شەهید ئارام، کۆچکردو دارۆی شێخ نوری، مەلا بەختیار

یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان، (١-٣/٣/١٩٧٤) لە شاری هەولێر کۆنگرەیان بەست. ئێمە وەفدی خانەقین (٧) کەس بوین لە کۆنگرەکەدا (محەمەد سایەخان، عیماد ئەحمەد، عەلی شامار، سەلاح حەسەنی، شەهید سەلام عەبدولرەزاق‌و مامۆستا حەمیدی مەندەلاوی‌و مەلا بەختیار) لە کۆنگرەکەدا بوین. لەم (٧) کەسە (٥) کەسمان ئەندامی کۆمەڵە بوین‌و بەهەڵبژاردنی ئازاد، بەسەرپەرشتی بابیز تاڵەبانی، ئەندامی ئەوکاتەی سکرتاریەتی لاوان، متمانەی چونە کۆنگرەمان وەرگرت (تەنها محەمەد سایەخان‌و مامۆستا حەمید) کۆمەڵە نەبون. کە چوینە ناو کۆنگرە، وەفدی خانەقین، بە جموجۆڵی من، کە لەناو

وەفدەکەدا تەنها مـن نیمچـە سـۆرانیم ئەوسـا دەزانـی، کەوتبوینـە چـالاکی بـۆ کۆکردنەوەی دەنگ بۆ دارۆی شێخ نوری (برای خالـە شـیهاب)و شاسـوار جـەلال (شـەهید ئـارام) دووەم ڕۆژی کـۆنگرە لـەناو هۆڵەکـەدا زانیمـان، پاراسـتن‌و عەبـدولوەهاب ئەتروشـی، بـە دارۆی شـێخ نوریـیـان وتبـوو، نابـێ خـۆت بـۆ سـکرتاریەتی لاوان هەڵبژێریتـەوە. بۆشـان رونکرایـەوە کـە لەبەرئەوەیـە لـە بیروبـاوەڕو کەسـایەتی کاکـە دارۆ، دڵنیـا نـین. وەفـدی خانـەقین‌و هەنـدێك لـە ئەندامانی کۆنگرە، کەوتینـە چـالاکی‌و کاردانـەوە دژی بڕیارەکـە. هەتاڕادەیـەك وەفـدی خانـەقین‌و کـەرکوك‌و بەغـدادو تاك‌وتـەرای تـریش، لـەناو هۆڵەکـەدا کاریگەریان هەبوو. هەواڵ گەیشتبووە ساڵح یوسفی کە سەرپەرشتی کۆنگرەکەی دەکـردو بـەهۆی کۆنگرەکەشـەوە، دەیویسـت دەربـاز ببـێ بـۆ بارەگاکـانی سەرکردایەتی لە حاجی ئۆمەران (هەرواشی کرد). سـاڵح یوسـفی، بـەیانی ڕۆژی (٣/٣) لـە هوتێـل هەورامانـدا، وەفـدی خانـەقینی بـانگ کـردو بەوپـەڕی ڕێـزو ئـەدەب‌و بەنەوازشـی باوکانـەوە، ئامۆژگـاری کـردین‌و سـەرکەوتنی بێکێشـەو بێشـەی کۆنگرەکـەی لـەو دۆخـەدا، بـۆ رونکردینـەوە. وەفدەکـە، رونکردنـەوەی هەڵوێستەکەیان بە من سپاردبوو.. منیش:

جلێکی کوردیم لەبەربوو. کڵاوێکی چەرم. هەموو گیـانم حـەماس‌و پەرۆشـی بوو. سۆرانیەکەشم تۆزی دەکـرد. بەرپرسـیاری لقەکـەمان، پیـاوێکی بـەڕێز بـوو (محەمـەد سـایەخان) ئێسـتاش سـۆرانی نازانـێ‌و بـەدڵی خـۆی خانەقینیانـە قسەدەکات. لە جموجۆڵـەکانی ئێمـەش دەترسـاو هـەتا گەیشـتوینەتە لای سـاڵح یوسفی، پەیتاپەیتا پێی دەوتم:

- کور خودا نەوتمە پیت بورەوەی تویشبین (کوڕی خوا پێم نەوتی بیـبڕەوە تـوش دەبین).

- دە بچو بخۆ لە وەری (دە بڕۆ بخۆ لەبەری).

- چوین خەلاسمان کەیت.. بکە. وەخودا من یەك قسە نێزانم وە سۆرانی قسە بکەم (چۆن رزگارمان دەکەیت بیکە. بەخوا یەك قسەی سۆرانی نازانم بکەم).
- بەس ئەگەر سجنمان کردن، منیش تێمە سجن لەگەڵتان (بەڵام گەر زیندانیان کردین، منیش دێمە زیندان لەگەڵتان).

محەمەد سایەخان زۆر دەترسا. بەڵام ئێمەشی زۆر خۆشدەویست، بەتایبەتی من. دوای ئەوەی سالّح یوسفی قسەکانی تەواوکرد، من هەموو وزەی خۆم کۆکردەوەو لە مێشکی خۆمدا، سۆرانیەکەم رێکخستو گوتم:

- مامۆستا.. کۆنگرەی لاوانی دیموکراتی نییە. ئێمەش حورین دەنگ بە کێ بدەین. بۆچی کاك دارۆ خۆی تەرشیح نەکات؟

کورتیەکەی.. سالّح یوسفی تێیگەیاندین ناکرێ. ئێمەش لۆش لۆش هاتینە دەرەوە.

لەم رووداوە، مەبەستم ئەوە بوو بیسەلمێنم کە پاراستنی پارتی، لەبەر خاڵە شیهاب ناهێڵن براکەی خۆی بۆ سکرتاریەتی لاوان کاندید بکات، ئیتر چۆن زانیارییان لەسەر خۆی نەبووە؟!

کەچی کاکی نوسەر، ئەو راستیانە سەبارەت بە خاڵە شیهاب دەکاتە قوربانی نەرگسیەتی خۆیو باسی خۆی لەو رۆژگارەدا، لە لاپەڕە (٦٠)دا ئاوا دێنێتەئارا:

" کە فەرەیدون و علی بچکۆل لەپێشەوە رۆیشتن وەڵامیان ناردەوە، کە بەندە نەچێتە دەرەوە، سەبارەت بەو بڕیارەی کە پاراستن دابووی دژی من و لەسەر راپۆرتی حەمە رەحیم (هەڤاڵ جوجەڵە، پاشان خاڵە حاجی) کە تاوانی ئەوەی دابوە پاڵ من. کە گوایە من لە حزبە داتاشراوەکەی ستار تایەر شەریف دا کار دەکەم."

ئەمیش درۆیەکی تری هەڵبەستراوە. چونکە، نهێنی پاراستن، وا بەئاسانی نەدەهاتەدەرەوە. نەخوازەڵڵا هی کەسێکی شارەزای وەکو هەڤاڵ حەمە رەحیمیش. شەهید شیهاب دەچێتە دەرەوە، بەڵام نوسەر، راپۆرتی لێدراوە ناچێتە دەرەوە. گەر خۆی بڕیاری نەچونەدەرەوەی نەدابێ، هەر چونەدەرەوەی دەیسەلماند کە ئەو تومەتە راست نییە. لێرەدا تەنها مەبەستمان هۆنینەوەی قسە ناڕاستو داستانە هەڵبەستراوەکانەو بەس!

## ١١

## رقی سەردەمی کرانەوە

هەرەســی شۆڕشــی ئــەیلول، هێشــتا لــەرووی سیاســیو مێژووییــەوە، هەڵســەنگاندنی پێویستی لەسەرنەکراوە. ئەمە لەکاتێکدا، گەر لە حەفتاکان، لــە کوردستاندا بــواری هەڵســەنگاندنو لەسەرنوســین نــەبوبێ، ئــەوا لــەدەرەوە هــەلی ئازادانەنوســین، بێســنور بــووە. لــەدوای راپەڕینیشــەوە، ئــەم کارەســاتە، ئــاوڕی زانستیانەی لێنەدراوەتەوە، لەکاتێکدا کتێبخانەکانی کوردستان، ســەدان کتێبــی تۆزلێنیشتووی ئەوتۆی تیایە، تێچووی چاپکردنی کتێبەکانیان بەخەسار داوە.

نوسەران، مێــژوونوسو رونــاکبیرانی نەتەوەکــەمان، لەبەرامبــەر ئــەم چەشــنە روداوە چارەنوسسازانەدا، لەبەر گەلێ هۆی سیاسیو شەخســی، ئــازا نــین. ئەمــە لەکاتێکدا، لە جیابونەوەی شەستەکانەوە، لــە شــەڕی پــارتی شۆڕشــگێڕو پــارتی دیموکراتەوە، سەدان بەڵگە، هەزاران لاپــەڕە رۆژنامــە، کتێــب، گۆڤــار، تۆمــاری دەنــگ، دەیــان ســەرکردەو ســەدان کــادری زینــدوو مــاون. کــە مــن دڵنیــام هەلومــەرجێك دێتەپێشــەوە، ئــەوەی لــە بنــی بەرەیــە، دەهێنرێتــە ســەر بــەرە. هەنگینێ، راستیەکان وەکو رویانداوە، دەدرێتەوە دەستی نەوەی ئایندەو مێژوو.

نەبونی سەرچاوەی زانستی بــاوەڕپێکراو، لەســەر ئــەو روداوانــە، وای کــردووە زۆر کــەس، گاســنی دڵڕەقیــان، بــەئارەزوی خۆیــان داچــێننە ئــەو ئــەرزە بــەیارەو چۆنیان بوێ، ئاوای هەڵگێڕنو داگێــڕن. کــە ئەمــەش، کارەســاتێکی تــری ئەقڵــە

دواکـەوتوەکان، لەسـەر کارەسـاتەکانی ئـەو روداوانـە، لـەبری کەمکردنـەوەی ئازارەکان، هەڵیدەچنن.

یەکێکە لەو کەسانەی، بە رقەوە قەڵەمی داگرتووەو لەم سەردەمەی کرانەوەو لێبوردنو مـافی مرۆڤـدا، لەسـەردەمێکدا راسـتیەکان ئێسـتا لەهـەموو کاتێـك زیـاتر زانسـتیانە باسـدەکرێن. کەچـی ئـەم نوسـەرە، تاوێـك بـە رق، تاوێـك بـە هەڵبەستن، تاوێك بە هەڵدانەوەی قەتماغەی کۆن، تاوێك بە بوختان کـردن، تـانو تانوپۆی نەخۆشییە دەرونییەکانی بۆ تێرکردنی غەریزەی نەرگسیەتی، دەکێشێ.

هیچ نەخۆشیەکی دەرونی لەوە ترسناکتر نییە، کەسێك، ناخی پڕ بـێ لـە رق، کینە، بوغز، درۆ، بوختانو ترسنۆکی، ئەم هەموو نەخۆشییە دەرونیـەش بکاتـە هەوێنی نوسین. نوسینیش لەسەر مێژوویەك، زۆربـەی کارەکتـەرەکانی زینـدوون، کەچی ئەو حسابی مردویان بۆکات. ئەوەی لە ژیانو دەسەڵاتدا نەیتوانیوە رقیـان پێبڕێژێ، هەتا دەرونی نەخۆشی دابمرکێنێتەوە، بەم چەشنە نوسینە بیەوێ ئـاگری دەرونی خامۆش بکاتەوە.

ئـاخر.. بـە چ هـەقێکی سیاسـیەوە، لـە هەلومەرجێکـدا مـاڵی کـورد، یەکخراوەتەوە. هێشتا ئەرکی هاوبەش ماوە بەدیبهێنرێن، کەسێکی ئـاوا دێـت، زامـی نیـو سـەدە لەمەوبـەر، بەهـەمان خیتـابو بەهـەمان زاراوەو بەهـەمان ئایدیۆلۆژیەتی دوبەرەکی، دەکولێنێتـەوە. کەسـێك، بـرای دوو شـەهید بـێ، لـە شەستەکانەوە کوردایەتی بکات، گەر لەباری دەرونیەوە نەخۆش نەبێ، چۆن هەق بەخۆی دەدات.. باسـی (باسـکی جـەلالی)و (باسـکی مـەلایی) بـەم ئاراسـتەیە بکات؟ چۆن باسی رێبازو سیاسەتو کوشتوکوشتاری شەڕی نـاوخۆی ئەوکاتـە، بەو زمانە زبرەی بەرهەمهێنراوی شەڕە نالەبارەکانی ئەو سەردەمە دەکاتەوە؟

که دێته سەر باسکردنی کۆمەڵەش، لەو سەردەمەدا، بەتایبەتی لەکاتی هەرەسدا، ئاگای لە پەرێزی نامێنێ‌و بەئارەزووی خۆی، داسە کولەکەی خستۆتەکارو کوێرانە دروێنە دەکات.

من نامەوێ لەسەر ئەو مێژووە بنوسم، بۆئەوەی نەشڵێن لەبەر بەرژەوەندی پلەوپایەی ئێستای ناوێرێ لەوبارەوە هیچ بڵێ، ئەوەی لەسەر رۆژگاری هەرەس، لە کتێبی (یاخیبون لە مێژوو-١٩٩٩) گوتومە، بەباوەڕەوە گوتومە. دوپاتیشی دەکەمەوە: دەست لە بەرەنگاری هەڵگرتن، لەبەر پیلانی رێکەوتنامەی جەزائیر، کە ئاکام ئەو چارەنوسە رەشە دوچاری شۆڕشی (١٤) ساڵە کرا، هەڵەیەکی ستراتیژی بوو. چونکە پاساوی ئەو بڕیارە، لەو بارودۆخەدا، بەوە دەدرایەوە کە:

یەکەم: هەلومەرجی جیهانی، لەسایەی جەنگی سارددا، بۆ درێژەپێدانی شۆڕش لەبار نییە؛

دووەم: دەوڵەتانی ئیقلیمی، پیلانی هاوبەشیان دژی شۆڕش هەیە؛

سێهەم: بەعس‌و رژێمی شا، سنورەکان دەتەنن‌و پێکەوە دەچن بەگژ شۆڕشی کوردستاندا.. تاد.

ئەو پاساوانە، لەو بارودۆخەدا، بەشێکی زۆری خەڵك باوەڕی پێهێنا. بەڵام، هەر زوو دەرکەوت، پاساوەکان، راست نەبوون. باشترین بەڵگەش، یەکێتی دامەزرا، پارتی دیموکراتی کوردستان (قیادەی موەقەتە)ش دامەزرا. هەردوولاشیان دوای ساڵێك لە سەرهەڵدانەوە، دەستیان کرد بە شۆڕشی پارتیزانی. لەکاتێکیشدا دەستیانپێکرد کە:

١-دۆخی جەنگی ساردی جیهانی، نەك نەگۆڕا، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی جەمسەرەکانی، تۆکمەتر بوو. زیاتریش لێك نزیك کەوتەوە.

٢-بەعس و رژێمی شا، سنورەکانیان بەوشێوەیە نەتەنی، کە مەترسی لێدەکرا. بەڵکو رژێمی شا، لەسەر سنورەکان، چاوپۆشیشی لە جموجوڵی پێشمەرگەو هێزەکان دەکرد. بەتایبەتی بەرامبەر پارتی.

٣-دەوڵەتانی ئیقلیمیش، هەروەکو جاران مانەوە. بەڵکو سوریا، زیاتر لە جاران هاوکاری شۆڕشی کوردستانی کرد، چونکە ناکۆکیەکانی لەگەڵ بەعسدا، قوڵتر بون.

٤-زیاتریش لەو راستیانە، رژێمی عێراق، لە هەموو بارێکەوە، لە پەیوەندی نێونەتەوەییەوە، دیپلۆماسیەوە، عەرەبیەوە، ئیقلیمیەوە، چەك و تفاقی جەنگین و جەنگاوەریەوە، لۆجستیکیەوە، داهاتی نەوتەوە.. مەشق و بەرزکردنەوەی ئاستی شەڕو سوپاییەوە.. تاد. توانای زیادیکردبوو.

لەگەڵ ئەوەی پاساوەکانی بلاوەپێکردنی شۆڕشی ئەیلول، لەرووی جیهانی، ئیقلیمی، عێراقی و کوردستانیەوە، راست دەرنەچون، بەڵکو رژێمی عێراق بوو بە یەکێك لە بەهێزترین رژێمەکانی رۆژهەلاتیش، ئینجا شۆڕشی نوێش بەرپا بوو. کارەساتی زۆر زۆر زیاتریشی لە شۆڕشی ئەیلول بەسەردا هات. بەرگەی گرت و گەیاندیشییە راپەڕین.

لەم چوارچێوەیەدا، دەتوانین دیالۆگێکی هەمەلایەنە بکەین. بەلام لە چوارچێوەی دوبەرەکی شەستەکان، یان ئەدەبیاتی شەڕی ناوخۆی شۆڕشی نوێ، بێگومان نەخێر، ئەو کەسەی دڵی رەق و دەرونی پڕ لە رق نەبێ، ئەو لاپەڕانە، بەهەمان پەنجەی سەر پەلەپیتکەی شەڕی دوبەرەکی، هەڵنادادتەوە.

## ١٢

# هەرەس و هەڵوێستی کۆمەڵە

نوسەر، زۆر قسەی لەسەر ئەو هەلومەرجە کردووە، بەڵام راستیەکانی لەناو ئەو قسانەدا پێچاوەتەوە، نەکا ئەو رێبازەی شانازی پێوە دەکات، بەحسابی خۆی، ئۆباڵی هەڵەی بکەوێتە ئەستۆ. کە ئەمەش لە گێڕانەوەی ئەمانەتی مێژوویدا، جۆرێکە لە خیانەتی مێژوویی.

کۆمەڵە، پێش دوو مانگ، لە هەرەسەکە، بەیاننامەیەکی ناوخۆی دەرکردبوو، تیایدا دۆخی شۆڕش و هاوکێشەکانی هەڵسەنگاندبوو. پێشبینی هەرەسی دوورونزیك نەکردبوو. بەڵکو سەرەنجامی لێکدانەوەی هەلومەرجەکە، سەرکردایەتی کۆمەڵە گەیشتبونە ئەو باوەڕە کە سەرکردایەتی پارتی، خەریکی سات و سەودان لەگەڵ رژێمدا. لە بەیاننامەکەدا، دەڵێین: گەر سەرکردایەتی بۆرژوازی- خێڵەکی کوردستان، سات و سەودا لەگەڵ رژێمدا لەسەر ئۆتۆنۆمی راستەقینە بکات، کۆمەڵە بەرەنگاری دەکات و هاوڕێیانی کۆمەڵەش بۆ حاڵەتی وا ئامادەباش بن.

ناوەڕۆکی بەیانەکە، بۆ ئێمەومانانی هاوڕێیانی کۆمەڵە، مایەی دڵخۆشی بوو، کە لە شۆڕشداو لەناوچەی خانەقیندا بوین. هەر ئەوکاتە، کەوتینە قسەوباس لەناو خۆماندا، گەر سەرکردایەتی پارتی سات و سەودای لەسەر مافی گەلەکەمان و کەرکوك کرد، ئاخۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە چی دەکات:

- بەرەنگاریی دەکات و لە شاخدا دەمێنێتەوە؟

- بەیاننامە دەردەکات؟
- مام جەلال دێتەوە یان نایەتەوە؟

ئیتر، بە خەیاڵی رۆمانسی شۆڕشگێڕانەوە، بەدەم لێنانی نسکێنەو شەونشینیو هەڵقوڕاندنی چاوە، لەبەردەم چراو کوشتنی ئەسپێو بارەگای سەیروسەمەرەی پێشمەرگایەتیەوە، خەریکی دەمەتەقێ دەبوین. ئەوکاتە مامۆستا جەعفەر (فازل کەریم ئەحمەد) لە رووی زانیاری تیۆریو لێکدانەوە، لە ئێمەمانان زیرەکتر بوو. زۆربەی لێکدانەوەکانیش، ئەو دایدەڕشت. تەنانەت نامەیەکیشمان بەناوی کۆمیتەی خانەقینەوە لە نوسینو دەستخەتی مامۆستا جەعفەر، بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە نوسیو جۆرەها پرسیاری گرنگی لەسەر بەیاننامەکەو شۆڕشو سیاسەتی کۆمەڵە نوسی. ئەوەی بیرم مابن، لەم جۆرە پرسیارانە بون:

- ئایە.. سەرکردایەتی کۆمەڵە، چۆن بەرپەرچی ساتو سەودای سەرکردایەتی پارتی دەداتەوە؟
- ئایە.. هیچ پەیوەندیەکمان بە دەرەوە هەیە؟
- ئایە.. هیچ تەئمین کراوە؟

لەو جۆرە پرسیارانەو لەگەڵ روانگەی هاوڕێیانی خانەقین، بۆمان ناردن. چاوەڕێ بوین لە وەڵامدا، سەردانمان بکرێو بەوردی لە دۆخەکە ئاگادار بکرێینەوە. وەڵام هەر نەهات. دۆخەکە لەسەر چارەنوسی شۆڕشیش، گەیشتە مقۆمقۆی سەیروسەمەرە.



پێنجوێن- ڕۆژی ڕێکەوتنامەی جەزائیر (٦/ ئازاری ١٩٧٥) لەکاتی سەردانی سەرکردایەتی کۆمەڵە. ئەم گەنجانە ئەڵقەی ڕۆشنبیری کۆمەڵە بون لە ئۆردوگای قوتابیانی شەهید لەیلا قاسم.

لەچەپەوە: ١- عەبدولخالق. ٣- ئەحمەد موسا
٤- مەلا بەختیار. ٥- ئەیوب ئەرکەوازی. ٦- موسا
٧-حەبیب محەمەد سەعید

ئەوکاتەی ڕێکەوتنامەی جەزائیر مۆرکرا، من لە پێنجوێن بوم، بۆ سەردانی شەهید شەهاب‌و حەمەی میرزا سەعید (ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە) چوبوم. شەهید شەهاب لەوێ نەبوو. حەمەی میرزا سەعیدم دی.

پێنجوێن.. ناوچەیەکی گرنگی شۆڕشی ئەیلول بوو. هەزاران کەسی تیا بوو. داوودەزگای شۆڕش کاری خۆیان دەکرد. کارو کاسبیەکی باشی تیادا دەکرا. ئۆردوگای شەهید لەیلای قوتابیانیش، لە بلکیان بوو. ئۆردوگاکە، لە چەند خەیمەو کەپرێك پێکهاتبوو. قوتابیانی سەرانسەری کوردستانی تیا پەنادرابون. هەم لە خوێندنگا دەیانخوێندو هەم کاری بەکۆمەڵیان دەکرد. ئیدارەیان بۆ خۆیان دانابوو. شەوانیش بەزۆری خەریکی گفتوگۆی سیاسی بون. ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بوم، ئەڵقەیەك لە قوتابیان لەدەورم کۆبونەوەو کاریگەریم لەسەر هەندێکیان دانا. زۆریەیان خانەقینی بون. یەکێك لەوانە (جەمال یوسف)ی بادینی بوو، کە بوو بە ئەندامێکی سەرکردایەتیش لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا. محەمەد کەریمی نوێنەری یەکێتی لە نەمسا، شەعبان جاف، حەبیب، ئەحمەد موسا..تاد.

بە ڕێکەوتنامەی جەزائیر، پێنجوێن شڵەژا. من بۆ یەکەمین جارم بوو، وەکو خانەقینیەك، وشەی (ئاشبەتاڵ) ببیستم: لەشاردا بوو بە قاو کە ئاشبەتاڵە. نەمدەزانی ئاشبەتاڵ یانی چی. ڕۆژی (٧ و ٨ و ٩)ی مانگی ئازاری پێش هەرەس، پێنجوێن، ئەو شارە پڕ لە حەماس‌و پەرۆشەی کوردایەتی، کە چایخانەکانی گۆرانی حەمە سالح دیلان‌و حەمەی ماملێ‌و حەسەن زیرەك‌و تیپی مۆسیقای سلێمانی لێنەدەبڕا. شارۆچکەکە، خەڵکەکە، میوانەکانی‌و پێشمەرگە، هەتا دەهات خامۆش دەبون‌و دەم‌وچاوی هەموو کەسێك، سەدان پرسیاری لەسەر نەخشابوو. خەڵك مات مات بەناویەکدا دەهاتن‌و دەڕۆشتن‌و

روخسارییان زەردهەڵگەڕابوو. بەردەم بارەگاکانی پارتی ئاپۆرەی خەڵك بۆ زانینی دەنگو باس، بەرنەدەکەوت. خەڵکەکە هێندەی دیکە لەوە تۆقیبون کە ئێران (مەرز- سنور)ی بۆ چەند رۆژێك داخست. ئەم داخستنەی سنور، لەو ئانو کاتانەدا، وەکو کردنەوەی دەرگای دۆزەخ وابوو بۆ خەڵکەکە. وا دەزانرا، ئیتر سوپای عێراق ناوچەکە داگیردەکاتو خەڵکەکەش رادەپێچێ. ئێرانیش نایەڵێت تووخنی مەرز بکەوین. دۆخێکی تا بڵێیت ناخۆش بوو. کە دۆشکەو دژەئاسمانیەکانی دەوروبەری پێنجوێن لابران، خەڵکەکە ئیتر زانییان ئومێدی بەرەنگاری کز بووە. بۆیە کەوتنە بۆڵەبۆڵ، نەخێر نارەزایی دەربرینو تەشەر لێدان. بەڵکو گەیشتە هەڵچونو قسەی رەقو ناشیرینیش.

لەو دۆخە هەستیارو ترسناکەدا، حەمەی میرزا سەعید، پیاوێکی بەتەمەنی لە شیوعییە کۆنەکان بوو. وەکو دەیگێڕایەوە، فەهدی سکرتێری حیزبی شیوعیشی دیووە. ئەم هاوڕێیە، دەتگوت بۆ ئەوە دروستبووە دانیشێو خەڵك کۆبکاتەوە باسی سیاسەتیان بۆ بکات، بەمەرجێ خواردنی خۆشی هەبێو جگەرەبکێشێو بەردەوام چاش بخواتەوە. ئاستی تیۆریشی لەچاو تەمەنی، بەرز نەبوو. بەڵام پیاوێکی خۆش مەشرەبو پەرۆشو ماندوو لە سیاسەت. یەکەم جار، لە هەولێر، لەکاتی کۆنگرەکەی لاواندا، لەماڵی ئەم کاکە حەمەی میرزا سەعیدە، خاڵە شیهابم بینی. کاك سالار عەزیز لەناو کۆنگرە هات بەدواماو پێکەوە چوین بۆ ماڵەکەی. نیوەڕۆ پێکەوە نانمان خوارد. پاشان لەژورێکدا، وێنەی ماوتسیتۆنگو چەندین نامیلکەی ماو و لینینی دانابوو. پیاوێکی هێمن، بەویقار، هەموو گیانی دڵسۆزیو جوامێریو رەوشتی بەرزی مارکسیستی لێدەباری. وەك رابەرێکی خەم هەڵگرتوی کرێکارانو گەلەکەی، پرسیاری دەکردو بیروبۆچونی خۆی دەردەبڕی. لەو دانیشتنەدا، کە (٥) کاتژمێر

کەمتری نەخایاندو لە بەشی زۆریدا، حەمەی میرزا سەعیدیش دادەنیشت، من، کەوتمە ژێر کاریگەری خاڵە شیهاب. لە قسەکانیا، بچوکترین رق و ناکۆکی لەگەڵ کەس و توندڕەویم لێ هەست پێنەکرد. هەموو بۆچونەکانی وەکو مارکسیستێکی ماوی، دەردەبڕی. دڵنیابوو شەڕ دەبێتەوە. سیاسەتی کۆمەڵەی لەمەڕ هەڵگیرسانەوەی شەڕ، رونکردەوە: کە وەکو هێزێکی نهێنی، بۆ دانەبڕان لە خەباتی رزگاری گەلەکەمان، دەچینە ریزی بەرەنگاری، ئەگینا دڵنیاین سەرکردایەتی بۆرژوای کوردستان، سەرناکەوێ.

ئەو بۆچونانەی بەجوانی و بەباوەڕەوە دەربڕی. منیش دڵم خۆش بوو. کە گەڕامەوە، زۆر بەڕێزەوە باسی دانیشتنەکەم بۆ هاوڕێیانی کۆمەڵە کردو زۆریش وەسفی کەسایەتی خاڵە شیهابم بۆ کردن. ئەوانیش دڵیان خۆشبوو.

هەموو ئەم مێژووە، بەشێکی گرنگی مێژووی گەلەکەمان و کۆمەڵەو یەکێتییە. هەریەکێکیشمان، کەموزۆر، هەرکەسێك بەپێی سەنگی خۆی و خزمەتە راستەقینەکانی بەکردەوە (نەك بە لافلێدان) پشکێکی ئەو مێژووەی بەردەکەوێ. بەڵام، ئەو کەسانەی وردتر ئاگایان لەو مێژووە هەیەو ئێستا بۆیان هەڵدەکەوێ، لایەنی گەش و خامۆشی رێڕەوی ئەو مێژووە، چۆن بووەو چی بووە، باسبکات، هەق نییە، هیچ کەسێك، چەند لەو مێژووەدا پلەوپایەی بوبێ، بەئارەزوو، دەستکاری ئەو مێژووە بکات.

بەش بەحاڵی خۆم، گەورەترین خیانەت، خیانەتکردنە بە مێژوو. ئەوەی خیانەت لە مێژوو بکات، خیانەت لە نیشتمان و نەتەوەو هاوڕێکانی، لا ئاسایی دەبێت. کەسێکیش، لەناخی خۆیدا، خیانەتەکانی دیکەی لا خیانەت نەبێ، خیانەت لە مێژوو ناکات. خیانەتیش وەکو شەرەف وایە، کە رژا دەڕژێ.

لەم بەناو کتێبەدا، نوسەر، نەك جارێ، بەڵکو سەدان جار خیانەتی لە مێژووی کۆمەڵەو شۆڕشدا کردووە، نەك ئەمانەتپارێز نەبووە، بەڵکو بەمەبەست، بە مەرام، بە نەخشە، بۆ پاراوکردنی دەرونە نەرگسیەکەی، روداوەکانی مێژووی هەڵگێڕاوەتەوەو راستیەکانیشی داگێڕاوە.

## ١٣

## بەرەنگارینەکردن و پاساوی نەزۆلە

هەروەکو باسمان کرد، پێشتر سەرکردایەتی کۆمەڵـە، سـوکە پێشبینیەکی بـۆ تێکچونی دۆخی شۆڕش‌و ئەگەری سات‌و سەودای، لـە بلاوکراوەیـەکی نـاوخۆدا، کردبوو. بەڵێنیشی دابوو کە بەرهەڵستی بکات. بەڵام نەك سات‌و سەودا، بەڵکو شۆڕشەکە هەرەسیشی پێهێنرا، سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەرەنگاری نەکرد، وەکـو (عائیدون)، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ شارەکان.

کە دەڵێم: گەڕانەوە، بڕیارێکی وا ئاسان نەبووە، هەروەکو نوسـەر لـە لاپـەڕە (٦٦)دا دەیەوێ بەسانایی، بەم رستانەی خوارەوە تێیپەڕێنێ:

" لـەو بارودۆخـەدا رووداوەکـان هێنـدە بەپەلـەو خێـرا بـوون، کـە بەرلـەوەی هاوڕێیانی کۆمەڵە بکەونەخۆ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی مێـژوویی و شۆڕشـگێڕی سەرشانیان، نەك هەر نەیانتوانی دەیان کەسیش قایل بکـەن بـە مانـەوە و چـەك دانان، بەڵکو خۆشیان کەوتنە بەر شەپۆلی لافاوی تەسلیمبوونەوە."

بیروبۆچـونێك لەسـەر بنـەمای بابـەتی رۆنـەنرابێ، بزرکـاوی پێوەدیـارە. ئـەو پەرەگرافەی ئاماژەمان پێکرد، خۆی لەخۆیدا، کتێبێك وەڵامدانەوە هەڵدەگرێ.

پێشتر ئاماژەمان بە هەڵوێستی سەرکردایەتی کۆمەڵە کرد، کـە ئەگـەر بێتـو سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول، سات‌و سەودای کرد، بڕیـاری چییان داوە. ئێسـتا

نوسـەر، وەکـو کۆمەڵـە نـە بـای دیبـێو نـە بـاران، دەیـەوێ بـە سـیناریۆی تۆڵەسەندنەوە، هەڵە زە قەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵەش تێپەڕێنێ. چۆن:

جارێ ئەوکاتە پێگەیەکی ئەوتۆم لە سـەرکردایەتی کۆمەڵـەدا نـەبووە، هـەتا هەرچیەك دەنوسمو باسی هەر بەرەنگاریـەك بکـەم، پشـکێکی زۆرم بەربکـەوێ. ئەوکاتە، بەرپرسیاری نهێنی (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی – ئەندێشەی مـاو) لـە خانـەقین بـوم. نـەك لەبەرئـەوەی زیـرەکترین هـاوڕێی کۆمەڵـە بـوم. نـەخێر. مامۆستا جەعفەر، لـە مـن زیـرەکتر بـوو. مامۆسـتا سـەلاح حەسـەن، لـە مـن بەتەمەنترو بەئەزمونتر بوو. عەلی شامار لە سیاسەت لە من کۆنترو قـاڵتر بـوو. بەڵام لەبەرئەوەی هەڵسوڕاو.. و کەمێك بزێو بـوم، کاریگەریشـم لەسـەر لاوانـی خانەقین هەبوو، خوێندکارو لە هاویناندا کرێکاریش بوم. لە ساڵی (١٩٧٣)وە لە قەزای خانەقین بەرپرسی هاوڕێیانو ئەڵقە رۆشنبیریەکانی کۆمەڵە بوم.

کاتێـك.. هەرەسـیش رویـدا، مـن لـە پێنجـوێن (١٩٧٥/٣/٩) بـۆ گونـدی (مەحمود قەجەر) گەڕابومەوە، کە رێك دەکەوێتە سەر سنوری خانـەقین (قەسـری شیرین – سەرپول زەهاو) دێیەکی جوانو زیاتر لە ٨٥ ماڵی تێـدابوو جوتیـارانو کاسـبکار بـوون. هەمیشـە لانکـی شـۆڕشو پـەناگای پێشـمەرگە بـون، گەرچـی بەردەوام دانیشتوانی، ناخیان لە داخـان، بـۆکرۆزی زوڵمـی چـەند بەرپرسـیارێکی عەسـکەری شۆڕشـیان لێـدەهات. کـە لای سـەرکردایەتی کۆمەڵـە گەڕابومـەوە، پەیامی بەرەنگاریو خۆئامـادەکردنم پێبـوو. بـۆ جێبەجێکردنی ئـەو بڕیـارەش، کەوتبوینە جموجوڵیش.

تەمەنم (٢٣) ساڵ بوو. ئەرکەکە، سەبارەت بە مـنو هاوڕێیـانی تـریش، زۆر قورس بوو. لە قسەکردندا، بۆ ئەو بارودۆخە دانەدەماین. بەڵام بۆ ئامـادەکردنو سەرپەرشتیکردنی پێشمەرگە، ئەزمونمان نەبوو. پەرۆشیو گیـانێکی بـەرەنگاری ئەوتۆمان هەبوو، ملمان لە خەنجەر دەسوو. هەر ئەوکاتە، پەیوەندیان کرد بە:

١-شێخ محەمـەدی شـاکەلی (ئـامیر بـەتالیۆن)، مامۆسـتا جەعفـەر راسپێردرا پەیوندی پێـوەکردو جوامێرانـە، خـۆیو زیـاتر لـە (٨٠) پێشـمەرگە ئامـادە بوون.

٢-شـەهید مـلازم جـوامێر (سـەرلقی ئەسـناد) و شـێروان شـێروەندی (رابـەری سیاسی بەتالیۆن)، ئامادە بونو من پەیوندیم پێوەکردن.

٣-عەبدولرەحمان زەلکە.. لە دێی زەلکە، من چوم بۆ لایو بە گیان ئامـادەبوو. چەکیشی هەبوو، خزمانیشی دەهێنا.

٤-ئەحمەد کەلاری؛ لە ئۆردوگای ئەنزڵ بوو، بەهەموو شێوەیەك ئامادەبوو.

٥-مامۆستا سەلاح حەسەنیو نەسرەدین کەلاری، دیسان ئامادەبوون.

٦-لەناو دێی مەحمود قەجەریش، خالۆ سەمین دەوڵەت، کە پیـاوێکی سـەنگینو بەڕێز بوو، خۆیو کەمالو ئازادی کوڕی ئامادەی بەرەنگاری بوون.

دەیان کەسی تـریش، هـەر ئەوکاتـە قسـەمان لەگـەڵ دەکـردن، ئامـادەبوون. بەڵکو بەرەنگاریان رابگەیاندایە، سەدان کەس دەهاتنە ریزمانەوە.

لەوکاتانەدا، شەهید سیروان تاڵەبانی، لە مەحمود قەجەر بوو. فەرمانبەر بـوو لە فەرمانگەیەك لەتەنیشت بارەگای لاوانـی ئێمـە. کەسێکی هـێمن، راسـتگۆ، پاكو بە هەڵسوکەوتیا شۆڕشگێڕیو رەوشتی بەرزی چەپی لێدەباری. رۆژێکیـان پـێش چـەند مانگێـك دوای دوو جـار پێکەوەقسـەکردن، یەکسـەر خـۆی وتـی: بەقسەکانتا دیارە کۆمەڵەی، منیش کۆمەڵەم. تەوقەم لەگـەڵ کـردو خۆشحاڵیم دەربڕی. بۆ ئەوکاتـە، سـیروان زۆرمـان بەکـەڵك دەهـات. (١٩٧٥/٣/١٨) بـوو، پێمگوت پێویستە بچـێتە پێنجـوێنو دوابڕیـاری سـەرکردایەتی کۆمەڵـەمان بـۆ بێنێ. بیرمە: نە پارەی سەفەرو نە قەمسەڵەی هـەبوو. پارەمـان بـۆ کـۆکردەوەو قەمسـەڵەکەی خـۆمم دایـەو رۆشـت. (١٩٧٥/٣/٢٣) گەڕایـەوە. بڕیـاری

بەرەنگارینەکردنو گەڕانەوەی بۆ شارەکان پێبوو. سەبارەت بە ئێمە، بڕیارەکە وەکو هەرەسێکی تری ناو هەرەسەکە وابوو. هەتا بڵێی سەخت بوو باوەڕ بکەین؛ کۆمەڵەیەك (٥) ساڵە پشتی شۆڕشگێڕێتی پێدەبەستین، هەل هاتۆتەپێشەوە، لەدەستی دەدات. توڕە بوین. مامۆستا جەعفەر هێمنی کردینەوە.



ئەشکەوتی نیمچە نهێنی پەداناني هاوڕێیانی خانەقین — مەحمود قەجەر
شۆڕشی ئەیلول ١٩٧٤-١٩٧٥

لەچەپەوە:

١-عەلی شامار. ٢- شەهید سەلام عەبدولرەزاق. ٣- مامۆستا جەعفەر. ٤- مەلا بەختیار

٥-مامۆستا سادق (مەندەلی). ٦- خەلیل سایە خان

کۆبونەوەمان کردو بڕیارماندا، بڕیارەکە جێبەجێ بکەین. هەرچی چەك‌و فیشەکمان پێبوو، شەوی دواتر لە دەرەوەی مەحمود قەجەر، شاردمانەوە. لێشمان نەدەزانی. رۆنی چێشتمان تێکردن، تومەزە بۆ چەك شاردنەوە زۆر خراپە. دوای چوار ساڵ، بەهێزێکەوە لە ناوچەی زەهاوی رۆژهەلاتی کوردستانەوە، چوین بیانهێنین، نیوەشەو شوێنەکەم یەکسەر دۆزیەوەو چەکەکانم دەرهێنان، هەموو ژەنگ فەوتاندبونی.

لەو باسکردنە، تەنها ویستم گیانی بەرەنگاری‌و ئامادەیی ئەوکاتەی پێشمەرگەو خەڵکەکە، بیربخەمەوە. کەچی، وەکو نوسەر گوتویەتی: (روداوەکان هێندە بەپەلەو خێرا بوون، هاوڕێیانی کۆمەڵە نەیانتوانیوە دەیان کەسیش قایل کەن بە مانەوەو چەکدانەنان). لەدرێژەشدا بەئاسانی‌و ئاسایی هەڵەکە بەم نیو رستەیە بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە دادەپۆشێ: (بەڵکو خۆشیان کەوتنە بەر شەپۆلی لافاوی تەسیلمبونەوە).

ئەو دێڕانە، نوقمن لە لێکدانەوەی پاساوی بێبەڵگەی سیاسی. رێك پێچەوانەکەی راست بووە، پێش ئەوەی بێینە سەر راستی پێچەوانەکەشی، باشتر وایە کەمێك دۆخە سیاسی- دژەکردارەکەی خەڵك شەنوکەوێك بکەین؛ لەمیشەوە ئەوکاتە باسی سیاسەتی کۆمەڵەو دوای هاتنەوە شاریش بکەین، هەتا بیسەلمێنین ئەو قسانە پاساوهێنانەوەیە بۆ هەڵەیەکی سیاسی ستراتیژی سەرکردایەتی کۆمەڵە. کەسێکیش، دۆخی سیاسی- عەسکەری وەکو رۆژگاری هەرەس هەڵبسەنگێنێ، ناکرێ خۆی لە گەوهەری باسەکە، کە لێکدانەوەی سیاسەتی رۆژگارەکەیە، چ سیاسەتی گشتی‌و چ سیاسەتی تایبەتی رێکخراوەکەی، بدزێتەوە. هەروەکو نوسەر وەکو دزێکی لە دزیدا گیراو، خۆی لە گەوهەری سیاسەتی رۆژگارەکە دزیوەتەوە.

با له پرسیارێکەوە، لەسەر دۆخە سیاسیەکە، پەنجەرەی ئەم مشتومالە بەخەینە سەرپشت. ئەویش ئەوەیە، ئایە رژێمی بەعس، دوای سالێك لە شۆڕش، لە لاوازی، یان بەهێزی، سەری بۆ رژێمی شا شۆڕکردو رێکەوتنامەی جەزائیری مۆرکرد؟

لەوەلامدا، سەدام حسێن، لە یەکەمین کۆبونەوەی لەگەڵ بەناو (جەبهەی نیشتمانی عێراق) لەسەر رێکەوتنامەی جەزائیر قسە دەکات و لە نامیلکەی (خندق أم خندقان) دا، بلاوکراوەتەوەو دەڵێ: لە دەبۆکانماندا تەنها (٦) موشەکی فڕۆکەمان مابون. شورەویش بۆی دابین نەدەکردین. (٦٠ هەزار) کوژراو و بریندارمان دا. بۆیە درێژەپێدانی شەڕ ئاسان نەبوو. ئەمە قسەی ترسناکترین سەرکردەی بەعس بوو.

گەر لە قسەی دوژمنانیش گەڕێین، لێکدانەوەیەکی گشتی بۆ بارودۆخەکە بکەین. بەئاسانی دەتوانین دڵنیابین، کە سەرکردایەتی شۆڕش، بە دەستکاریکردنی شێوازی شەڕەکان، تاکتیکی عەسکەری، ئالوگۆری بارەگاکان، کەمکردنەوەی باری قورسی شۆڕش. گۆڕینی فەرماندە بەتەمەنو ماندوەکانو بواردان بە فەرماندەی نوێو پێکەوەنانی هێزی هەڵمەتوەهەڵێ. پەیڕەوکردنی بنەماکانی شەڕی پارتیزانیو شەڕی بزواو (الحرب المتحركة) بایەخدان بە شارەکانو پەرەپێدانی نارەزایی جەماوەری لە شارەکان، هەروەها فراوانکردنی سیاسەتی دیپلۆماسیو فشاری دەرەکی.. تاد. دەتوانرا شۆڕشەکە کۆتایی پێنەیەت. بەتایبەتی ئەوکاتە، شورەوی بۆیە چەکی یەدەکی نەدابووە رژێم، هەتا شۆڕشی کوردستان لەناونەچێ. دوای رێکەوتنامەی جەزائیریش، پریماکۆف لە قاهیرە، مام جەلالی دیوەو ئامادەیی شورەوی بۆ پشتیوانی درێژەپێدانی شۆڕش دەربڕیووە. هەروەها لیبیاو سوریاش. بەم پێیە، بەرەنگاری کرابا، دوای

ماوەیـەکیش لـە بـەرەنگاری، بێگومـان، هـەروەکو مێـژووی کوردایـەتی سەلماندویەتی، گفتوگۆش دەکرایـەوە. سـەرکردایەتی شـۆڕش‌و پـارتی، بەداخـەوە بڕیاری لەوجۆرەی نەدا. پارتی پاساوی خـۆی هـەبوو، بـۆ بەرەنگارینـەکردن (کـە هەڵە بوو). ئەی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆچی بڕیاری بەرەنگاری نەدا؟

لەوەڵامـدا دەڵـێین: هەڵبەتـە، سـەرکردایەتی کۆمەڵـەو ئـەو کەسـایەتی‌و لایەنانەی ئامادەی بەرەنگاری بون (عەلی عەسـکەری، رەسـول مامەنـد، عـەلی هەژار)و خەڵکی تریش، جارێ ئەمانە، کەسایەتیەکی گەورە لەناو وڵاتدا نـەبوو، هەمویان بەقسەی بکەن‌و بە رابەری خۆیـانی بـزانن (وەکـو مـام جـەلال). وەکـو کەسایەتی واش نەبوو، ئەو سەرکردانە، ماوەیەکی باشیان نەدایە خۆیان، لەسـەر دۆخێکی ئاوای چارەنوسـساز، چەندین کۆبونـەوە بکـەن‌و لـە هـەموو بارێکـەوە دۆخەکە هەڵبسەنگێنن‌و بڕیارێکی بابەتی بـدەن. لـە هـەموش خـراپتر، ئەوانـەی ناویـان بـۆ بـەرەنگاری دەهـات، پەیوەنـدیان بـە مـام جەلالـەوە نـەکردبوو، یـان چـاوەڕوانی بڕیـاری مـام جـەلالیان نـەکردبوو. دوای یـەك دوو کۆبونـەوە، یـان پەیوەندی دووقۆڵی‌و سێقۆڵی، وەکو پێمان گوترا، لەترسی هەڕەشەی بارزانی، کە گوتبوی، ئەوەی بێنێتەوەو درێژە بە شۆڕش بدات، خـۆم دەچـمە سـەریان. لەبـەر ئەو هەڕەشەیەو گەلێ هۆکـاری تـر، ئەوانـەی ئومێـدیان پـێ هـەبوو بـەرەنگاری بکەن، نەیانکرد.

خۆم.. زیاتر لە (١٠) جارم لە مام جەلال بیستووە کە کـاتی خـۆی، (د.خـدر مەعسـوم)ی سـەرۆکی ئێسـتای زانکـۆی کۆیـەی نـاردووە، شـەهید عـەلی عەسکەری‌و زۆر کەسی ترو سەرکردایەتی کۆمەڵە، گەر خۆیان بگـرن‌و ئامـادەی

بەرەنگاری بن، مام جەلالیش دەگەڕێتەوە. [*] بەلاّم هەتا د.خدر گەیشتۆتەوە ئێران پەیامی مام بگەیەنێ، هەموو ئەو بەڕێزانە بلاّوەیان لێکردبوو. بەلّکو زۆربەشیان گەڕابونەوە عێراق.

ئەو سەرگوزشتەیە، سەبارەت بەو کەسایەتییە سیاسیو عەسکەریانە، وا زوو، خامۆش بووە. مایەی سەرسوڕمانە. ئەو جۆرە کۆبونەوە پچڕ پچڕانەو بەو پەلەپەلە گەڕانەوەیە، هیچ نەسەلمێنێ، ئەوە دەسەلمێنێ، ئەو کەسایەتیانە، لەناخەوە باوەڕیان بە بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی هەرەس نەبووە. زۆریش سڵەمیونەتەوە لە تەحەمولکردنی ئەو بەرپرسیارێتییە. کە لەو هەلومەرجەدا بەرپرسیارێتیەکی نەتەوەیی مێژوویی بووەو ستراتیژێکی چارەنوسساز بووە، نەك تاکتیکی. لێرە، درێژە بەو لێکدانەوەیە نادەین و لێیدەگەڕێین، مێژوونوس بەبەڵگەوە، راستیەکان ساغبکەنەوە. دێینەوە سەر سەرکردایەتی کۆمەڵە، هەتا بزانین بۆچی بڕیاری بەرەنگاریان نەداوە؟.

جارێ.. ئەوکاتە، جگە لە خالە شیهاب، باقی سەرکردایەتی کۆمەڵە، (فەرەیدون عەبدولقادر، ئاوات عەبدولغەفور، حەمەی میرزا سەعیدو عومەری سەید عەلی) کەسایەتی ناوداری کوردایەتی لەسەر ئاستی کوردستان نەبون. (هەروەکو ئێمە لەکاتی بەرپابونی شۆڕشی نوێ)دا شەهید شیهابیش، هێندەی شارەزای بواری حیزبایەتیو لە بواری حیزبایەتیشدا، هێندە قالّبوی خەباتی نهێنی بوو، کەمتر شارەزای خەباتی ئاشکرای جەماوەری، لەژیانیشیا، بچوکترین تاقیکردنەوەی عەسکەری نەبوو. لەناو عەسکەریەکانی کوردستانیشدا، کاریگەری نەبووە. بمانەوێ و نەمانەوێ، کاتێك سەرکردایەتی

* لەم رۆژانەدا، راستیەکی ترم زانی. ئەویش ئەوەیە کە مام جەلال، راسپاردەکەی پریماکۆف و لیبیاو سوریای، بەچەندین نامە، بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی لەرێگەی هێرۆ برایم ئەحمەدەوە، ناردووە.

کۆمەڵـە، ئـەوە پێکهاتەکـەی بوبـێ، دۆخەکـەش بەوشـێوەیە تێکوپێکچـوبێ؛ سەرکردە ناودارەکانیش بڕیاری بەرەنگاری نـەکردنیان دابـێ، بێگومـان، لـەباری سیاسیو سایکۆلۆژیەوە، ئەمە کاریگەری لەسەر بڕیاری سیاسـی سـەرکردایەتی کۆمەڵەش هەبووە. رەنگە هەر ئەم کاریگەریەش، بەشێکی گرنگی هۆی بڕیـاری بەرەنگارینەکردنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوبێ. بەشەکەی تریشـی پەیوەنـدی بـە رێکەوتنامەی جەزائیرو دۆخی ناوچەکەو کوردستانەوە هەبووە.

بەڵام.. بەدیوی تریشدا، گەر دۆخەکەو هەرەسەکەو، بـەرەنگاری نەکردنەکـە، لێکبدەینەوە، ئاخۆ بەرەنجامی تریشمان دەستناکەوێ؟

چی دەبوو، سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەئاشکرا بڕیـاری هێشـتنەوەی هێـز، یـان کۆکردنەوەی هێز، یان راگەیاندنی درێژەپێدانی شۆڕشیان رانەگەیاندبا، بەڵام، لـە چـەندین شـوێندا، بـەناوی جیـاوازەوە، لـەژێر پـەردەی جۆراوجـۆردا، لـە شـوێنە سەختو دورەدەستەکاندا، دەستە دەستە پێشمەرگەیان پەنادابا‌و بۆ ماوەی چـەند مانگێك، چاوەڕێی رۆشنبونەوەی باشـتری دۆخەکـەیان کردبـا، لـەو ماوەیەشـدا، پەیوەندیان بە مام جەلالو سوریاو لیبیاو دۆستانی تری کـوردەوە بکردایـە، هـەر بە تەلەفۆن لەئێرانەوە، یان لەڕێگەی سەفارەتەکانی سوریاو لیبیاوە، یان نـاردنی پەیکەوە، ئـەو کارانـە ئەنجامـدەدران. کەچـی سـەرکردایەتی کۆمەڵـە، ئەوەشـی نەکردبوو.

بـا لـەوەش گـەڕێینو بێینـە سـەر لایـەنی کـەمی ئـەرکی رێکخراوێکـی مارکسیسـتی شۆڕشـگێڕ، ئـەویش ئیحتیاتکردنـە بـۆ ئەگـەرەکانی ئاینـدەی روداوەکان، ئایە سەرکردایەتی کۆمەڵە، ئەمەی کردبوو؟ نوسەر، لە هـەموو ئـەو ئەرکانە، داڕشتنی بەرنامەو بڕیارانـە، خـۆی نـەبان دەکـاتو لـە (٨) لاپـەڕەدا، بەچەندین بابەتی لاوەکیو ناکۆکی ئەوکاتەو ریزکردنی خاڵی بێسەروبەر، سەر لە

خوێنــەر دەشــێوێنێ. لــەم تێــزە بێپێــزە سەیروسەمەرەشــدا، دێتــەوە ســەر عێراقچێتیو دەیانکوتێتــەوە (بێگومــان دەیــان جــاری تــریش دێتــەوە ســەر ئــەم بابەتە) بەڵام راستیەکان، هەرگیز بـە کەسـانی وا ناشـاردرێتەوە. لێـرەدا، بۆچـی نوسەر لەخۆی نەپرسیووە، لە سەرکردایەتی کۆمەڵەی نەپێچاوەتەوە، دۆخەکـەی لە بڕیـاری سـتراتیژیەوە (کـە درێژەپێـدانی شـۆڕش بـوو) هـەتا دەگاتـە خـەباتی تەکتیکی (کە شاردنەوەی دەستەی جەنگاوەر بوو) یان لایەنی کەم ئیحتیاتکردن بوو بۆ دوای گەڕانەوە بۆ شارەکان، ئەمیش لایەنی کەمی راپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵــە بــوو. ئــەم ئیحتیاتــە چــی بــوو کــە دەبــوو ســەرکردایەتی کۆمەڵە ئەنجامیاندابا؟ لەوەڵامدا دەڵێین:

- گریـان بۆچـونی سـەرکردایەتی کۆمەڵــە راسـت بـووە، دۆخەکـە وا شـڵەژابوو درێژەپێدانی شۆڕش دژوار بوبێ؛
- گریـــان شـــاردنەوەی دەســـتە جـــەنگاوەریش، زۆر زەحمـــەت بوبـــێو کاریگەری خراپی لەسەر بەرنامەی سیاسـیو رێکخراوەیـی کۆمەڵـەو خـەڵك بوبێ، ئەوسا؛
- ئەی کۆمەڵە، لەناو دۆخێکی شڵەژاودا، لەکاتێکـدا هێشـتا رژێـم پـەلاماری ناوچە ئازادکراوەکانی نەدابوو. پاراستن هەڵدەهاتنو لەترسی نـەفرەتی خـەڵك خۆیـان دەشـاردەوە، دەیـان هـەزار چـەکی سـوكو قـورس، لـە پێشـمەرگەو خەڵکەکە بوینـە تـەوق. چاپخانەی ناوچـەکان کەوتبونـە بەردەسـتی خـەڵك. دەبوەکان بەئاسانی دەستدەخران. چاکە..

ئەگەر کۆمەڵە، وای داناوە دوای گەڕانەوە بـۆ شـارەکانو بەرچاوڕۆشـن بـونی سیاسی، لە هـەلێکی گونجـاودا بـە هەڵگیرسـاندنی شـۆڕش دەسـتبکاتەوە، گـەر ئەمە وایە، بۆچی لایەنی کەم (٣٠٠ — ٥٠٠) چەکی نەشـاردەوە؟ گـەر (١٠٠)

چەکیش شارابنەوە، هەرباشە؟[*] بۆچی تایپو رۆنیۆیەکی زۆری پەنا نەدا؟ بەتایبەتی ئەوکاتە، سەرکردایەتیو زۆربەی کادرەکانی کۆمەڵە، لە ناوچەی پێنجوێندا، کۆبونەوەو چەندین رۆژ قسەوباسیان لە سیاسەتو ستراتیژو تاکتیکی کۆمەڵەو ئایندەی کۆمەڵە دەکرد؛ بڕیاری بەرەنگاری نەکردنیشیان هەر لە پێنجوێنو ناوچەی سەیدسادق دابوو.

لە پێنجوێن؛ هاوڕێیەکی باوەڕپێکراوی وەکو (بەکری حاجی سەفەر) هەبووە، کە شارەزای ناوچەکە بووە. بۆچی (٢٥-٥٠) چەکیان لا قایم نەکردبوو. کە شۆڕش کرا، کاك بەکر دوای دوو ساڵیش مەفرەزەیەکی (١٠) کەسی چەکداری بە چەکی شۆڕش بۆ پێکەوەنەدەنرا.

لە هەڵەبجەش؛ هاوڕێیەکی وەکو (خولە کەشکۆڵ- شێخ عەلی) هەبووە، بۆچی برێ چەکی باشیان لا نەشاردۆتەوە؟ کە شۆڕش بەرپاکرا، شێخ عەلیو حامیدی حاجی خالیدو شەهید شەوکەتی حاجی موشیرو شەهید عەلی شیعەو حەمەی حاجی مەحمودو شەهید د.رەزا.. تێکڕا (٣) چەکیان هەبوو.

لە بەرزنجە؛ هاوڕێیەکی وەکو (جەمالە رەش) هەبووە، بۆچی چاپخانەو پێویستی تریان پێ دابین نەکردووە؟ شەهید جەمال خۆیشی بێ چەك هاتەدەرەوە.

لە خورماڵ؛ هاوڕێیەکی وەکو شەهید (د.رەزا) هەبووە، بۆچی پێداویستی تریان لا دانەناوە؟ خۆیشی بێ چەك هاتەدەرەوە.

---

* کە بڕیاری شۆڕش درا، تاكوتەرا چەکی شاردراوەی هاوڕێیانی کۆمەڵە، بە راسپاردەی هاوڕێیانی زیندان، پێمان درا. تێکڕا نەدەگەیشتە (٥-٧) چەك.

بۆئـەوەی بەئەمانەتـەوە، ئاڕاسـتەکانی کۆمەڵـەو بڕیارەکـانی بـاس بکـەین، دەڵێین: بڕیـاردرابوو لیژنـەکانی کۆمەڵـە چـەكو تەقەمـەنی بشـارنەوە. ئەمـەیان راستە. بەڵام دەپرسم:

لیژنـە نهێنیـەکانی نـاو شـۆڕش، چـییان بەدەسـتەوە بـووە، هـەتا بتـوانن بیشارنەوەو لەکاتی خۆیشیدا، بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش پشتی پێببەستن؟

سـەرکردایەتی کۆمەڵـە، خـۆی ئیحتیـاتی نـەکردبێ، لیژنـەی تایبـەتی بـۆ دروستنەکردبێ، بەرنامەی هەمەلایەنـەی بـۆ دانەڕشـتبێ، چـەند کەسـایەتیەکی بـاوەڕپێکراوی نەدۆزیبێتـەوە متمانـەی چـەك شـاردنەوەیان پـێ بکـات، لیژنـەی پەرش‌و بڵاوی ئەم شوێن‌و ئەو شوێن، کە بەدرێژایی یەك ساڵی شۆڕش، یەك دوو جار پەیوەندیان پێوە کراوە، ئەمانە، کە زۆربەیان لاو بـون‌و کـەم ئـەزمون بـون‌و کەمترین چەکیشیان بەدەستەوە بووە، چـییان پێـدەکرا؟ دەرکـەوت، هـیچ لایـەك بەقەد رێکخستنی خانەقین (١٤) پارچە چەکی نەشاردبوەوە، بـەڵام نەشمانـدەزانی چۆن بیانشارینەوە.

کـە گەڕاینــەوە شـارەکان‌و کۆمەڵــە لێیقــوما، رێکخسـتنەکان گیرانــەوە، دەرکەوت کۆمەڵە تەنها یەك تایپی لە حـاجی مامەنـد شـاردۆتەوە (گریـان دوو تـایپی تریشـی شـاردبێتەوە) ئـەویش بـەبێ رۆنیـۆ (کـە بەئاسـانی ئەوکاتـە پەیدادەکرا).

کـە دەستیشـمان کـرد بـە ئامادەکـاری مـەفرەزەکانی شۆڕشـی نـوێ، بۆمـان دەرکـەوت، سـەرکردایەتی کۆمەڵـە (٥-٧) پارچـە چەکیشـی نەشـاردبوەوە، لـە هـەموو شـارەکانیش، دوو دەمانچـەمان دەسـتکەوت: یـەکێکیان هـی شـەهید جەعفەرو ئەوی تریشیان هی کاکە دارۆ بوو. بەئەمانەتیشەوە، پێیاندایین.

من له خوێنەر دەپرسم: نوسەر، وەکو من ئـەم راسـتیانە بـاش دەزانـێ، ئـەی بۆچی باسی نەکردون؟ بۆ کەی هەڵیگرتون؟ خۆ دەکرا، بەشـێکی ئـەم راسـتیانە، وەکو چڵێکی چەپکەکەی مێژووی کۆمەڵەکەی باسی بکات. بـەڵام نوسـەری ئـەم مێـژووە، لەبەرئـەوەی نەرگسـیەتی خـۆی بـە رقهەڵڕشـتنو گیـانی تۆڵەسـەندن، زاخاودەدات، بۆیە، هەر بوارێکی مێژووەکەی خۆی مەبەستێتی، ئـەو نەخۆشـیە دەرونیەی دانەمرکێنێتەوە، توخنی نەکەوتووە. بەتایبەتی زانیویـەتی باسـکردنی ئەو راستیانە، چەپکەکەی پڕ دەکات لە دڕك!!

## ١٤

# شالاوی گرتنو تلەزانی ڕێکخستن

لە لاپەڕە (٧٠) وە، ئیتر ڕوداوەکان، هەلن بۆ هەلّڕشتنی ڕقی زیاتری نوسەر. بۆئەوەی پاساو بۆ هەلّڕشتنی ڕقەکانیشی بهێنێتەوە. زۆرتر خۆی لە قـەرەی ئـەو کێشـانە دەدات، کـە بتوانـێ بـوار بـۆ دەربڕینـی کینـەو بوختـان هەلّبەسـتن برەخسێنێ. گێڕانەوەی ڕوداوەکانیش پڕن لە زانیاری هەلّە، ناڕاست، هەلّبەستنو ناوزڕاندن. نوسەر لـە لاپـەڕە (٧٠-٧١)دا بەمشـێوەیە باسـی شـالاو بردنەسـەر کۆمەلّە دەکات:

" لە مـانگی ١٩٧٥/٧ دا یەکـەم کـە سێ، کـە یـەکێك بـوو، لەئەنـدامانی سەرکردایەتی لەلایەن ڕژێمە وەگیرا (حەمەی میرزا سەعید) بوو، لەیەکـەم ڕۆژی ئەشکەنجەدا خۆی نەگرت و زمانی لە هاوڕێیان دابوو، کە بە ڕاستی بـە دەگمـەن کەسانێك کە ئـەو ناسـیبوونی لـە زمـان لێـدانی دەربـاز ببـوون. هـەر ئـەو ڕۆژە سیخوڕەکانی ڕژێم توانیان (ئەنوەر زۆراب، محەمەد بـرزۆ، سـەلام) دەسـگیرکەن و لە مالّی ئەنوەر زۆراب دا لـە بەغـدا تایپێـك و چـەند نامیلکـە و بلاّوکراوەیـەك بگرن وەك بەلّگە لەسەر ئەنوەر زۆراب."

وردەکاری ئەم سەرگوزشتەیە، بۆ شارەزایانی وردتری رووداوەکە دەهێڵمەوە، چونکە هەموو ئەوانەی شارەزان لەژیاندان، بەپێی زانیاری من، رووداوەکە وا نەبووە. بۆئەوەی بشزانرێ من زانیاریەکە چۆن دەزانم، دەبێ بڵێم:

ئەوکاتە کۆمیتەیەك کە شەهید ئەنوەر زۆراب بەرپرسیاری بوو، من لێپرسراوی خانەقین‌و ئەنوەر شاکەلی لێپرسراوی بەغدادو دەوروبەری، ئەندامی بوین. مانگی دوو جار، یان کەمتر، بەپێی پێویست لە ماڵی شەهید ئەنوەر لە بەغداد، کۆدەبوینەوە.

لە (١٩٧٥/٩/٣) شەهید ئەنوەر گیرا. هەر دوو رۆژ دوای ئەوە (١٩٧٥/٩/٥) عەلی شامار نامەیەکی ئەنوەر شاکەلی پێگەیاندم، کورت‌و پوخت نوسیبوی:

هاورێ ئەنوەر گیراوە. لە ماڵەکەیدا هەرچی هەبوەو نەبووە دەستی بەسەردا گیراوە، من خۆم شاردۆتەوەو تۆش خۆت بشارەوە. هەتا پەیوەندیمان پێوەدەکرێ.

دەستوبرد هاورێیانی خانەقینم بەسەرکردەوەو رێوشوێنمان دانا چی بکەین. بەرەو ماڵی خوشکم لە هەولێر، بۆ ماوەیەك خۆپەنادان، کەوتمەرێ. پاشان (١٩٧٥/٩/١٥) هاتمە سلێمانی‌و کاك سالارم بینی‌و ئەویش کاك عومەری سەید عەلی پێناساندم‌و ئەمیش کاك فەرەیدون عەبدولقادری پێ ئاشناکردم‌و ئەمیش ماڵی شەهید بەکر دارتاشی بۆ خۆشاردنەوە، بۆ دیاریکردم. بەڵام دوای دوو هەفتە، بۆ ئەم دوو هەفتەیەش، چومە کەرکوك لە ماڵی خوشکێکی ترم کاتەکەم بردەسەرو لەوێش، شەهید ئازاد هەورامی‌و سەلام چاوشین‌و شەهید سیروان تاڵەبانیم دی. شەهید سیروان، شوناسنامەیەکی فەرمانگەی خانەنشینی کەرکوکی بۆ کردم‌و زۆریش سودم بۆ هاتوچۆ لێوەرگرت. لەو ماوەیەشدا، بەردەوام هاورێیان دەگیران.

لەم بینینو سەردانانە، پرسیاری سەرەکی ئەوەبووە؛ بۆچی هاوڕێ ئەنوەر زۆراب گیراوە؟ بۆ لەماڵەکەیدا هەموو شتێك دەستکەوتووە؟ بۆ باقی هاوڕێیان وا زوو گیران؟ کێ جاسوس بووە؟ کێ خۆڕاگر نەبووە؟ ئەی بڕیار چی دەبێ؟

وەڵامی ئەو پرسیارانە لە نوسینەکەی نوسەردا، هیچی نەدراوەتەوە، هۆیەکەشی ئەوەیە، کە وەڵامی لا نەبووە، چونکە کادرێکی ئاسایی ئەوسای کۆمەڵە بووە. ئەوەی دەماودەمیش دەیزانێ، نە هەموی راستەو نە تینوێتی راستیەکانی مێژووش دەشکێنێ. نە خۆیشیی پێیخۆشە،وەکو رەخنە لە سەرکردایەتی کۆمەڵە، باسیان بکات.

## ١٥

# مێژوویەکی هەڵەو هەڵەیەکی هەڵبەستراو !

لەدرێـــژەی گێڕانـــەوەی سەرگوزشـــتەی چـــۆنیەتی گرتنـــی هاوڕێـــانی ســـەرکردایەتیو ئۆرگانـــەکانی کۆمەڵـــە، نوســـەر مێـــژووی گرتنـــەکان بەهەڵـــە دەنوســێو هەڵــەی تــریش هەڵدەبەســتێ. بــەڵێ هەڵــە هەڵدەبەســتێ. مــن دەزانم هەڵە، هەڵنابەسترێ. هەڵە هەڵەیە. بەڵام نوسەر بۆئەوەی مێژووی هەڵەکـەی بـۆ بچێتەسەر، هەڵەی هەڵبەستراوی تریش دادەتاشێ هەتا هەردوو هەڵەکـە، بکاتـە راستی. جارێ دەقەکەی لاپەڕە (٧١)ی نوسەر بخوێنینـەوە، پاشـان دێمـەوە سـەر باسکردنی هەڵبەستراوەکان:

" دوای گرتنـــی حەمـــەی مـــیرزا ســـەعید و شـــەهید ئـــەنوەر زۆراب و هاوڕێکانیان، کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە و کۆمیتەی شارەکان کۆبوونـەوە، لە سەرەتای مانگی ١٩٧٥/٨ دا بـۆ نـاوکۆی کردنـی بارودۆخەکـە بـە تایبـەتی پاش گەڕانەوەی فەرەیدون عەبدولقادر لە ئـەورووپا و سـوریا و بینینـی هـەڤاڵانی دەستەی دامەزرێنەری (ی.ن.ك).."

جارێ.. شەهید ئەنوەر زۆراب لە (١٩٧٥/٩/٣)دا گـیراوە. نـەك لەسـەرەتای مانگی (١٩٧٥/٨)دا، رێك مانگێکی لێخـواردووە. ئـەم مێـژووە کـە بـە هەڵـە نوسیویەتی، کوتومت دەیسەلمێنێ، کە ئەم (هاوڕێیە!!) کەم ئاگایـە لـە راسـتی رووداوەکان. بەڵام لەباتی ئەوەی دانی پیابنێ کە کەم ئاگایە، مێژوویەکی هەڵـەی

هێناوەتەوە. لەبەرئەوەی سەراپای بابەتەکانی دەیەوێ وای پشانبدات کە وەکو رابەرێکی کۆمەڵە، وردو درشتی روداوەکان دەزانێ، خۆی لە پرسیارو سۆراغکردنی راستیەکانیش دزیوەتەوە.(*) ئەوە سەبارەت بە مێژوویەکی هەڵە. ئەی هەڵە هەڵبەستراوەکەی چییە؟ ئا.. ئەمەیە:

جارێ، کۆمیتەی سەرکردایەتیو کۆمیتەی شارەکان، کۆنەبونەتەوە. کۆبونەوەی هاوبەش، یان کۆبونەوەی دوو کۆمیتەی نهێنی ئاوا، لە مێژووی کۆمەڵەدا، نەکراوە. هەتا سەرکردایەتی کۆمەڵەش نەکەوتنە بەر هەڵمەتی گرتنو هەڵهاتن، سەرکردایەتی کۆمەڵە (کە پێموایە ناوی ناوەندی کۆمەڵە) بوو، چەند هاورێیەکی کەم نەبێ، بەرپرسو شانەکانی شارەکانو خوارەوە، نەیاندەناسین. بۆیە، لەوجۆرە کۆبونەوانە، مەگەر لەخەوی نوسەردا، کرابێ.

کاك فەرەیدون عەبدولقادریش، لەوکاتانەدا نەگەڕابوەوە. پێشتر، پێش راگەیاندنی دامەزراندنی یەکێتی، سەردانی سوریای کردبوو. لەگەڵ مام جەلالیش، لەسەر شێوەی تری رێکخستنو رۆڵی کۆمەڵە لەناو ئەو رێکخستنەی ئەوکاتە، بۆ هەڵسانەوەی شۆڕشی کوردستان پێویست بوو، رێك کەوتبون. ئەم قسانەم چەندین جار لە کاك فەرەیدون خۆیم بیستووە. تەنانەت چەند مانگێك لەمەوبەریش، بەئامادەبونی مامۆستا جەعفەرو کاك شێخ میقداد، لێمان بیستەوە.

لەو قسە هەڵبەستراوانە، دەیەوێ جەخت بکاتەوە سەر ئەوەی گوایە، ئەو، ئەندامێکی کۆمیتەی شارەکان بووەو دوای رۆشتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ

---

* بۆ زانیاری مێژووی روداوەکان، بەشدارانی کۆبونەوەکان، شوێنو شەڕگەکان، دێهاتو شاخەکان..تاد، زیاتر لە سەد تەلەفۆنو دەیان پرسیارم لە هاورێیانو پێشمەرگەکان، بۆ نوسینی ئەم وەڵامە، کردووە.

سوريا، لەڕێی ئێرانەوە، ئیتر شەرعیەتی سەرکردایەتی کۆمەڵە، لای کۆمیتەی شارەکان بووە، نەك کۆمیتەی هەرێمەکان.

چونی هاوڕێیانی کۆمەڵەش لەڕێی ئێرانەوە، بە ڕێپێوانێکی سنوردار نەبووە، بەڵکو کەسێکی جێ باوەڕی سەرکردایتی کۆمەڵە، بە سەیارە، هەتا سەر سنوری بردونو لە سنورەوە، خۆیان بە چەمپاراودا کردووە. چونی ئەم هاوڕێیانەش، دیسان مانگی (٨/ ی ١٩٧٥) نەبووە. چونکە، من خۆم، لەڕێگەی کاك سالار عەزیزەوە، (١٩٧٥/٩/٨) هەم کاك فەرەیدون عەبدولقادرو هەم کاك عومەری سەید عەلیم دیوە. چیرۆکی بینینەکەشی بۆ مێژوو، چێژی خۆی هەیە بیگێڕمەوە.

من (١٩٧٥/٩/٥) ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتمە سلێمانی. ئەوەی باش بوو، لەڕێگای کاك (سەلاحی شێخ تەیب)ەوە، مامۆستا سەلاح عەبدولحەمید، کە ئەوکاتە (کاتب)ی خوێندنگای ناوەندی (عەدنانیە)ی خانەقینو زاوای بوو، بەهۆی ئەوەوە ناسنامەیەکی ساختەی خوێندکاری پۆلی پێنجی ئامادەیی بەناوی خوازراوەوە بۆ کردبوم. ناوەکەشم لەبیرە (عەبدوڵلا ئەحمەد عومەر) بوو. یەك ساڵ سودم لێوەرگرت. بەم ناسنامەیە، شەوەکەی چومە ئوتێل.. سلێمانی شارەزا نەبوم. زارە سۆرانیەکەشم پرتەپرتی دەکرد. ئەو شەوە، بە دڵەڕاوکێ، خەوتم. لەم شارەشدا، جگە لە کاك (نەجمەدین عەزیز- سالار) کەسی دیکەم نەدەناسی. ناوبراویشم ساڵی (١٩٧٣) لە ئۆردوگای قوتابیان لە بنکورەی خانەقین ناسی (١٩٧٤)یش لە کۆنگرەی لاوان دیمەوە. جارێکیشیان لە (تاق وەستان)ی کرماشان، هاوینەکەی بینیم. کە بینیم، نەشیناسیمەوە. هەتا خۆمم پێناساند، قیر وتی چەق، متمانەی نەدەکرد. کاك سالار کێشەیەکی هەیە، شتی بیردەچێتەوەو ناویش کەم لەبەردەکات. بەکورتی:

کاتی خۆی، پێی گوتم کە حاجی عەزیزی باوکی، لای سەرتاشخانەی دەرسیمی شەهید قادر کابان، نوسینگەی بەڵێندەرێتی هەیە. ئەمەم لەبیرمابوو. چوار رۆژ لە شارەکەدا مامەوە، رەنگە لایەنی کەم (٥٠) جار، لەبەردەمی نوسینگەکەدا، هاتوچۆم کردبێ، بەڵکو کاك سالار ببینم. هیچ.

عەسرێك.. شەکەت شەکەت، بە جادەی ئۆرزدیدا سەردەکەوتم. سەیری بەرامبەرم کرد، کاك سالارم بینی، تەزویەکی سەیرو خۆشییەکی لەرادەبەدەر دایگرتم. منێکی بابایەکی خانەقینی، بە شوناسنامەی ساختەوە، کۆمەڵە بەر هەڵمەتی گرتن کەوتووە، هاتومەتە شارێك کە رژێم، تۆرێکی سیخوڕی تۆکمەی لەناودا چنیبوو. دەیان خانەقینیش، بەعسیو ئەمن لە شارەکەدا هەبون. لەهەمانکاتدا، سەدان خانەقینی دڵسۆزیشی لێبوو. نەمدەویست، نە دڵسۆزانو نە پیاوخراپان بمناسن. لەکاتی بینینی کاك سالاردا، دەتگوت، لە دۆزەخی دەرونیی رزگارم بوو. بەهەڵەداوان، خۆم پێیگەیاند. سڵاووم لێکردو بەخۆشیەوە، قسەم لەگەڵدا کرد. دیسان، بیرەوەریی منی نەدەخوێندەوە. هەرچی چۆنێك بێ، لە بنکورەوە هەتا هەولێرو شەهید شەهابو تاق وەستانم، خێرا بیرهێنایەوە. یەکسەر بیری کەوتەوەو گوتی: کاك حەکیم. من ناویشم (حیکمەت)ە، بەوشێوەیەی بانگیشی کردم، وامزانی خۆشترین ناوی لێناووم، گرنگ ئەوەیە، دۆزیەوەو سەرەداوێکم دەستکەوت.

دوای گفتوگۆیەکی زۆرو نیگەرانی دەربڕین لە دۆخەکە، وتم: هەرچی چۆنێ بووە، سبەینێ دەمەوێ یەکێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە ببینم. جوامێرانە گوتی: سبەینێ لای سەرتاشخانەی دەرسیم چاوەڕێتم، بۆت رێکدەخەم. ژوانمان سەعات (١٠)ی بەیانیو ژوانگەمان سەرتاشخانەی دەرسیم بوو. بەپەرێزەوە، چومە شوێنەکە. کاك سالار سەیری دەوروبەری خۆی دەکردو چاوەڕێی دەکردم. چوینە سەرتاشخانەکە. دیمەنێکی سەرنجڕاکێشم بینی، کە هەستی ناخی بزواندم.

شەهید قادر کابان، سەری کەسێکی دەتاشی. بە تەسجیلێکی ستریۆش، گۆرانی (هۆمەر دزەیی) بەدەنگی بەرز خستبووە سەری‌و هارمۆنیەکی سەیر، لەنێوان دەنگی هۆمەرو قادر کاباندا، کە لەگەڵیا دەیوتەوە، ئاوێتە بوبون. خواخوام بوو، زۆر دانیشم. نەمدەزانی، زۆرتر گوێ لە هۆمەر دزەیی بگرم، کە دەمێك بوو حەزم لە دەنگە دەگمەنەکەی دەکرد، یان گوێ لە دەنگە ناخ هەژێنەکەی قادر کابان، کە بەردەوام بەدەم خەفەتی تەعریب کردنی شارەکەم خانەقینەوە، گوێم لە گۆرانی (بەجارێ ماڵی وێرانم) دەگرت‌و دەرونی شاروێرانی خانەقینم، بەجارێ گڕی تێبەردەبوو.

گۆرانیەکەی هۆمەر دزەیی گەیشتە ئەو بەشەی (باخچەی پاشا لەوبەر ئاوە- خێڵی دوژمن دەورەی داوە) کەسێکم بینی، بە ویقارو هێمن، بەرامبەر دوکانەکە وەستا. کاك سالار هەستاو منیش دوای کەوتم. کەسەکە (کە نەمدەناسی) کەوتەڕێ‌و ئێمەش بەهەمان شێوە. کەمێك دورکەوتینەوەو کەسەکە تەوقەی لەگەڵ کردم. دوای چۆنی چاکی، کاك سالار رۆشت‌و ئێمەش روەو مزگەوتی گەورە کەوتینەڕێ. بەدەم ڕێوە، دیقەتم لە کابرا دەدا. نەرم نەرم قسەکردنی‌و ئارام ئارام رۆشتنەکەی‌و بەوپەڕی ڕێزەوە پرسیارکردنی، دەچووە دڵم. چەند پرسیارێکی لەسەر خانەقین لێکردم، وەڵامم دایەوە. ویستم پرسیاری لەسەر دۆخی کۆمەڵە لێبکەم، گەیشتینە ناو مزگەوتی گەورەو لەدەرگایەکی تری دواوە، دەرچوین‌و لەبەردەرگا، کەسێکی بالا ناوەنجی‌و نیمچە قەڵەو، کراسێك‌و پانتۆڵێکی چارلستۆنی لەبەربوو، چاوەڕێی دەکردین. تەوقەمان کرد، کابرای نەناسیاویش تەوقەی لەگەڵ کردم‌و رۆشت (پاشان زانیم کە کاك عومەری سەید عەلی) بوو. ئەم هاوڕێیەش، فەرەیدون عەبدولقادر.



ناوزەنگ — ١٩٨٠

لەچەپەوە: ١- فەرەیدون عەبدولقادر ٢- مەلا بەختیار

٣- شەهید ئازاد هەورامی ٤- ملازم عومەر

لەگەڵ کاك فەرەیدون، لەپشتی مزگەوتی گەورەوە، کۆڵانەو کۆڵان، هەتا سابونکەران رۆیشتین. هەتا ئەوێ، هەردوکمان یەکترمان پرسیار باران کرد. ئەو لەسەر خانەقینو منیش لەسەر کۆمەڵەو بەغدادو گرتنی شەهید ئەنوەر.. دڵنیام کرد کە خانەقین مەترسی لەسەر نییە. ئەویش دۆخەکەو دۆخی کۆمەڵەی بەوردی بۆ روندەکردمەوە، کوردیەکی جوان، رستەی رەوان، بۆی باسکردم کە بە شەهید ئەنوەریان وتبوو خۆی بشارێتەوە، یان بێتە سلێمانی. ماوەیەك خۆی شاردۆتەوە. کە ئەمن زانیویانە هاتوچۆی ماڵ ناکات، ئەو ماوەیە نەچونەتە سەریان. وایزانیووە، ئەو کەسەی گیراوە، ناوی نەداوە. ئەو شەوەی چۆتەوە چونەتەوە سەری‌و گرتویانە. دوای شەوێك هەڵیانکوتاوەتە سەر ماڵەکەی‌و هەرچی

تیابووە، تەنانەت شوێنە نهێنیەکانیشیان پشکنیووەو بەڵگەو ناوەکانیان بردووە. زانیبویان دەمانچەکەشی لەکوێ شاردۆتەوە. لەم قسەوباسانە بوین، لە گەڕەکی سابونکەرانو بەرامبەر حەمامی مفتی، گەیشتینە بەردەم دوکانێکی دارتاشی، کەسی لێنەبوو. کاك فەرەیدون پێی گوتم:

دوای (١٠ — ١٥) رۆژی تر وەرە بۆ ئێرە. بەناوی نهێنی (خۆشناو) خۆت بە دارتاشەکە بناسێنە. ئیتر لەشوێنێك داتدەنێینو پەیوەندیت پێوەدەکەین. لەناو قسەکانیا، وتی: خەریکی تەگبیرن بچینە شاخ. شوێنمان دەستنیشان کردووە. خەڵکیش دەنێرنە سوریا بۆ لای مام جەلال. کەی ناردمان بەدواتا، تۆش وەرە بۆ ئەو شوێنەی بۆت دیاری دەکرێ. کە کاك فەرەیدون رۆشت، ورد ورد شوێنەکەو دەوروبەریم لەبەرکرد. دەترسام نەیدۆزمەوە. من کەوتمە بیرکردنەوەی جۆراوجۆر، تواناو ئاستی فەرەیدونم چوو بەدڵا. لێکدانەوەکانی، قسەکانی، پەرۆشیەکەی، سەرنجیان راکێشامو دڵیان خۆشکردمو لە هزری خۆمدا، قەناعەتم کرد کە، بەرنامەیەکی باشی شۆڕش کردن هەیە. کە هاتمەوە، ئیتر دەچینە شاخ.

هەر بەو خەیاڵەوە، بەناسنامەی ساختەوە، بۆ بردنەسەری (١٠ — ١٥) رۆژەکە، سەردانی هەولێرو کەرکوکم کرد، کە ماڵی دوو خوشکمی لێبوو. کە هاتمەوەو چومە دارتاشخانەکە، کاکی دارتاش تەنها بوو. پێموت من (خۆشناو)م. بەگەرمی پێشوازی لێکردمو دوکانی داخست، بەرەو ماڵی خۆیان. ئیتر لەمە بەدواوە، بەناوی نهێنی (بەختیار)ەوە کە برای کاك فەرەیدونو خوشکەزای بەکر دارتاشی شەهیدە، کە لەماڵەکەیدا گیرسامەوە، سەرگوزشتەی خۆشاردنەوەی من دەستپێدەکات. لەهەمان ئەو ژورەدا، کە خاڵە شیهابو هاورێکانی تیابون. کە بە هەق، پیاوێکی جوامێرو خێزانێکی میهرەبان، نهێنی پارێز، خۆڕاگر بون. لێرەبەدواوە، ئیتر رووداوەکانی کۆمەڵە، باشتری دەزانم. لە

چوارچێوەی خانەقین، هاتمە دەرەوە، بەرە بەرە، تێکەڵاوی ڕێکخستنو بەشێکی باشی نهێنیەکانی سەرانسەری کوردستان دەبوم. بۆیە، ڕەنگە وەڵامەکانم لەمەودوا، بۆ نوسەر، تێروتەسەلتر بێو بەوردی دەتوانم، بەسەرهاتەکان، لەو شوێنانەی نوسەر بەهەڵە نوسیونی، یان هەڵیبەستون، ڕاست بکەمەوە.

## ١٦

## لەبری مەفرەزە، کار لەکار ترازا!!

نوسەر، هەوڵدەدات، ئەوەی خۆی مەبەستێتیو هەرچیەك لەگەڵ مەرامی ئەودا دەسازێ، چەپکی مێژووی روداوەکان، ئاوا رێکبخات. بۆیە، بێباکانە دەکەوێتە ناو گوڵزاری ئەو مێژووەی کۆمەڵەو چەپکەکەی خۆیشی تێکدەدات. لە لاپەڕە (٧١)دا دەڵێ:

" بۆیە لەمانگی ١٩٧٥/٨ دا هاورێیان شەهاب شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحد، فەرەیدون عبدولقادر، عومەر سەید عەلی، ئاوات عبدالغفور، وەك سەرکردایەتی ئەرسەلان بایز، عەلی بچکۆل وەك ئەندامانی لیژنەی شارەکان لە سلێمانیەوە بە رێگای شارباژێڕدا رووە و سنوری دەستکردی ئێران رۆیشتن."

جارێ مێژووی رۆشتنەکە دەستکردە. چونکە لە (مانگی ٨ ی ١٩٧٥) دا، سەرکردایەتی کۆمەڵە خۆی نەشاردبوەوە. پاشان کاك (ئاوات عەبدولغەفور)و (ئەرسەلان باییز)یش لەگەڵ خاڵە شیهابو هاورێکانی نەڕۆشت: مـن (١٠/٧ی ١٩٧٥) برایان ئەرسەلان باییزو ئاوات عەبدولغەفورو عوسمان نانەوام، لە جادەی برایم پاشا بینی.

بزانن.. نوسەر، چۆن چۆنی لاپەڕەیەکی پێش ئێستای بیردەچێتەوەو چی دەفەرموێ:

(( ئەو هاوڕێیانە پاش گەیشتنیان بەو دیو سنور ویستویانە لە ڕێگەی چاوساغ و شارەزا و سنوردار سنور ڕێپێوانەکە بکەن، بەڵام لە چەم پاراو لە ١٩٧٥/٩/٢٢ لەلایەن جەندرمەکانی "شا"وە دەگیرێنو پاشان دەگوێزرێنەوە بۆ "زیندانی سەقز"..))

ئەم مێژووە، لەگەڵ مێژووەکەی لاپەڕەکەی پێشووی، مانگێکی جیاوازە. لە پەرەگرافی سەرەوەدا دەڵێت: مانگی (٨/ی ١٩٧٥) هاوڕێیانی سەرکردایەتی لە چەمپاراو گیراون. کەچی لەم پەرەگرافەدا، باسی (٩/٢٢ی ١٩٧٥) دەکات. ئەوەندەی من بشزانم هاوڕێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە (١٩٧٥/٩/١٤) لە سلێمانیەوە کەوتنەڕێ بۆ ئێران. ئەمە جگەلەوەی، بە گۆڕینەوەش، هاوڕێیان نەدراونەتەوە عێراق، بەڵکو بەپێی ڕێکەوتنامەی جەزائیر تەسیلم کراونەتەوە.

## ١٧
# شێواندنی گرتنی هاوڕێیانیش

ئەوەتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە، کوردستانیان جێهێشت، هەتا ئێستا جۆرەها روایـەت لەسـەر رۆشـتنەکەیان بڵاوبۆتـەوە. هـەروەها لەسـەرئەوەی چـۆن چـۆنی کەوتونەتە دەست رژێمی شا. لە یەکەمین کۆنفرانسـی کۆمەڵـەدا باسـکراوە. لـە دەیـان کۆبونـەوەدا زانیاریـەکان شـیکراونەتەوە. بەتایبـەتی سـاڵانی (١٩٧٦ — ١٩٧٧ — ١٩٧٩). ئەوەی دوورونزیك، بەدرێژایی ئەو ماوەیە، تەنانەت لـەدوای ئازادبونی هاوڕێیانی زیندان، باسنەکرابێ، ئەم خاڵەی خوارەوەیە، کە نوسـەر لـە لاپەڕە (٧٢)دا هەڵیبەستووە:

" ٢- دەڵێن لـەپاش چـوونیان بـۆ ئـەو دیـوی سـنور لـە ماڵێـك لایانـداوە و چاوسـاغەکە بـە تێـڕادیێ لـە ماڵەکـە باسـی ئـەو هاوڕێیانـەی کـردووە، خـاوەن ماڵەکـەش سـەر بـە بنەماڵـەی بـارزانی بـووە، و لای ئـەوان زمـانی لێـداون و ئەوانیش لای رژێمی ئێرانی زمانی لێداون و گیراون."

مرۆڤ، کە رق دایگرتو پێکهاتەشی وابێ، فلتەری لە قسـەکردنو هەڵبەسـتن نەبێ، ئیتر ئەوەی بشێ نایڵێو ئەوەی نەشێ چێژ لە وتنی دەبینێ. ئەمەی گوایە (خاوەن ماڵەکە سەر بە بنەماڵەی بارزانی بوبێ) بێتام لە راسـتیەوە دوورە. ئـەم

جۆره قسانه، یان بوختانه، باسنه‌کراوه. ئه‌قڵی ساویلکه‌یه‌کیش قبوڵی ناکات. چۆن؟

دەستەیەك هاوڕێ، رێیان گرتۆتەبەر خۆیان بگەیەننە ناو ئێرانو لەوێشەوە، بەرێگایەکدا بگەنە سوریا. دەستەیەکی نەناسراو، دەستەیەکی زیرەکیش، کە بەدڵنیاییەوە، زانیویانە جۆری رۆشتنەکەیان پێویستی بە پارێزیو پاراستنی نهێنییە. خاڵە شیهابیشیان لەگەڵدا بووە کە ئەو هاوڕێیانە (هەموو کۆمەڵەش) زۆریان خۆشویستووەو ئەویش مەرکەزیەتی مەعنەوی بەسەریاندا هەبووە. لەبەر ئەم هۆیانەو هۆگەلێکی دیکە، دوورونزیك رێی تێناچێ چاوساغەکەیان (بە رادیێ باسی ئەو هاوڕێیانەی) کردبێ. یان خۆشیان قسەیەکیان کردبێ خاوەن ماڵەکە، گومانیان لێ بکات. ئەمە جگەلەوەی نوسەر بە خوێنەر ناڵێ، ئەو ماڵە، لەم دیو یان لەودیوی کوردستاندا بووە، هەتا ساغبێتەوە ئەم زمان لێدەرە خەڵکی کوێیە. گەر مەبەستی دێی چەمپاراوە، هەموو شارەزایەك دەزانێ چەمپاراو، لە دیوی رۆژهەڵاتی کوردستانە. ئەوکاتە هاوڕێیان لەو دێیەدا، دوورونزیك، کەسیان نەناسیووە، هەتا سۆسەیان بکەن.

لەراستیدا، ئەم بوختانە، ئەوساو ئێستاش، تەنها لەخەیاڵی رقاوی نوسەردا هەیە. بەش بەحاڵی خۆم دڵنیام ئەوکاتە، ئەگەر هاوڕێیانی کۆمەڵە، سەریان بکردایەتە ماڵی هەر کەسێکی سەر بە بنەماڵەی بارزانی، داڵدەیان دەدانو هاوکاریشیان دەکردن. چونکە، هەنگینێ، هێشتا پێشمەرگە نەچوبونەوە شاخ؛ هێشتا شەڕی ناوخۆ دەستی پێنەکردبوو؛ هێشتا سەرکردایەتی کۆمەڵەو جموجوڵی کۆمەڵە، دەرنەکەوتبوو، ئەم خاوەن ماڵە، لەکوێ هێندە زیرەك بووە، پێشبینی کردبێ، ئەم هاوڕێیانە خەتەرن لەسەر بنەماڵەی بارزانی هەتا دەستپێشکەری لە تەسلیمکردنیان بکات؟ خۆ گەر چاوساغەکەش وەکو نوسەر دەڵێ: بە تێڕادیێ لەماڵەکە باسی ئەو هاوڕێیانەی کردووە. تۆ بڵێی چاوساغ،

زانیبیێتی ئەمانە سەرکردایەتی کۆمەڵەو بەرێکەوتون بگەنە سوریاو لەوێشەوە شۆڕش بەرپا بکەن.. پاشانیش دژی پارتیو بنەماڵەی بارزانی دەبن. تۆ بڵێی عەبقەری وا لەو ناوچەیەدا بوبێ؟ ئەمەیان هەرگیز ڕێی تێناچێ.

ئەم رقە کوێرانەیە، لەم پەرەگرافەدا، لەسەر ئەو کەسەی سەر بە بنەماڵەی بارزانی، لەلایەن نوسەرەوە دانامرکێتەوە، بەڵکو لاپەڕەیەك دوای ئەوە، لە لاپەڕە (٧٣)دا، رقەکەی جارێکی دیکە جۆش دەخواتەوەو دێتەوە سەر کۆنە قینی سەردەمی جەلالیو مەلاییو ئاوا هەڵیدەڕێژێ:

" ج- رۆڵی ناڕاستەوخۆی کەسانی روخاوی ناو دەزگا جاسوسیەکەی پارتی (پاراستن) پاش ئاشبەتاڵ و زمان لێدانیان لەوانەی کە لە شەڕی یەك ساڵەی ١٩٧٤-١٩٧٥ دا ناسیویانن."

گەر نوسەر، یەك بەڵگەشی لەسەر ئەم (زمان لێدان)ەی (پاراستن)ەکان هەبوو، تەنانەت دوورە دۆستێکی کۆمەڵەشیان بەگرت دابێ، من لە یەکەم لاپەڕەوە تا دوا لاپەڕەی کتێبەکەی نوسەرم قبوڵە. دووروونزیك ئەم قسەیە راست نییە. لەبەر چەند هۆیەکی سادە. ئەویش ئەوەیە کە:

یەکەم: بەرپرسانی پاراستن تەسلیم نەبونەوە، ئەگەر کۆمەڵە لای پاراستن ناسرابێ، لای بەرپرسەکانی ناسراوون، نەك کەسانی خوارەوە.

دووەم: لە شۆڕشدا، یان لەکاتی هەرەسدا، کە پاراستن دەستی بۆ هیچ هاوڕێیەکی کۆمەڵە نەبردبێ، ئیتر چۆن، دوای ئەوە کەسانی خوارەوە، بەبێ بڕیارو بەرێنوێنی سەروی خۆیان کاری وا دەکەن؟

سێهەم: پاراستن، لەدوای هەرەس، هەرەسی هێنا. ئیتر چۆن ئەو کەسانە، کە خواخوایان بووە کەس نەیانناسێ، تاوانی وایان کردووە؟

چوارەم: پاراستنی خانەقین، ئێمەیان خستبووە ژێر چاودێری. بەڵکو هاوڕێیان (عەلی شامار، عیماد ئەحمەد، مامۆستا فازل، سەلام عەبدولرەزاق‌و مەلا بەختیار)یان ناچارکرد، لە گوندی مەحمود قەجەرەوە، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن، بۆیان نییە بچنە گوندێکی دیکە. خۆم لەسەر چالاکی فکری‌و سیاسی کۆمەڵە ساڵی (١٩٧٣) لە گوندی چوار کلاو، کە ئەوسا لیژنەی ناوچەی پارتی تیابوو، لەلایەن بەرپرسی پاراستنەوە (٧) رۆژ دەستبەسەر کرام‌و هەزار جنێویشی بە لینین‌و ماوتسیتۆنگ لەبەرچاوی خۆم دا، ئەگەر (کەریم بسات)و (حەربی)و (ئاغاموراد) کە سێ کادری پارتی بون‌و منیشیان خۆشدەویست، نەبونایە، وا زوو ئازاد نەدەکرام. ئینجا کە گەڕاینەوە، زمانیان لێنەداین.

لەم باسانەدا، دوو ماك شاردراوەتەوە:

- یەکەمیان: پاشماوەی ئەقڵیەتی سەردەمی (جەلالی – مەلایی)یە، بۆ خوێندنەوەی مێژوو، مێژووی ئاوەژوو. نەك مێژووی راستەقینە.
- دووەمیشیان: نوسەر، لەم کتێبەدا، بەسەدان جۆرە هەڵبەستن‌و هۆنینەوەو بوختان، دەیەوێ خوێنەر لە راستیەکان دووربخاتەوەو لایەنی کەمی هەڵە زەقەکانیش، باس نەکات‌و رەخنە لەو رابوردووە، کە خۆی بە یەکێك لە شۆڕەسوارانی دەزانێ، نەگرێ. من دەپرسم: کامیان باشە، کەسێك هەڵەکان بڵێ‌و رەخنە بگرێ، یان ئەم هەموو بوختان‌و هەڵبەستنانەی ناڕاستیەکان دابتاشێ؟!

## ١٨

# بوختانی ترسنۆكێك

لەدرێـژەی سەرگوزشـتەی گرتنـی هاوڕێیانـدا، نوسـەر درێـژە بـە بوختـانو درۆكـانی دەدات. هەنـدێ جـاریش، سـنوری لایـەنی كـەمی ڕێـز لـەخۆگرتن، دەبەزێنێ. وەكو كەسێك گوێنەداتە كەسایەتیو راسـتگۆیەتی، نەرگسـیەتەكەی دەگەیەنێتە چلەپۆپەی رق هەڵڕشتن.

دزێوترین جۆری نوسین، یان گێڕانـەوە، ئەوەیـە كـە نـەتوانی ئـەوەی دەیڵێـی، بیسەلمێنی. یان باوەڕ بە بەرامبەرەكەت بهێنی. نوسـەر، هـەر گـوێ ناداتـە ئـەم رێسایە لە نوسـینو گێڕانـەوە، بـەڵكو ئاشـكرا هەوڵـدەدات ئـەو رێسـایە پێشـێل بكاتو رێسایەكی پێچەوانەش، بچەسپێنێ.

هەركەسێك ترسنۆك بێ، زۆر مەترسیدارە، درۆزنو رقاویش بێ. كاتێـك رقو ترسو درۆ، دەبنە بنەڕەتی پێكهاتەی كەسـێك، ئـەو كەسـە، دەسـەڵاتی هـەبێ، كارەسـات دەقـەومێنێ. هیچیشـی پێنـەكرێ، راسـتیەكان دەشـێوێنێ. هـاوڕێ دەكاتە دوژمنی هاوڕێ. دەوروبـەری تێكـدەدات. گومـان دەخاتـە سـەر هـەموو كەسێك. تەنانەت لەناو ماڵو منالّی خۆشیا.

بەندە.. نوسەر بـاش دەناسـم، چـەند كەسـێك لـەناو شۆڕشـدا، بـە درۆزنـیو ترسنۆكی، بەناوبانگ بون، ئەم لەناودارەكانیان بـوو. لـەژیانیا، لـە یـەك شـەڕدا بەشداری نەكردووە، فیشـەكێكی رووبـەڕووی دوژمنـی نەتەقانـدووە، دوورونزیـك

توخنی شەڕ نەکەوتووە. تەنانەت دوو جار دوژمن پەلاماری گوندی شێنێ ی دا، کە ئەم بارەگاکەی لەو گوندە بوو، سەدان پێشمەرگە کەوتنە شەڕەوە، نە خۆی لە بارەگاکەی دەهاتەدەرەوەو نە ڕێشی دەدا براکانیشی بێنە ناو شەڕەکە.(*)

دیقەت لەم بوختانو ترسنۆکییەی نوسەر بدەن. لە لاپەڕە (٧٤)دا دەڵێ:

" یەك لە گیراوەکان پۆلی یەکەمەوە کە ناوی سەلام فەیلی بوو، گیران، ئێستاش لە شاری قەزوینی ئێران دەژی. بەداخەوە سەلام خانەقینیەکی تر بەو تۆمەتە لەلایەن حکمت محمد (مەلا بەختیار)ەوە تاوانبار کراو لەساڵی ١٩٧٩ لەلایەن مەلا بەختیارەوە تیرۆرکرا کە لەڕاستیدا بۆ مەبەستێکی تر بوو، لەکاتی خۆیدا باسی دەکەم."

لەم چوار دێڕەدا، نوسەر چەندین بوختانی هەڵبەستووە:

- سەلام فەیلی، ناوی (سەلام برزو)ە، لە قەزوین نەبووە. لە بەغداد بووە. لە یەکەمین وەجبەی گرتنی هاوڕێیانی بەغدادیشدا، خاڵی بەفێڵ تەسلیمی ئەمنی کرد.
- سەلامی خانەقینیەکە، ناوی عەبدولقادر غەفورەو ناوە پێشمەرگایەتیەکەی سەلام بووە.
- سەلامی خانەقینیەکە، بەو تومەتەی سەلامە فەیلیەکە، تاوانبار نەکراو دووروونزیك تومەتەکەیان پەیوەندیان بەیەکەوە نییە.

ئەوە سێ درۆ. وەکو تریش، با کورتە باسێکی روداوەکە بکەم، هەتا خوێنەر بزانێ نوسەر چەند بوختانچییە. وادەزانێ، ئێمەش وەکو خۆی، خۆمان لە بەرپرسیارێتی روداوەکان دەدزینەوە.

---

* لەکاتی خۆیدا باسی شەڕەکانی شێنێ دەکەم، کە نوسەر چەند بە چەواشەکراوی باسی دەکات.

کەسێك.. بەناوی (عەبدولقادر غەفور) کە خەڵکی خانەقین و هاوڕێی لاوێتیم و پێشمەرگە بوو. جارێکیان ساڵی (١٩٧٨) دەگەڕێتەوە سلێمانی و بە دوژمن دەناسرێ و دەگیرێ. دوای هەفتەیەك تەسلیم دەبێتە ئیستخبارات و گفتیان دەداتێ، بینێرنەوە ناو شۆڕش (مەلا بەختیار) بکوژێ. لەبەرامبەردا، بەڵێنی دەدەنێ: لە بەغداد خانوی بۆ بکڕن و موچەی بۆ ببڕنەوەو سەیارەشی بۆ دابین بکەن. (٨٠,٠٠٠) دیناریشی خەڵات بکەن.

ئەفسەرێکی ئیستخبارات، بە سەیارەی خۆی دەیهێنێتەوە سلێمانی و لەسەرچنار، دایدەبەزێنن. لەکاتی دابەزینیا، هاوڕێیەکی کۆمەڵە، کە دەیناسی و لەماڵی (مامۆستا ئەحمەدی) زیندان دیبوی، دەیناسێتەوەو راپۆرتی لێدەدات. ئەوکاتە کۆمیتەی سلێمانی، مامۆستا جەمال تایەر، بەرپرسیاری دەبێ. دەکەوێتە لێکۆڵینەوە لە راپۆرتەکە. دەچنە سەر سەرچاوەکەو بەوردی دەزانن سیناریۆکە لە بنەچەدا چۆن رێکخراوە،(*) دەستبەجێ، مامۆستا جەمال تایەرو مامۆستا ئەحمەدی زیندان، نامەم لەرێگەی هاوڕێیانی سەید سادقەوەو بە (کوێخا قادری کۆڵێتان)دا، بۆ دەنێرن. من ئەوکاتە لە جەولەیەکی ناوچەی (شەمێران، لاوەران، تاوگۆزی، خەرپانی، چنارو مۆردین، گریانە، شۆشمێ، هاوارو دێکۆن) دوای کارەساتی هەکاری، گەڕابومەوە بناری سورێن و لە ئەشکەوتی "هەزار ستون" (+) چاووم بە باقی هێزەکانی هەرێمی شارەزوور کەوت، کاك دلێری سەید مەجیدیش بۆ سەردان هاتبووە لام.

---

* ئەوەی دەستیشی لەم سیناریۆیە هەبوو، ماوەو پێم جوان نییە ناوی بێنم.

+ ئەشکەوتی هەزار ستون: ئەشکەوتێکە دەکەوێتە سەروی دامێنی شاخی سورێن. سەدان ستونی تیا شۆڕبۆتەوە. شوانی ئەو بنارە ئاژەڵی بۆ حەوانەوە تێدەکەن. پڕبوو لە پشقڵ و تەپاڵە. پێشمەرگە جارویار لە زستان دەچوینە ئەوێ. بەڵام حاڵێکی خراپمان بەدەستی کێچ و شەمشەمەکوێرەوە هەبوو. سەدان شەمشەمەکوێرەو بێژمار کێچی تیابوو. بەو حاڵەش ناچار لەوێ خۆمان پەنا دەدا.

کـە گەیشـتم، "سـەلام" نەگەیشـتبووەوە. نامەکـەی شـارم لەسـەر سـەلام خوێندەوە، حەپەسام. چەند رۆژێکـی پێچـوو، سـەلام لـە شـارباژێرەوە گەیشـت. لەیەکەمین سەیرکردندا، روخساریم بـەدڵ نـەبوو. بـەڵام نەشمـدەتوانی دەسـتبەجێ سزای بدەم. ئەوکاتە شەهید "کـاوە مـەخمور"ی سەردەستەکەمان بـوو. "مـەلا یاسین"ی هەڵەبجـەش (ئێسـتا لـە فەرماندەییـە) سەرپەرشـتی کاروبـاری ئیـداری دەکرد. تەنها بەو دوانەم وت:

- شەوان درەنگ حەرەسیاتی پێمەگرن.

وتیان:

- بۆ؟

وتم:

- پێتان دەڵێم.

دەوروبەری مـانگێك، بەو حاڵە ماینەوەو شەوان چاودێریان دەکرد. منیش بـۆ خەوتن، نیوەشەو، شوێنگۆڕکێم دەکرد. لەوێوە بۆ ئەرکێکی سەنگین کەوتینـەرێ بۆ دۆڵی جافایەتی.

دوای چەرمەسـەرییەکی زۆر لـە دۆڵـی جافایـەتی، کـە زیـاتر لـە (٨٠) پێشمەرگە پەیوەندیان بە ئیستخباراتەوە کردبـوو، بـۆ کوشـتنی جـەمالی عـەلی باپیر، یان هەر بەرپرسێکی دیکە، هێزێکی هاوبەش (خالە نەبەز، شەهید عـەلی ئامە خان، سەلاح چاوشین.. تاد) لەگەڵ مەفرەزەکەی شەهید جـەمال خـۆی، بـە زانیـاری تـەواوی هاورێیـانی کۆمەڵـە، لـەناو ئـەو هێـزەی پەیوەنـدیان بـە ئیستخباراتەوە کردبوو، کەوتینـە پـلان دانـانو دوای دوو رۆژ، لـە (یاخسـەمەر، چۆخماخ، مالومە، قزلەر.. تاد) لەیەك کاتـدا، بـێ تەقـە چـەکمان کـردن، ئەمـە سەرکەوتنێکی گەورە بوو.

لە دێی (هەنارانی سەروو)، کەسێکی ئەو تاقمە بەناوی (عەلی گاور) خۆیو مەفرەزەکەی هەڵکشانە شاخەکەی پشتی دێکەو لێمان بوو بە تەقە. ئێمە، مەفرەزەکانی شەهید جەمالو خاڵە نەبەزو من، لە کەوانەی دێیەوە هێرشمان بۆ دەبردنو ئەوانیش، لەسەر شاخەکەوە، بەرگەیان نەدەگرتو هەڵدەهاتن. چەکدارێکی ناو ئێمە، کە لە مەفرەزەی مامۆستا شەهید (غەفور ماوەتی) بوو، بەناوی (عوسە گوێ پان) تومەزە برادەری گیانی بەگیانی (عەلی گاور)ە. عەلی گاور، کەسایەتیەکی ناوچەی دۆڵەڕوت بوو. لە شۆڕشی ئەیلولدا سەرلق بوو. بەهۆی (سەعدون)ی خوشکەزایەوە، کە پێشمەرگەی یەکێتی بوو، دووجار چوبومەماڵیو لەماڵی خۆیدا، پیاوێکی جوامێر بوو. پێشم سەیر بوو، لەوجۆرە پەیوەندیەی بە رژێمەوە کردووە. بەڵکو پێشم ناخۆش بوو. بەهەرحاڵ (عوسە گوێ پان) لەخوارەوە، لەلای ئێمەوە، بە دزە دزەو شارەزایی خۆی، خۆی دەگەیەنێتە (عەلی گاور)ی هاوڕێی. لەوێ، برێك تەقە لە ئێمە دەکات. ئێمەش بە پارێز بەدەم تەقەوە، بۆیان هەڵدەکشاین. تومەزە لەکاتی تەقەکردنەکاندا (عوسە گوێ پان)ەکەی خۆمان لای ئەوان قاچی دەئەنگێورێ (دەپێکرێ)، بە شەلە شەل، دەبێتە بار بەسەر ئەواندا. بەدەم هەڵگرتنیەوە کە بیگەیەننە سەری شاخو بەدیوی ئەودیوی زنجیرە شاخی دامێنە چەپی پیرەمەگروندا، دەربازی بکەن، عوسە بە (عەلی گاور) دەڵێ: عەلی هاوڕێم، بەخوا ئێستا لای ئەوان بوم، غیرەتم زۆر بوو، کەچی ئەوەتەی خۆم گەیاندۆتە ئێوە، غیرەتم لەبەر بڕاوە.

ئەم کورتە چیرۆکەی دوو هاوڕێ، دەیسەلمێنێ کە دڵسۆزێتی هاوڕێیەتیش، گەر نەبەسترێتەوە بە خەباتو کێشەیەکی رەواوە، مرۆڤ لە ناخی خۆیا دادەرزێنێ. بەڵام بەرواڵەت، دڵسۆزیەکە دەمێنێ.

با بۆ ئاخر جاریش خێری (سەلام)ی کۆچکردوو بنوسرێ، کە بەناچاری، ئەو یادگاریانەی خستە ناو ئەم وەڵامدانەوەیە.

بەڵێ.. لەو چەك داماڵینەی ئەو تاقمە،(*) دەوروبەری (٣٥) چەكمان دەستكەوت. ئەمە جگەلەوەی ناوچەكە، كەوتەوە ژێر كۆنترۆڵی تەواوی یەكێتی. ئەمەش هەر زۆر گرنگ بوو. بۆ:

دۆڵی جافایەتی، یەكێك لە گرنگترین ناوچە عەسكەریەكانی شۆڕش‌و یەكێتی بوو. ئەم ناوچەیەو دێهاتەكانی، لەناوەڕاستی زنجیرەیەك شاخی سەخت‌و سەركەشدا، هەر دەڵێی، بۆ شۆڕش‌و بەرگری هەڵكەوتووە. زنجیرە چیاكانی (ژیلوان، ئاسنگەران، پیربایز، حەسەن بەگ، كلكەرێوی، گۆجاڕ، بەرۆژ، شاخەسور، بەیۆ، دوتوێ، تەوێنی هەرزنەرێ، پیركە، كەڵكی قزلەر، قۆڵی مالومە، كوڕكوڕ) شورەیەكی سروشتی كەمهاوتان. خەڵكەكەشی هەتا بڵێی جوامێرو بێوەی، بە كاسبیەكی كەم‌و كشتوكاڵ‌و مەڕداری، هەندێكیشیان ئەوكاتە بە خەڵوز كردن، ژیانیان دەگوزەراند. جادەی گڵ، لەناو هەموو دێهاتەكاندا چەند مەكتەبێكی قوڕ هەبوو. تاك‌و تەرا بنكەی تەندروستی دروستكرابوو. راستە ناوچەكە دۆڵی جافایەتی بوو، بەڵام هەستی جافایەتی وەكو شارەزورو گەرمیان، لێرەدا، بەهێزنەبوو. تەنانەت سەرەك عەشرەتێكی گەورەشیان تیانەبوو. بەڵكو بنەماڵەی شێخانی حەفید زۆرتر نفوزیان لەم ناوچەیە هەبوو. ئەم خەڵكە لەم ناوچە سەختە، سەدان ساڵ بوو لەوێ ژیابون. چەند دێیەكی ناوی توركی بوو (چۆخماخ- یاخسەمەر) قزلەریش لەكۆتایی دۆڵەڕوتدا هەبوو. ئەم ناوانە هی زەمانی عوسمانین.

یەكێتی، كە مەفرەزە سەرەتاییەكانی شۆڕشی نوێی پێكەوەنا، دوای ئەوەی مەفرەزەكانی ناوچەی حاجی ئۆمەران‌و قەندیل، لە ٢٧/ی مایسی ١٩٧٦ بە رابەرایەتی حاجی شێخەی بنزیری (لێپرسراوی یەكێتی لە ناوچەی حاجی

* پێم خۆش نییە ناوی هیچیان بنوسم. چونكە دڵنیام كەسوكاریان ئازاردەدا.

تۆمـــەرانو باڵەکایـــەتی) لەهەمانکاتـــدا، لـــەو مانگـــەدا، لەناوچـــەکانی مەنگوڕایەتی، پێنجوێن، ڕۆستو هەندێك دەستەو تـاقمی چـەکداری تـر دایانـە شاخ دژی ڕاگوێزرانو گرتنو ئازاردان. (+) یەکێتی یەکەمین ناوچـە لـە پارێزگـای سلێمانی، بیری لێکردەوە، مەفرەزەی تیا دروست بکات، ناوچەی جافایەتی بـوو. کاك (سالار عـەزیز)یش، لەگەڵ شەهید (جەمالی عـەلی بـاپیر) و (تایـەری شـێخ سدیق) لە ۱۹/تەموزی ۱۹۷٦ یەکسەر بۆ لای (عەبـدولقادر هەڵـەدنی)و چـەند هاوڕێـیەکی کۆمـەڵە، نێردرانە گوندی هەڵەدنو لەوێش، یەکەمین بنکەی نهێنیـان لە ئەشکەوتی (مادین) (*) دانا.

" لە ۸/ی ئابی ۱۹۷٦ شەهیدان: خالید سەعید، سـەعدی گچـکە، عومـەر مستەفا، عەلی عـەسکەری، تایەری عـەلی والی، سەید کاکە، شوێنەکانی خۆیان بەنهێنی بەجێهێشتو بەرەو کوردستان کەوتنەڕێو بڕیارياندا هەنـدێکیان بچـنە سـلێمانیو هەنـدێکی تریـان بچـنە چـیای قەنـدیل. دوای دە ڕۆژ لـە ۱۸/ئـاب، شەهید عەلی عەسکەری، شەهید تایەری عەلی والیو شەهید ئەحـمـەد چـەقۆیو شـەهید بایـەر ئەحـمـەد، لەگـەڵ سـەلاح چاوشـینو زێـڕۆ عەبـدوڵلاو چـەندین پێشمەرگەی تر لە تەنگی مادین، یەکیانگرتەوە و کەوتنە کارو فرمان." (**)

هەفتەیـەك دوای یـەکگرتنی پێشـمەرگەکان، دەسـتەیەکی مـەفرەزە بـە رابەرایەتی شەهید جەمالی عەلی باپیر، یەکەمین چالاکی پێشمەرگانەیان نوانـدو لە سەنگەری دوژمن لە بایزاوا (چوارتا)ی دا. (++)

---

+ هەواڵنامەی شۆڕش، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، مایسی ۱۹۷۸، پوختەی ڕوداوەکان (۲۳/۵/۱۹۷٦ – ۱۳/٤/۱۹۷۸)، لاپەڕە (۱۵).

* هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (۲٦).

** هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (۲۷).

++ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە. لە هەواڵنامەکەدا، ناوی شەهید جەمال نەهاتووە، بەڵام من دەزانم یەکەمین چالاکی ئەو بووە.

ئیتر لەوساوە، ئەم ناوچەیە، لەچوارچێوەی ستراتیژی عەسکەری ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان بۆ یەکێتی، وەکو ناوچەیەکی پشت پێبەستراوی جوگرافی، چەسپێندرا. بەتایبەتی ناوچەکە، نەك هەر بۆ پێشمەرگە، بەڵکو بۆ سەرکردایەتی‌و پەیوەندییپێوەکردنی سلێمانی‌و شارەکانی ترو هێزەکانی پێشمەرگە لە قەرەداغ، دوکان، بازیان، گەرمیان، شارباژێر، مەرگە، ناوچەیەکی ستراتیژی بوو. بۆیە ئیتر قابیلی قبوڵ نەبوو، هێزو لای دیکە، لەم ناوچەیەدا، بیەوێ خۆی بسەپێنێ‌و بە هێز شوێن بە یەکێتی لێژ بکات.

شەڕوشۆڕشیش وایە، ناوچەیەك دەبێتە پێگەی ستراتیژی. ئیتر هەموو تواناو قوربانیەك دەخرێتە خزمەتی ئەو ناوچەیە. زۆرجار لە مێژووی شۆڕشەکاندا، هەروەها لە مێژووی جەنگی وڵاتانیشدا، ناوچەی ستراتیژی، شەڕی قورس‌و جاری واش هەیە، شەڕی چارەنوسسازی لەسەر دەکرێ. جەنگی (علمین) لەنێوان بریتانیای مەزن‌و ئەڵمانیادا، بەسەرۆکایەتی گەورەترین دوو جەنەراڵی جەنگی دووەمی جیهان (مۆنتگمری- بریتانیا) (رۆمل- ئەڵمانیا) رویدا. هاوکێشەی جەنگ بۆ دەستبەسەراگرتنی ئەفریقیاو خۆرئاوای عەرەبی‌و رێڕەوی دەریاو میسر، وایکرد، ئەو بیابانە ببێتە شەڕگەیەکی چارەنوسساز، دوای جەنگ، ئێستاش ناوچەکە، بایەخێکی ئەوتۆی پەیدانەکردووە. لەکوردستانیشدا، نمونە زۆرن:

- ناوچەی هەکاری.. بنکەی ستراتیژی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بوو.
- شاخی ئارارات.. بنکەی ستراتیژی راپەڕینی دەرسیم بوو.
- جەزیرەو بۆتان.. ناوچەی ستراتیژی میری بۆتان بوو.
- شارباژێڕ.. ناوچەی ستراتیژی بەرەنگاری شێخ مەحمود بوو.
- سۆماو برادۆست.. پایەی بنەڕەتی سمکۆی شکاك بوو.

- ناوچەی بارزان.. بنەمای ڕاپەڕینی بارزانیەکان بوو.
- حەوزی ڕواندوز، زۆزك، حەسەن بەگ، گرد مەندیل، هەڵگورد، قەندیل، حاجی هۆمەرانو هندرێن، لە ناوچەو چیا هەرە گرنگەکانی شۆڕشی ئەیلول بون.

## ١٩

## نوسەرو شەهید ئازاد هەورامی

لەدرێژەی سەرگوزشتەکانیدا، نوسەر لە لاپەڕە (٧٦)دا دەنوسێ:

" ئیحسان لە ڕۆژی ١٩٧٥/١١/٢٨ گەیشتەوە سلێمانی و دەس بەکار بوو لە کۆمیتەی شارەکاندا. شەهید ئازاد عبدولمەجید (ئازاد هەورامی) بێ ئەوەی ئاگاداری کۆمیتەی شارەکان بکا، خۆی وونکرد و تەنانەت شوێنی حەشارگەکەی خۆی لای کەسمان ئاشکرا نەکرد بوو، تا شالآوی گرتن دامرکایەوە، ئەوسا زانیمان کە لە شاری کۆیە لای خوالێخۆشبووی برای خۆی حەشارداوە کەناوی مامۆستا (هۆشەنگ) بوو، مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە بوو. شەهید ئازاد نەگەڕایەوە بۆ کۆمیتەی شارەکان، پاشان لە مانگی ١٩٧٦/١ شەهید ئارام (شاسوار جەلال) پەیوەندی پێوە کرد بوو، قایلی کرد بوو، کە لە کۆمیتەی هەرێمەکان کار بکات."

لەوەلآمدا دەڵێم: بەدوری نازانم نوسەریش پەیوەندی بە (ئیحسان-ئەبو شەهاب)وە بوبێ، بەلآم:

یەکەم: ئەبو شەهاب؛ هەتا دەوروبەری هاوینی (١٩٧٦) هەر لە بەغداد مایەوەو لە گەڕەکی مەیدان، لە هەمان ئەپارتمان کە شەهید (کاردۆ گەلآڵی) ژوری تیا گرتبوو، ئەبو شەهابیش ژوری بەکرێ گرتبوو.

دووەم: ئەبو شەهاب؛ لە بەغداوە، هەوڵی دابوو پەیوەندی بە مام جەلالەوە بکات، نامەیشی پێگەیاندبوو، یەکەمین جاریش نامیلکەی (الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟) دەست ئەبو شەهاب کەوتبوو، لەڕێی شەهید ئازاد گەیاندیە (کۆمیتەی هەرێمەکان)و شەهید ئارامیش بۆ سەر زمانی کوردی وەریگێڕا.

سێهەم: ناوبراو، بەردەوام پەیوەندی بە شەهید ئازاد هەورامیەوە هەبوو، هەر شەهید ئازادیش، بۆئەوەی ئەبو شەهاب بتوانێ کرێی ژورەکەی بداتو بە کولەمەرگی بژی، مانگانە (٨ دینار)ی لە پیتاکو ئابونەی ئەندامان دەدایە ئەبو شەهاب.

چوارەم: دوای ئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان جڵەوی رێکخستنی گرتەوە دەستو خۆی بۆ شۆڕش ئامادە دەکرد، ئەبو شەهاب گەڕایەوە کوردستانو سلێمانیو لەگەڵ مەفرەزەکەی شارباژێریش نێردرایە دەرەوە. خۆم، جارێك لە بەغدادو جارێك لە سلێمانیش، لەو ماوەیەی باسم کرد، ئەبو شەهابم دیووە.

سەبارەت بە شەهید ئازاد هەورامی. نوسەر، بەم نوسینانەشی دیارە، کە چەند رقی لێیەتی. دەیان جار ناوی دێنێ، یان بە عێراقچی ناوی دەبات، یان بە لاوەکی باسی دەکات. لەوە زیاتری پێنەکراوە، ئەگینا رقی زیاتریشی پێدەڕشت.

جارێ.. ئازاد هەورامی، کەسێکی ئازا بوو: ئازا لە خەباتی ژێرزەمینی. لە دەربڕینی بیروڕا. لە شەڕدا. باوەڕ ناکەم، بەوشێوە باسکردنەی نوسەر، کەسایەتی شەهید تۆزقاڵێك کەمبکاتەوە. بەڵکو بە باسکردنەکەی منیش گەورە نابێ. ئازاد خۆی گەورەیە، لوتکەیەکی جوان بوو.. ئازاد کاریزمای رەوشتی هەبوو، بۆیە نەگبەتی نوسەر لەوەدایە، لە دامێنی چیایەکی بەرزەوە،

ئیرەیی بە لوتکەکەی دەبات‌و دەیەوێ بە تەمی رقی، لوتکەکە داپۆشێ. بەلاّم.. لوتکە لوتکەیە. تەمیش تەم!

دەیەوێ، وای پشانبدات کە گوایە ئازاد هەورامی (بێ ئاگاداری کۆمیتەی شارەکان)ی لەمەڕ نوسەر (خۆی ونکرد) ئەمەی زۆر پێناخۆشە نوسەر، بۆئەوەی تەواو ئازاد هەورامیش تاوانبار بکات، دەڵێ: (تەنانەت شوێنی حەشارگەکەی لای کەسمان ئاشکرا نەکردبوو).

زنجیرەیەك، لە چەند ئەڵقەی سەیرو سەمەرەی دژی شەهید ئازاد هۆنیوەتەوە، هەتا خۆی بە قارەمانی هەڵسوڕێنەری رێکخستن پشان بدات‌و ئەویش بە هەڵهاتوو، بەڵکو ترسنۆکیش.

لەوەلاّمدا دەڵێم: لەناو رێکخراوێکدا، شوێنی خۆشاردنەوەی دیاری نەکردبێ؛ سەرکردایەتیەکەی بەرەو دەرەوە رۆشتبێ؛ شالاّوی پەیتا پەیتا گرتنی لەسەربێ؛ برایم جەلالیش، بەو ئەقلّیەتە خۆی بە سکرتێری کۆمەڵە، زانیبێ، ئایە ئیتر ئازاد هەورامی خراپی کردووە، پشتی بە خۆی بەستوەو لەماڵی برایەکیا، خۆی پەنا داوە! ئەمە چ پەشمێکی تیایە؟ وەکو تریش، ئەوکاتە بڕیاری سەرکردایەتی کۆمەڵەش بوو ماوەیەك کادرە زەقەکانی کۆمەڵە، خۆیان بشارنەوە. با ئەمانە هەموو وازلێبێنین‌و بێینە سەر بیروڕای شەهید ئازاد.

باوەڕناکەم، کەس لە مـن، لەناو شۆڕش‌و خەباتی ژێرزەمینیدا، لە ئازاد هەورامی نزیکتر بوبێ. قسەی ناخی خۆمان بۆ یەك دەگێڕایەوە. ئازادم ناوەڕاستی مانگی (٩) لە کەرکوك لەگەڵ هاوڕێ (سەلام چاوشین) دیووە. رێکخستن تازە بەر هەڵمەتی گرتن کەوتبوو. مێش میوانی نەبوو. دوو رۆژ لەسەریەك یەکمان دەبینی، بەقسەی خۆش‌و قسە خۆشەکانی (سامی سەرپان)ی برای، بردمانەسەر. دەچوینە سینەما، چێشتخانە، ماڵیان، بازاڕ، کتێبخانە.. تاد. دوایی کە هاتمە سلێمانی‌و رێکخستن شیرازەی پسابوو، ئیتر کەوتینە کار بۆ

گرتنەوەی ڕێکخستن. من کاك سالارم بینی. پاشان چومە کەرکوك لە مانگی (١١) ی ١٩٧٥ شەهید ئازادم هەر لەماڵی خۆیان بینی. پێکیشەوە چوینە هەولێرو شەهید عەبدولرەزاقیشمان بینی، هەرسێکمان سەرەتای مانگی (١٢)ی ١٩٧٦ لە سلێمانیو لە سابونکەرانو چایخانەکەی (عەریف عەلی) دیسان یەکمان بینی. بەردەوام ئازاد هەورامی لە کەرکوكو سلێمانیدا، دەژیا. کە دڵنیابوو ڕێکخستنمان پێدەگیرێتەوەو شەهید ئارام بڕیاری لێبڕاوی داوە، لەگەڵماندا کاربکات، هەموو توانای خۆی خستەکار و شەو و ڕۆژی نەدەزانی بۆ خەبات. لەمەوە، قسەی دڵی خۆی بۆ کردم. دەیگوت:

کە سەرکردایەتی ڕۆیشتنو چارەنوسیان گەیشتە زیندان، من ڕەشبینی دایگرتم. ئیتر گرتنو مردنم لا ئاسایی بوو. چونکە من هیوایەکی گەورەم لەسەر کۆمەڵە هەڵچنیبوو. کەچی، بەیەکەمین هەڵمەت ئاوای بەسەر هات. بەخەفەتەوە ئەو قسانەی دەکرد. فرمێسکم لەچاو بە قەتیسماوی دیووە، کە بیروڕای خۆی لەوبارەوە دەردەبڕی.

یەکە یەکە باسی ئەو کۆمیتەیەی بۆ دەکردم، کە دوای ڕۆشتنی سەرکردایەتی، پێکهێنرابوو. بە نائومێدیەوە باسی دەکردن. دەیوت ئەندامەکانی هیچیان پێناکرێ. سەریان لێشێواوە. دوانیان پێکەوە ناگونجێن. دەیگوت: ئەوەندە خەفەت چۆتە ناخم، لەماڵی خۆمان دانیشتوم، چاوەڕێی گرتنم دەکرد. هەموو جارێك کە لە دەرگامان دەدرا، وامدەزانی بۆ گرتنم هاتون.

کەسێکی ناسك بوو. قسەکانی لەناخەوەو بەوپەڕی ڕاستگۆیانە دەکرد. ڕقی لە کەسیش نەبوو. بەڵکو ئەندامانی کۆمیتەکەی خۆشدەویستو ڕێزیشی دەگرتن. بەڵام دەیزانی سەرکردایەتی کۆمەڵەیان پێناکرێ. تەنها پشتی بە شەهید عەبدولرەزاق دەبەستو دەیوت: - کاری پێدەکرێ. یەك دوو هاوڕێی

لەوانە پشاندامو لەگەڵیاندا کۆبومەوە، کەسانی زۆر دڵسۆزو خۆڕاگر بون، بەڵام ئاستی سیاسیان کەمو هیچیشیان لە مەسەلەی تیۆری نەدەزانی (هەتا ئێستاش هیچی لێنازانن)، کە بینیمن، تێگەیشتم بۆچی ئازاد، وا بێتاقە.

کە باسی شەهید ئارامو کاك سالارو هەوڵەکانم بۆ کرد، وتی: گەر بزانم لە یەکەمین کۆبونەوەدا دەگیرێمو تیادەچم، دێم. بەڵکو هەرچی چۆنێ بووە، شتێك بۆ کۆمەڵە بکەین. لە یەکەمین کۆبونەوەشدا، کە شەهید ئارامی بینی، سەرەڕای ئەوەی هەندێك بۆچونی کاك ئارامی نەدەسەلماند، بگرە وەڵامیشی دەدایەوە، بەڵام ئومێدێکی زۆری بە شەهید ئارام پەیداکردو زووش بون بە هاوڕێی یەکتر. ئیتر نازانم، ئەو قسانەی لەسەر شەهید ئازاد، لەکوێ هێناوە. بەڕاستی پێم سەیرە. ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەرکەکانی کۆمەڵە سەختتر بون. چاودێری ڕژێم لەسەر کۆمەڵە زیاتر بوو، هەرگیز دڵەڕاوکێیەکم لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان، لە ئازاد هەورامی نەدی. ئیتر نازانم نوسەر، بۆچی ناتوانێ جڵەوی ڕقو تۆڵەسەندنەوەی تەنانەت بەرامبەر شەهید ئازادیش، بگرێ؟

لەبەرئەوەی لە چەندین شوێنی دیکە، باسی شەهید ئازاد هەورامی دەکاتەوە، لێرەدا واز لە ڕونکردنەوەکە دێنم، لەشوێنی دیکە، ڕووی دیکەی ئەم ڕقە باس دەکەمەوە.

## ٢٠

## کام بەیانو کام تایپو رۆنیۆ ؟!

بۆئـەوەی بیخاتـە مێشـکی خوێنـەر کـە کۆمیتەیـەکی ڕێکخسـتنی بـەهێز هـەبووەو بـە راسـپاردەی سـەرکردایەتی کۆمەڵـەش، کەوتونەتـە ڕاپەڕانـدنی ئەرکەکانیان، تانو پۆی روداوەکان بەچەشنێ دەچـنێتەوە، خوێنـەرێك ئاگـای لـە بەسەرهاتەکان نەبێ، باوەڕی پێدەکات. بڕوانن لە لاپەڕە (٧٧) دەفەرموێ چی؟:

" ئەوەی کە بەلامانەوە گرنگ بوو، ئەو تایپ و رۆنیـۆ سـەرەتاییە بـوو، کـە لای هاوڕێ دلێر بوو. یەکەم کارێ کـە لەسـەردەمی ئـەو شـاڵاوانەی رژێـم پـاش دۆزینەوەی تایپ و رۆنیۆکە ئەنجامانـدا، بـەیانێك بـوو، کـە لـە ١٩٧٥/١٢/٢٧ لەسەر بارو دۆخەکە دەرکرا."

جارێ.. لەوکاتـەدا، کۆمەڵـە هـیچ بـەیانێکی دەرنـەکرد. تایـپو رۆنیۆشـمان نەخرابوونەگەڕ! دڵنیام یەك ئەنـدامی ئەوسـای کۆمەڵـە شـایەتی بـۆ نـادات کـە بەیاننامـەیەك لەوشێوەیە دەرکرابێ. ئەمە یـەك. دووەمیـان، ئەوکاتـە، کۆمەڵـە بەیاننامەی بەمانای بەیاننامە دەرنەدەکرد. ساڵی جارێك دوو جار، ڕێنـوێنی بـۆ ریزەکان دەردەکرا. ئەویش بە تایپ، نەك بە رۆنیۆ راکێشراو. هەتا دامەزرانـدنی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان لە (١٩٧٦/٤/٢٦) کـە بـەدزیو لـە دائـیرەی کشتوکاڵی سلێمانی، بەڕێوەبەرەکەی کاك (مەسعود محەمەد سەعید)و حەرەسـی شەوانەشی کـاك (یـونس غـەفور) بـوو، بـەدزی، مـنو سـوارەی ئەحمـەد عـارف

(ئێستا له ئەڵمانیا – مانهایم)ه، شەوی ٢٠/٢١ نیسانی ١٩٧٦ هەتا بەیانی بەیانەکەمان چاپ کرد. تا ئەوکاتەش، کۆمەڵە بەیاننامەی ئاشکرای دەرنەکردبوو. دوای ئەو مێژووەش کە نوسەر باسی دەکات (١٩٧٥/١٢/٢٧) بە چوار رۆژ (١٩٧٥/١٢/٣١) ناخۆشترین رووداو رویدا، کە هەموو کۆمەڵەی تەزاند، تەسلیمکردنەوەی خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی بوو. کۆمەڵە نە تایپ‌و نە رۆنیۆی نەبوو، بەیاننامەیەك بەو بۆنەیەوە دەربکات، تەنانەت بۆ ناو خۆیشی. دوای دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکان، لەرێگەی شەهید جەمالە رەشەوەو ئەویش لەرێگەی خزمێکیەوە کاك (حەمەرەشیدی ئەندازیار- ئێستاش لە وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە)یە. شەهید جەمال، بە راسپاردەی شەهید شیهاب، کە لە سەیدسادق، دوای رێکەوتنامەی جەزائیر چەند رۆژێك پێکەوەدەبن، تایپێك لە گوندی حاجی مامەند دەشارێتەوەو حەمەڕەشید ئازایانە، هەر بەئاشکرا، خستبویە تاقە پیکاپی ئەوکاتە کە لەنێوان گوندەکانی حاجی مامەندو دەوروبەری، هاتوچۆی دەکردو لەناو بەرچنە ترێ شاردبویەوەو گەیاندیە دەستمان. کە بۆرە تایپی (برازەر)مان دەستکەوت، دەتگوت گەنجینەیەکمان دەستکەوتووە. ئەمە تاقە تایپی شاردراوەی کۆمەڵە بوو، هەتا ئەوکاتە دەستمان کەوتبێ.

دڵنیام، ئەگەر تایپ‌و رۆنیۆ، دەست نوسەر کەوتبێ‌و توانیبێتی بەیاننامە بنوسێ‌و چاپ‌و بڵاوبکاتەوە، گومانم نییە، ئەو هەموو رقەی لە (کۆمیتەی هەرێمەکان)و شەهید شاسوار هەیبووە بەیانێك دوانیشی پیا دەکێشاین. یان هیچ نەبێ، بڵاوکراوەیەکی دەردەکرد هەتا بڵێ، شەرعیەت لای (کۆمیتەی شارەکان)ە، نەك لای (کۆمیتەی هەرێمەکان). کە بەیاننامەی لەمبارەوە دەرنەکردبێ، بەیاننامەکەی تریشی راست نییە.

لەدرێژەی مێژووە خەیاڵیەکەی نوسەردا، لەهەمان لاپەڕەو پەرەگرافی لاپەڕە (٧٧) دا، دەنوسێ:

" بەتایبەت ئاماژەکردن بۆ پلانی رژێم لە مەڕ چۆڵکردنو سوتاندن و تەختکردنی گوندە سنوریەکان بە قولایی ٢٠ کیلۆمەترو بەندکردنی دانیشتوانیان لە ئۆردوگا زۆرەملێ تەڵبەندکراوەکاندا."

سەبارەت بە چۆڵکردنی بەشێکی دێهاتی خانەقین هەتا مەندەلی ناوچەی تری سنوری، ئەمەیان (ئەشهەدو!) راستە.

بەلام لە هەموو شوێنێك ئەم سیاسەتە نەدەسەپێنرا، هەتا شۆڕش دەستیپێکرد. خوێنەر بیری نەچێ لەو مێژووەی نوسەر (مانیفێستەکەی) دەرکردووە (١٩٧٥/١٢/٢٧) هێشتا شۆڕش دەستیپێنەکردبوو. ئەمەیان لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە، هەتا ساڵی (١٩٧٨) رێك سێ ساڵ دوای دەرکردنی ئەو بەیاننامەیەی لەمەڕ نوسەر، تەهجیرو تەرحیلی دێهات بەفراوانی دەستیپێکردو سنورەکان بەقولایی (٢٠ کم) چۆلکران، ئەویش تەنها دێهاتی کوردنشین لە کوردستاندا. دێهات هەبون لە سنوری (موسڵ – سوریا)و خانەقین – ئێرانو مەندەلی – ئێران، عەرەب بونو دەرنەدەکران. سەبارەت بە ئۆردوگای زۆرەملێش، دیسان لە (١٩٧٨)وە بەزۆری دروستدەکرانو جوتیارانی تیا کۆدەکرانەوە. ئەو پاشو پێشخستنەو زانیاریە هەلانە، هەموو بۆ ئەوەیە کە بڵێ: کۆمیتەی شارەکان، شۆڕشگێڕو لە گیانی بەرەنگاریو بەیاننامە دەرکردن، دەستپێشخەر بوو.. تاد.

کێشەی نوسەر لەوەدایە، دوای خەیاڵی خۆی دەکەوێتو ئیتر خەیاڵی بەجۆرێ مەست دەبێ، بەم گێڕانەوانەی کە دڵی پێی خۆشە، خۆیشی باوەڕ بە رواداوە هەڵبەستراوەکانی خۆی دەکاتو لێی دەبنە راستی. گەر وا نەبێ، ئاخر چ

مەعقولیـەتێکی تیایـە، روداوەکـان کـە لـەناو ئـەم نەوەیـەی ئێمـە رویانـداوە. هـەزاران شـایەتیان لەسـەرە. سـەدان بەیاننامـەی شۆڕشـیان لەسـەر دەرچـووە، سەبارەت بە تەرحیلو تەهجیر، ئـەم دێـت مێژووەکـەی دەگـۆڕێو هەڵیـدەگێڕێ، هەتا لە چوارچێوەی بەیاننامە خەیاڵیەکەی (کۆمیتەی شارەکان)ی لەمەڕ خـۆی، بیانگونجێنێ. ئەم جـۆرە خـەیاڵ فڕینـە، لێـی بۆتـە بەڵایـەکی گـەورەو سـەراپای بیرکردنەوەی داگیرکردووە.

## ٢١

# کۆمیتەی هەرێمەکانو ماکی رق

چیرۆکی "کۆمیتەی هەرێمەکان" لەمێژووی یەکێتیو کۆمەڵەدا، زۆرترین باسو رەخنەو هەواڵی لەسەر بڵاوکراوەتەوە. بێگومان بەشێکی ئەو دەنگوباسانە، لە کینەو کاردانەوەو کەمی زانیاریەوە، بون. لەباری دەرونیشەوە، ناتوانم بڵێم: ئیرەیی بە سەرکەوتنەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان نەبراوە، دوای ئەوەی سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە، دوچاری روداوە نالەبارەکان بون، یان بەهەڵە خۆیان توش کرد. هەڵبەتە ناشتوانرێ سەرلەبەری سیاسەتو بریارەکانی کۆمیتەی هەرێمەکانیش بە راستو دروست بزانرێ.

کۆمیتەی هەرێمەکان، دوای ئەوەی شیرازەی رێکخستن پچڕاو پەرشوبڵاوی کەوتە رێکخستنەکانی کۆمەڵەوە؛ بەتایبەتی سەرکردایەتی کۆمەڵە ملی رێی هاتونەهاتیان گرتبووەبەرو چارەنوسیان کەوتبووە قورگی نەهەنگەوە، کادرە خۆشاردوەکانی کۆمەڵە، لە دۆخێکی زۆر نالەباردا بون.

رێکخستنێکی بەر شاڵاوکەوتو، دەیان هاورێی گیراون. سەرکردایەتیەکەی لەئێراندا گیرابن. سەرپەرشتیاری نەماوە. بەیانو رێنوێنیەکی نییە. حەشارگەو لایەنی کەمی توانای بەرێوەبردنی هاورێکانی دابین نەکراوە. لەناو خۆشیا، بەهۆی کێشمەکێشەکانی سەرەتای کۆمەڵەوە، ناکۆکیەکانی بەرگریکردنو بەرگرینەکردنەوە لەکاتی هەرەسی (١٩٧٥)دا. ئینجا پەسەندکردنی تێزی سێجیهانو ئایە بەعس ناکۆکی سەرەکییە یان ئیمپریالیزمو ئیمپریالیزمی

ریڤیژنیستی؛ ئەم هەموو لێقەومانو روداوە نالەبارانە، بیری جیاوازو ململانێی ناوەخت، لەسەر کۆمەڵە کەڵەکە بونو کۆمەڵەش، بێسەرو سەوداسەر، کەوتبووە ناوانەوە. لەوکاتەدا، گرتنەوەی شیرازەی رێکخستنو هاورێیانی کۆمەڵەو بەخشینی ئومێدێك بە گەلەکەمان، ئەرکی سەرەکی کۆمەڵە بوو. هەر لایەك ئەم ئەرکەی راپەراندبا، شەرەفێکی مێژوویی گەورەی بۆ کۆمەڵە لەو هەلومەرجەدا، تۆماردەکرد. ئەمە مەسەلەی تیۆریو فەلسەفییو ناکۆکی ئایدیۆلۆژی نەبوو. مەلەسەکەش ئەوە نەبوو، کێ رابەرەو چ لایەك سەرکردایەتیە. مەسەلەکە تەنها ئەوە بوو چ کۆمیتەیەك دەتوانێ لەو بارە نالەبارەدا، لەو بێپەناو پەسێوەدا، لەو دڵەراوکێیەی گیرانو راوەدوونانەدا، لەژێر ئەو تەمە رەشو رەشبینیەدا، چ کۆمیتەیەكو چ کەسانێك دەتوانن دەستی کۆمەڵە بگرنو تروسکاییەکی لەو تونێلە داخراوەدا، پێ پشانبدەن. ئەگەر بەوردی بگەرێینەوە بۆ رابوردوو، ئەگەر راستیەکانی مێژوو، ببەینەوە ناو رێرەوی رۆژگاری خۆیان، راستیەکان ئاشکران. بەڵام بشویسترێ روداوەکان چەواشە بکرێنو بەسەرهاتەکان بشێوێندرێ، ئەمەیان مەسەلەیەکی دیکەیە.

گریمان.. "کۆمیتەی شارەکان" کە وەکو کاکی نوسەر لە لاپەرە (٧٥)دا دەڵێ، بەدەستپێشخەری خۆیو بە ئەندامێتی (شەهید عەبدولرەزاق، حەمیدی گومرگ، ئەحمەد کرێکار، ئەبو شەهابو شەهید ئازاد هەورامی) پێکهاتووە. بابە دەستی نوسەرو ئەو هاورێیانە خۆشبێ. بەڵام پێویستە پرسیارێکی گرنگیش بکەین. ئەویش ئەوەیە:

دەی بۆچی ئەم کۆمیتەیەی کە لە مانگی ئەیلولی (١٩٧٥) دامەزرێنراوە، هەتا مانگی (١٢)ی هەمان ساڵ، کە بەتەواوەتی کۆمیتەی هەرێمەکان کەوتۆتەگەڕ، بۆچی کۆمیتەی ناوبراو نەیتوانی ئەرکەکانی راپەرێنێو کارێکی ئەوتۆ بکات، تەواوی هاورێیان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیو متمانەیان لەناودا

دروست بکات؟ خۆ کاتی هەبوو. خۆ پەیوەندی بە رێکخستنەکانەوە هەبوو. خۆ بەحساب لەلایەن سەرکردایەتی کۆمەڵەشەوە، شەرعیەتیان هەبووە. خۆ هاورێیانی شارەکانیان ناسیووە. خۆ تایپو رۆنیۆشیان هەبووە. ئەی بۆچی سەرنەکەوتون؟ بۆچی نەیانتوانی متمانەی هاورێیانو رێکخستنەکان وەربگرن؟ بۆچی کارێکی ئەوتۆیان نەکردبوو، هیچ کەسێك دوورونزیك بیر لە دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکان، یان هەر کۆمیتەیەکی دیکە نەکاتەوە؟

ئەگەر کۆمیتەی شارەکان، سەرکەوتوو بونایە، چۆن چۆنی کەسێکی وەکو شەهید ئازاد هەورامی جێیدەهێشتو دەچووە کۆیە؟ هەروەکو نوسەر لە لاپەرە (٧٦) باسی دەکات، ئەویش دوای پێکهێنانی کۆمیتەکەیان. یان چۆنچۆنی شەهید عەبدولرەزاق خۆی دووردەخستەوەو لەهەولێر دەگیرسایەوە.

ئەگەر کۆمیتەی ناوبراو، جێی خۆی لە رێکخستنەکاندا گرتبێ، چۆن چۆنی شەهید ئازادو شەهید عەبدولرەزاق، کە بەرپرسیاری کەرکوك‌و هەولێر بون، بە یەك چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا بەختیار)دا، رازی دەبون بێنە ناو کۆمیتەی هەرێمەکانو ئەرکەکانیشی راپەڕێنن؟ سەرەڕای ئەوەی تێبینیو رەخنەشیان لەسەر هەندێك مەسەلە هەبوو.

پاشان بۆچی کاك ئەحمەد کرێکاریش لە کەرکوك، هەروەها هاورێیانی دیکەی کەرکوکیش، شەهید بێستون، حەمید شورتە، هەرهەموویان بۆچی وازیان لە کۆمیتەکەی نوسەر هێناو بەگەرمی لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا کەوتنەکار؟

با بەدیوێکی لۆژیکی دیکەدا بپرسین: کۆمیتەکەی نوسەر باسی دەکات، لەبەرچی زۆربەیان کەرکوکین؟ شەهیدان ئازاد هەورامیو عەبدولرەزاق، کەرکوکین. ئەحمەد کرێکارو حەمید شورتە کەرکوکین. ئەبو شەهاب کەرکوکییە.

نوسەریش ساڵەها لە کەرکوک بووە. ئەمە کۆمیتەی شارەکانە، یان هی کەرکوکە؟

لە پێکهاتەی کۆمیتەکەو ئەندامەکانیدا دیارە، نوسەر لە شارەکانی تردا کەسی ئەوتۆی نەناسیووە. من لە سلێمانی خۆم شاردبوەوە ئەوکاتە هەر پێشی نەزانیوم. کاک سالارو شەهید ئارام خەڵکی سلێمانین، رقی لێیان بووە. لە دهۆك، بادینان، بەغدادو شوێنەکانی تریشدا، پەیوەندی نەبووە. ئیتر تابلۆکە پاك دەبێتەوە کە بە چ شێوەیەك کۆمیتەکەی پێکەوەناوە. هەڵبەتە کۆمیتەیەکیش بەوشێوەیە پێکهاتبێ، سەرناکەوێ.

ئێستا با بێینەوە سەر کۆمیتەی هەرێمەکان. بەقسەی ئەو بێ، ئەم کۆمیتەیە، دوای کۆمیتەکەی ئەو، پێکهێنراوە. چاکە، ئەم کۆمیتەیە بۆچی توانی کەمتر لە دوو مانگ، شیرازەی رێکخستنەکان بگرێتەوە؟ دوو ئەندامی کۆمیتەکەی نوسەریش بێنێتە ناو خۆی؟ لەماوەیەکی کەمیشدا، ئومێد ببەخشێتەوە سەراپای رێکخستنو پاشانیش، ئەرکی بەرپابونی شۆڕشیش راپەڕێنێ؟ بۆ کۆمیتەی هەرێمەکان، توانی سەربکەوێ؟ بۆچی کۆمیتەی شارەکان سەرنەکەوتن؟

بەبێ دوودڵی دەڵێم: بەشێکی بەرچاوی سەرکەوتنی کۆمیتەی هەرێمەکان، بۆ رۆڵی شەهید ئارام دەگەڕێتەوە. دڵنیاشم، بەشی زۆری شکستی کۆمیتەی شارەکان، بۆ نوسەر دەگەڕێتەوە، چونکە دوای (٣٦) ساڵ، ئەمە ئەقڵیەتی بێ کە کتێبەکەی پێ نوسیووە، ئاخۆ ئەوکاتە، ئەم زاتە، چۆن بوبێو چۆن بیری کردبێتەوەو چۆن لە پێکهێنانی کۆمیتەکەو لەناو کۆبونەوەکاندا بڕیاری دابێ؟ ئەم ئەوەندەی بیر لە رقو ململانێی لاوەکی کردۆتەوە، ئەوەندەی بیر لەوە کردۆتەوە لەو کۆمیتەیەدا، کێ بەقسەی خۆی دەکەنو چۆن خۆی ویستبێتی، ئاراستەیان بکات، چارەکی ئەوە بیری لە ئەرکە ستراتیژیو چارەنوسسازەکان

نەکردۆتـەوە. هەربۆیـە، کۆمیتەکـەی لـەو چـەند هـاوڕێ کەرکوکییـەی خـۆی ناسیونیو بەدڵی بون، پێکهێناوە. سەرەنجام ئەمیشی لەدەست نەماوە (ئەمیشی چوو، ئەویشی چوو.. بەجارێ ماڵی وێرانی).

شـەهید ئـارامیش.. بـۆ میـژوو دەبـێ بیلـێم: نـە کۆمیتـەی هەرێمـەکانی دروستکردووە. نە هەتا کۆمیتـەی هەرێمـەکانو خۆیشـی لەژیانـدا مـابوو، یـەك کەسی هاوڕێی خۆی، هێنایە کۆمیتەکەوە.. بۆئەوەی راستیو دروستی چۆنیەتی دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکانیش بزانرێ، بەناچاری، بـۆ یەکـەمین جـار، وا پێویستە بەشێکی سەرگوزشتەکەی بگێڕمەوە.

هەروەکو پێشتر گێڕامەوە، دۆخێکی هەتا بگوترێ نالـەبار بەسـەر کۆمەڵـەدا هات. بێ خاوەن مایەوە. من لەماڵی شەهید (بەکری دارتاش) خۆم شـاردبوەوە. بەرپرسیاری رێکخستنەکانی خانـەقین، بەغـدادو گـەرمیان بـوم. لـەو ماوەیـەدا، دوای مانگێـك، کـەس نـەدەهات بـەلاما. بـەپێی قسـەکانی کـاك فەرەیـدون عەبـدولقادریش، دەبوایـە زوو زوو پەیوەنـدیم پێوەکرابـا. لـەو ماوەیـەدا کـە هاوڕێیانی خانەقین (مامۆستا فازیل کەریم، مامۆستا موحسـین عـەلی ئەکبـەر، عیماد ئەحمەد)م دەبینی، هیچ دەنگوباسو بڕیارێکم پێنەبوو. قسـەی گشـتیمان بە پیاسە لە برایم پاشاو توی مەیلك دەکردو بۆڵەبۆڵی خۆمان لەسەر ئەو دۆخەی بەسـەر کۆمەڵـەدا هـات، هەڵدەڕشـت. ئـەم دۆخـە هـەتا کۆتـایی مـانگی (١٠/١٩٧٥) ی خایاند. شەو و رۆژ، لە خەباتی ژێرزەمینیو خۆشـاردنەوە هـەر ناچێتەسەر، سەعات دەبێتە بارو شەو و رۆژ وەکو مۆتەکەیان لێدێ. بەتایبـەتی، سـەرەتا بـە ئومێـدێکی گـەورە خـۆت بشـاریتەوەو چاوەڕێی بـەرپابونی شـۆڕش بکەیت، پاشان بۆت دەربکەوێ سەرکردایەتیەکەت لە زیندانی سەقز تونـدکراونو کلاۆرۆژنەیەکیش بۆ روناکی نەماوە.

رۆژێکیان (ئەبو شەهابو شەهید ئازاد هەورامی) نازانم چۆن زانیبویان مـن لە ماڵی شەهید بەکردام، ئێوارەکەی خۆیـان کـرد بـەژوردا. یەکـەمین جـارم بـوو ئەبو شەهاب ببینم. دڵـم زۆر خۆشـبوو، وتم: وادیـارە لـەو کـونی ژور رزگارمـان دەبـێو بڕیارێـك دراوە بـۆ چـونە شـاخ. ئـەبو شـەهاب بەحەماسـەوە، تـوڕەیی پێوەدیار بوو. وتـی: ئـەم وەزعـە چـیتر تەحـەمول نـاکرێ. بڕیارمانـداوە شـۆڕش بکەین.

هەر زۆر دڵم بە قسەکەی خۆش بوو. پرسیم:

- چۆن..؟ لەکوێوە دەستپێدەکەین..؟ چیمان هەیە..؟

وتی:

- هیچمان نییە. بەڵام کە چوینە شاخ دەتوانین هـەموو شـتێك پێکبێـنین. ئـەو رۆژەی دەشچـینە شـاخ، لـە یـەك دوو شـار نـارنجۆك بەرامبـەر هێـزی رژێـم دەتەقێنینو ئیتر خەڵك دەزانن شۆڕش دەستپێکردووە.

ئەوکاتـە تـازە تەمـەنم لـە (٢٤) سـاڵ نزیـك دەکەوتـەوەو ئـەزمونی پێشمەرگایەتیشـم نـەبوو، ئـەوە نـەبێ لـە سـاڵی (١٩٧٣)وە بڕیـاری گـرتنم لـە خانەقین دەرچوو، هەتا هەرەسی (١٩٧٥) لـەناو شۆڕشـی ئـەیلولو پێشـمەرگەدا بوم. یەك شەڕم نەدیبوو. فیشەکێکیشم بەرامبەر داگیرکـەر نەتەقانـدبوو. تـەنها چەند کتێبێکم لەسەر شۆڕشو شۆڕشگێڕان خوێندبوەوە. یەکەمین کتێبی سیاسی لەژیانمدا، ساڵی (١٩٧٠) (مـذكرات جیفـارا) بـوو، چـەند جارێکم خوێنـدەوە. هەروەها نامیلکەکانی ماوتسیتۆنگ.. لەگەڵ (البؤرة الثوریـة- روجیـة دوبریـة) کـە دیقـەتم دەدا، قسـەکانی ئـەبو شـەهاب، حەماسـی شۆڕشـگێڕانەی روژیـە دۆبریەی لێدەباری. من گومانم لە قسەکانی ئـەبو شـەهاب نـەبوو. بـە پیـاوێکی شۆڕشگێڕیش هاتەبەرچاوم. بەڵام هەرچەندم کـردو کۆشـا، بۆچـونەکانی دروسـت

نەبون. کاتێکیش قسەی دەکردو بڕیاری بەرپابونی شۆڕشی دەدا، لە زهنی خۆمدا دەمگوت: وادیارە، دوای خاڵە شیهاب، ئەم هاوڕێیە سەرپەرشتی کۆمەڵە دەکات. بۆیە، هێنامو بردم، بەشەرمێکەوە وەڵامم دایەوە کە:

هاوڕێ.. تکام وایە، با وردتر بیری لێبکەینەوە. راستە لێمان قەوماوەو کۆمەڵە بەرکەوتووە، بەڵام با بەوردی بڕیار بدەینو دەست بە شۆڕش بکەین.

شەهید ئازاد.. یەکسەر پشتیوانی لێکردم. دوایی زانیم، لەبەرئەوەی ئەبو شەهاب ماوەیەك بەرپرسیاری بووە، ئەویش لە رودا داماوە لەگەڵیو بەرپەرچی نەداوەتەوە. بەڵام کە من قسەم کرد، هەروەکو ئەویشم رزگارکردبێ، یەکسەر، هاتەدەستو پشتیوانی لێکردم.

دوای ئەوە، زانیم کە ئەبو شەهاب، وازی لەو بیرۆکەیە هێناوەو چۆتەوە بەغداد. من، چاکم لەبیرە، دوای ئەم هاتنەو ئەو شپرزەییەی هەستم پێکرد، گەیشتمە ئەو قەناعەتە، سەردانێکی (کاك سالار عەزیز) بکەم. ئازاد هەورامیش ببینم. بزانین تەگبیر چییەو چی بکرێ باشە. هەتا ئەوکاتەش نەمدەزانی سالار عەزیز، چ پلەیەکی لەناو کۆمەڵەدا هەیە. چۆنچۆنیش بیردەکاتەوە. پەیوەندیم پێوەکردەوەو باسی سەردانەکەی ئەبو شەهابم لەگەڵ کرد. ئەویش وتی: شۆڕش چۆن وا دەکرێ؟! لەمەوە، سەری باسمان دامەزراند، ئەی تەگبیر؟ ئەوشەوە زۆرمان قسەکرد، لە قسەکاندا، هەستم کرد، کاك سالار، ناڕەزایەو رەخنەی لە سەرکردایەتی کۆمەڵەو ئەو دۆخەی بەسەریا هاتبوو، هەیە. بۆ شەوی دوایی، دیسان یەکمان بینییەوەو کەوتینەوە شەنوکەو کردنی دۆخەکە. تێیگەیاندم کە لەناو کۆمەڵەدا، هیچ مەسئولیەتێکی نییە. بەڵام چەندین کادری باشی کۆمەڵە، لە سلێمانیدا دەناسێو یەکتریش دەبینن. من لێم پرسی: ئەی کاك شاسوار دەبینی؟ وتی: بۆ دەپرسی؟ تومەزە، کاك سالارو کاك شاسوار، زۆر هاوڕێنو نەیدەویست زانیاری لەسەر کاکە شاسوار بدا بە من.

بەلاّم تێیگەیاندم، ئەویش بێتاقەتە لە دۆخی کۆمەڵەو سەری سوڕماوە، بۆچی وای بەسەرهاتووە.

پوختەکەی.. سەرەنجامی ئەم گفتوگۆیانە، منو کاک سالار ڕێککەوتین کە بکەوینە کار بۆ گرتنەوەی شیرازەی ڕێکخستن. بۆ ئەم مەبەستە، ئەرکی من، جگە لە ڕێکخستنەکانی خانەقینو بەغداو گەرمیان، پەیوەندی پێوەکردنی کەرکوكو هەولێریش بوو. ئەم هەولاّنە تێکڕا دران. ئامادەیی دەربڕان. کۆبونەوەی سەرەتایی نێوان منو شەهید ئازادو کاک سالاریش کرا. هێشتا شەهید ئارام تەکلیفی لەو دانیشتنانە ڕۆشن نەبوو. دووەم کۆبونەوە، شەهید عەبدولرەزاقیش ئامادە بوو. وردتر قسەمان کردو بڕیارمان دا، بەردەوام بین. هاوڕێیانی زینندانیش ئاگادار بکەینەوە. شەهید عەبدولرەزاق گوتی: من پەیوەندیم پێیانەوە هەیەو پێیان دەڵێم. هەر لەو کۆبونەوەیەدا، من باسی کاك شاسوارم کردەوە، کە هەقە بێت لەم کۆمیتەیە لەگەڵماندابێ. کاك سالار وتی: لە جموجۆڵەکان ئاگادارم کردۆتەوەو پشتیوانیمان دەکات. دوبارەم کردەوە کە کۆبونەوەی ئایندە بۆچی نایەت لەگەڵمان. شەهیدان ئازادو عەبدولرەزاق پشتیوانیان کردم. تەنانەت جوان جوانم بیرە، شەهید عەبدولرەزاق وتی: شاسوار نوسەرەو لە ئێمە بەتەجروبەترەو پێویستمان پێیەتیو هەقە لە کۆبونەوەی ئایندەدا لەگەڵمان بێ. کاك سالار وتی: باشە هەوڵی لەگەڵ دەدەمو دڵنیاشم دێت.

دوای ئەو کۆبونەوەیە، هەریەکەمان بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانمان کەوتینە کار. دیسان هاتینەوە بۆ کۆبونەوە. لە ئانو کاتی خۆیدا. لەماڵی کاك ئەمین عەزیز، برا گەورەی کاك سالار، خزمەتێکی زۆری کۆمەڵەو یەکێتیان کردووە. بەڵکو ماڵیان یەکێك بووە لە بنکە نهێنییەکانمان، کە گرنگترین کۆبونەوەکانمان لەو هەلومەرجەدا، لەماڵی کاك ئەمیندا (باوکی خۆشناو) ئەنجامدەدا.

کۆبونـەوەی ئـەمجارە، بیرمـە هەفتـەی یەکـەمی مـانگی (١٢/١٩٧٥) بـوو. بەپێی بڕیـار، پێویسـت بـوو سـالار عـەزیز، لـەناو ڕێکخسـتنەکانی سـلێمانیدا، هاوڕێـیـانی کۆکردبێتــەوە؛ شــەهید عەبـدولرەزاق- هــەولێر، شــەهید ئـازاد- کەرکوك‌و منیش- خانەقین، بەغداد، گەرمیان. سلێمانی ڕۆژەکەی بارانێکی زۆر باریبوو. سارد بوو. هەریەکە بەهیوایەکەوە، یەکە یەکە دەگەیشـتنە مـاڵی کـاك ئەمین، لەچاو ئەوسای سلێمانی، ماڵەکە خۆشبوو. دەکەوتە کۆڵانێکەوە لە بـرایم پاشاو نزیك گردی سەیوان بوو. کۆڵانەکە قیرتاو نەکرابوو. من پێش کـاك سـالار گەیشتم‌و چەند جارێك هاتوچۆم کردبوو، وەکو مـاڵی خـۆمی لێهـاتبوو. گـەورەو بچوکیان ئاشنام بوون. خۆشناو، تازە لاو بوو. روخۆش گەورە کچـیان‌و ئەنـدامی کۆمەڵە بوو. باقیەکەیان منداڵ بون. دوای من کـاك سـالار هـات‌و دوای ئـەویش شەهید ئازادو عەبدولرەزاق. هەروەکو بڵێی هەمومان لەم کۆبونەوەیەدا چاوەڕێی کەسێك بکەین، ئومێدمان پێیەتی سەرگەورەمان بێ‌و سـەرکردایەتیمان بکـات. کـەمێکی پێچـوو، گوێمـان لـە زەنگـی دەرگاکـە بـوو. دەرگایـان بـۆ کـردەوە، دەمــانزانی ئێســتا، ئــەوەی چـاوەڕوانی دەکــەین، دێتــە لامــان. کاریگــەری سیاسەتمەداری باش‌و بەتوانا ئاوایە. لـەکاتی تەنگانـەدا، دەبێتـە جێـی ئومێـد. بەبێ‌ئەوەی هیچ هەڵپەیەك بکات، یـان پـیلان بگێـڕێ، یـاخود خـۆی بسـەپێنێ. من، دوو جار ئەم حاڵەتەم دیووە. یەکەمین جار، بۆ کۆمەڵە.. کە شـەهید ئـارام بوو. دووەم جاریش بـۆ بـەرپابونی شـۆڕش.. کـە مـام جـەلال بـوو. کـە دەشـڵێم شەهید ئارام یەکەمین جـار ئـەو ئومێـدەی بەخشـی، مەبەسـتم دۆخـی شـڵەژاوی ئەوکاتەی کۆمەڵە بوو، کە تەنها شەهید ئـارام، چـرای تـاریکی نـاو وڵات بـوو. هەر بەڕاستی، چراکە بوو. بەڵێ..

لە هۆڵەکەدا دانیشتبوین، دەرگا کرایـەوە، بەئومێـدێك‌و خۆشەویسـتیەکەوە، لەبەر پێی هەڵساین. کەسێکی لاواز. چـاویلکە لەچـاو. باڵایـەکی مامنـاوەنجی‌و

قەمسەڵەیەکی خۆڵەمێشیو پانتۆڵێکی هەمان رەنگ. کراسو بلوزێکی یەخە حەوتی، لەبەردا بوو. بەمانای وشە سیاسەتمەدارێکی خۆشاردوی خەباتی ژێرزەمینی بوو. ناوێکی پڕ بەپێستیشی لەخۆی نابوو (ئارام). چونکە ئارام ئارام هاتەژوورەوە. خۆیەتی (شاسوار جەلال). ئەوەی چاوەڕوانمان دەکرد، بێگومان تێر تێر سەیرمان کردو سەیرکردنەکەش بۆ منو شەهیدان ئازادو عەبدولرەزاق هەستێکی خۆشتری پێدەبەخشین. چونکە سەبارەت بە کاك سالار، لەنزیکەوە هاوڕێی بوو. پێدەچوو زۆریان یەکتریش دیبێ. شەهید ئارامیش، بەدیقەت سەیری دەکردین. سەیرکردنەکەی ئێمە، سەیرکردنی سێ کەس بوو، لەناخی خۆماندا، بڕیارمانێ دابوو، شەهید ئارام، لەو کۆمیتە سەرپەرشتیەی هەتا ئەوکاتە پێکمان هێنابوو، کاربکاتو بشبێتە بەرپرسیارمان. متمانەیەك بوو، لەناخی خۆماندا پێماندابوو. بەڵام سەیرکردنەکەی ئەو بۆ وردبونەوەو تێگەیشتنو هەڵسەنگاندنمان بوو. جۆری دانیشتەکەمان وا رێکەوتبوو، شەهید ئارام بەرامبەرمان بوو. دوای بەخێرهێنانو لەیەکتر پرسینی هاوڕێیانەی گەرم. وەکو خانەخوێ، کاك سالار بەخێرهاتنی کردینو شەهید ئارامی باشتر پێناساندینو بیرمە وتی:

- کاك شاسوار کە ناوی خۆی ناوە ئارام، پێی خۆشبوو بێت لەگەڵماندا کار بکات.

ئێمەش وتمان:

- خۆشحاڵینو سوپاسی دەکەین..

کاك ئارام، چەند زیرەكو تیژبین بوو، چەند راستگۆو هوشیار بوو، هێندەش قسە خۆش بوو. دەمودەست وەڵامی پێبوو. زۆر جاریش نوکتە ناسکەکانی، قسەکانی خۆشترو کۆبونەوەو گفتوگۆکانی دەڕازاندەوە. یەکەمین قسە بە قسەی

خـــۆش دەســـتپێکردو بەدڵخۆشـــیەکەوە، هـــەروەکو بڵێـــی هەڵســـەنگاندنە سەرەتاییەکەی بۆمان بەدڵی بوبێ، فەرمووی:

- سوپاستان دەکەم..

بەپێکەنینیشەوە روی کردە کاک سالار:

- راست دەکەی کوڕی چاکن.. هاوڕێیان.

شەهید ئارام.. ئیتر جڵەوی قسەی گرتەدەستو دەستی کرد بە باسکردنی دۆخە سیاسیەکەو ئەرکەکانمان. لەناو قسەکانیا گوتی:

- ئێمە بۆ خۆشیی نەبوین بە کۆمەڵەو مارکسی. هەر لەسەرەتاوە دەمانزانی رووبەڕووی ئەرکی سەخت دەبینەوە. لەوباوەڕەدا نەبوم، ئاوامان بەسەردا بێ. لە یەکەمین پەلاماردانماندا، شیرازەمان پچڕاوەو لەسەرکردایەتیەوە بۆ شانەکانو هاوڕێیان، ئاوامان بەسەرهاتووە کە دەیبینین. بۆ وامان بەسەر هات؟ کێ لەمە مەسئولە؟ بۆچی نەخشەمان نەبووە؟ بۆ هیچمان نییە؟

هەر پرسیارێکی دەکرد، خەمێکی گەورەی لەپشتەوە بوو، بەڵام بەپەرۆشیەوە دەیکرد. شەهید عەبدولرەزاق هەڵیدایە:

- راست دەکەی وەزعەکە ناخۆشە. بەڵام با چیمان پێدەکرێ، بیکەین. هەتا بزانین دەگەینە کوێ.

شەهید ئارام:

- ئەگەر بزانین چی دەکەینو چ رێگایەك دەگرینەبەر، دەشزانین دەگەینە کوێ؟

ئەو دێڕەی سەرەوە، چڕکراوەی لێکدانەوەیەکی تری شەهید ئارام بوو، لەسەر کۆمەڵەو دوارۆژی کۆمەڵە. بەباوەڕەوە دەدوا. ئومێدی بە بوژانەوەی کۆمەڵە هەبوو.

قسەوباسێکی زۆر هاتەئاراوە. بەشی زۆری قسەکان شەهید ئارام دەیکرد. ئەوانی ترمان کەمتر. بەڵام کاك سالار، بەحوکمی ئەوەی هاوڕێی کاك ئارام بوو، ئەرکی ڕێکخستنەوەی سلێمانیشی پێ سپێردرابوو، زیاتر لە ئێمەش بیروڕای دەردەبڕی.

سەرەنجامی مشتومڕەکانمان، گەیشتینە ئەو باوەڕە کە ئەم کۆمیتەیە، وەکو کۆمیتەی سەرپەرشتی کۆمەڵە، جارێ کارەکانی بکات. مانگی دوو جار کۆببینەوە. شەهید ئارامیش ڕاسپێردرا، ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل لەسەر کۆمەڵەو بەسەرهاتەکەیو ئەرکەکانمان بۆ کۆبونەوەی داینده ئامادە بکات.

ئەو سەرگوزشتەی چۆنیەتی کۆبونەوەکانمانە هەتا ئێستا، کە هێشتا "کۆمیتەی هەرێمەکان"مان پێکنەهێناوە. ئاواش شەهید ئارام هاتۆتە ناو کۆمیتەکەوە، نەك کودەتای کردبێ، یان خۆی سەپاندبێ. (*)

* چۆنیەتی دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکانو هاتنی شەهید ئارامم لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە (بەهاری ١٩٨٠) دا باسکردووە.

## ٢٢

## چۆن دەرکردنێکەو ع عێراقچیەك ؟

ئـەو سەرگوزشـتەیەی لەسـەر چـۆنیەتی شـێرازەی گرتنـەوەی رێکخسـتن، کـە باسمانکرد، پێویستیەکی چارەنوسساز بوو بۆ کۆمەڵە، گـەر وا نـەبا، کۆمیتەکـە ئاسـان نـەبوو پێکبـێ. کـە پێکیشـهات، ئەگـەر لەبەرامبـەردا (کۆمیتـەی رێکخستنی شارەکان) کارامە بونایـە، یـان توانـای کارکردنیـان باشـتر هەبوایـە، هەڵبەتـە، کۆمیتەکـەی تـر، کـە هێشـتا تـا ئەوکاتـەی بـاسکردووە، ناویشـمان لێنەنابوو، هەر لە بێشکەدا دەمرد. کەچی لەباتی ئەوەی دانی پیا بنـێ، نـە بـە خۆیو نە بە کۆمیتەکەی ئەرکەکان رانەپەڕیون، لەبری ئەوەی دان بەم راستییەدا بنـێ، بـەڵام دەرونـە نەرگسـیەکەیو رقـە ئەسـتورەکەی، رێـك راسـتیەکانی پێهەڵدەگێڕنو بوختان هەڵدەبەستێت. ئەو کە لە لاپەڕە (٧٨)دا دەڵێ:

" سەبارەت بە خۆرانەگری (حەمەی میرزا سەعید) و زمان لێدانی لە هەندێ کەس کە ئەو کاتە لە رێکخستنەکانی کۆمەڵەدا نەما بـوون یـان ماوەیـەکی زۆر بـوو لەلایـەن سـەرکردایەتی کۆمەڵـەوە سـڕکرابوون، یـان هـەر بڕوایـان بـە کوردستانیەتی کۆمەڵە نەما بوو. بەشێك لەوانە کە بۆیان نە ڕەخسا بـوو دەربـاز بن، ناچاربوون خۆیان حەشاردەن. لەوانە:

١- نەجمەدین عەزیز (سالار عەزیز) کە حەمەی میرزا سەعید ناوی برد بوو.

٢- شاسوار جەلال (شەهید ئارام) کە فەراشەکەی خۆی زمانی لێدا بوو.

٣- حکمت محەمەد (مەلا بەختیار) کە سەلام زمانی لێدا بوو.

ئـەمان و چـەندانی تـریش لەگـەڵ ئـەوەی کـە هاوڕێـیـانی کۆمەڵـە نـەبوون و بڕواشـیان بـە کوردسـتانی بـوونی کۆمەڵـە نـەبوو، دووچـاری خۆشـاردنەوە و خۆحەشاردان ببوون."

جارێ ئەوە من، هەر زۆر دورە لە راستیەوە گوایـە سـڕ کـرابم. دورتریشـە لـە راسـتی کـە عێراقـی بـوبم. ئێمـە رێکخسـتنەکانی خانـەقین، دوور بـوین لـەو کێشمەکێشـانە. کەسـیش لـە مێـژووی کۆمەڵـەدا، نـە لـە خانـەقینو نـە لـە بەغدادیش، لەسەر بیروڕای جیاواز، سڕ نـەکراوە. نەشبووە بـە عێراقـی. بـەڵکو ناوچـەکانی ئێمـە، لەبەرئـەوەی سیاسـەتی تـەعریبو تـەرحیل، زوو سـەپێنرایە سەری، کوردایەتیەکی گەرمیان دەکرد.

ئەم هەڵبەستنە بۆ من، لەخۆڕابینینێکی سەیرە! کەسێك، لە هـیچ کەسـێکی نەبیستووە سڕ کرابم. شایەتێکی زیندوو، یـان مردوویشـی نەهێناوەتـەوە لەسـەر سڕکردنەکەم. بەڵگەی پێ نییە، کە نەك لەکاتی کۆمیتەی هەرێمەکانـدا، بـەڵکو لەسەرەتای دروستکردنی کۆمەڵەشـدا، نـە مـنو نـە هـیچ کەسـێکی دیکـە، لـە خانەقیندا، دوورو نزیك عێراقچی بوبین، یـان لـەناو ئـەو کێشـانەدا بـوبین، ئـاخر ئەمە چ سەرسوڕمانێکی گێڕانەوەی روداوەکانی کۆمەڵەیە، نوسەر، کردومی بـە عێراقیو سڕیشی کـردووم؟ بەڕاسـتی کـە ئـەو بوختانانـە دەخوێنمـەوە، لـەباتی ئەوەی کاردانەوەم هەبێ بەرامبەری، کەچی تەریق دەبمەوە کە درۆکانی بۆ راسـت دەکەمـەوە. لەبەرئـەوەی دڵنیـام، جگـە لـە خـۆی، هـەموو کەسـێك بـاوەڕ بـەم وەڵامدانەوەیەی من دەکات. نەك لەبەرئەوەی من نوسیومن، بەڵکو لەبەرئـەوەی دەیان شایەت هەن، شایەتی بۆ قسەکانم دەدەن. هاوڕێیانی کۆمەڵە باش دەزانـن کە لەژیانمدا، دوورونزیـك، کەسـێکم لـەو کەسـانەش نەناسـیووە کـە لەسـەرەتای کۆمەڵەوە رێبازی حیزبی سەرانسەری عێراقیان هەبووە. شـەهید ئارامیشـم، بـە

ڕەسمی، لەو یەکەمین کۆبونەوەیەی کە باسم کرد، وەکو کۆمەڵـە ناسـیووە. کـاك سالاریش، نە تا ئەوکاتە وەکو عێراقچیەك لەنا کۆمەڵەدا ناسـرابوو، نـە خۆشـی باسی دەکرد. ئیتر نازانم ئەم حوکمدانەی لەچیەوە هێناوە؟

سەبارەت بە شەهید ئارامیش، کە گوایە بڕوای بـە کوردسـتانیبونی کۆمەڵـە نەبووە، پێشتر باسێکمان دەربارەی ئەم بۆچونە کردووە. لێرەدا، لەبەرئەوەی رقـی لـە عێراقچـێتی دەگەیەنێتـە ئەوپـەڕی. ناچـارین قسـەی دیکـەش دەربـارەی بکەینەوە. بەتایبەتی سەبارەت بە بیروبۆچونی شەهید ئارام.

پـێش هـەموو شـتێك، تێناگـەم دوای (٣٦) سـاڵ لـە خـەبات‌و دوای هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەو دەرکەوتنی سەرجەم راستیەکان، بۆچـی هـیچ وانەیـەکی لـە مێـژوی ململانێـی رابـوردوو وەرنـەگرتووە، هـەروەکو مێـژوو لـە فرێـزەری یادەوەریەکانی ئەودا بەستبێتی، ئاوەها حوکم لەسەر رووداوەکان دەدات!

گـەر عێراقیبـون، بـەمانای دامەزرانـدنی حیزبێکـی چـینایەتی سەرانسـەری عێـراق بـێ، لەبەرئـەوەی گوایـە، یـەك پەیوەنـدی بەرهـەمهێنان‌و یـەك چەشـن چەوسانەوەی چینایەتی لەسەر ئاستی عێراقدا هەیە، لەراستیا ئەم کێشەیە، دوو رێبازی ناکۆك، لەدوای هەڵوەشاندنەوەی "حیزبی شۆڕش" لەساڵی (١٩٤٥) داو چونە ناو حیزبی رزگاری لەهەمان ساڵداو پاشان، تێکەڵاوکردنی حیزبـی رزگـاری بە پارتی دیموکراتی کورد،(*) ئیتر عێراقی‌و کوردستانیبون، یەکاڵابونەوە. ئـەوی عێراقی بوو، چووە ناو حیزبی شیوعی عێراق‌و لقـە کوردسـتانیەکەیەوە؛ ئـەوەی کوردستانیش بوو، هاتە ناو پارتی‌و کوردایەتیەوە. لەوساوە، هـەتا دامەزرانـدنی کۆمەڵەش‌و دوای ئـەوەش، راسـتە لـەڕووی تیۆریـەوە، لەلایـەن چـەند کەسـێکی دیـارەوە، بیرۆکـەی حیزبـی کرێکـاری سەرانسـەری عێـراق، خراوەتـە نـاو

* سەرەتای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، ناوی پارتی دیموکراتی کورد بووە. ئەمە خۆی لەخۆیدا باسێك هەڵدەگرێ.

مشتومڕەوە، بەڵام ئەم بیرۆکانە، یان ئـەم باسـە تیۆریانـە، نەخرانـە چوارچـێوەی دوو ستراتیژی جیاوازی ناو دوو ڕێکخراوەوە.

بە زانیاری من، ئەوانەی ئەو باسە تیۆرییەیان هێنایەپێشەوە، لەبەرنامەیاندا نەبووە، حیزبـی سەرانسـەری عێراقـی دابمـەزرێنین. گـەر وابوایـە، خـۆ ئـەوانیش دەیانتوانی وەکو ڕێکخراوەکانی هەشتاکان، یان گروپە بچـوکەکانی وەکـو (کـار، کارگەران، یەکێتی کۆمۆنیستی) ڕێکخـراوی خۆیـان دابمـەزرێنن‌و بـایی خۆشـیان تێکۆشەر کۆبکەنەوە. گەر بنج‌و بنـەوانی ئـەو ململانـێ تیۆرییـە لێکبدرێتـەوەو کەسانی شارەزا وردتر لە من قسـەی لەسـەر بکـەن، پێدەچـێ کێشـەگەلێکی تـر پەیوەندی بەو باسانەوە هەبێ، کە بەداخەوە، هەتا ئێستا خوێنەر لێی بێئاگایـە. هێنـدەی مـن بیسـتومە لـەو کەسـانە، ڕەخنـەیان لەسـەر سروشـتی چـینایەتی پێکهێنانی کۆمەڵەش هەبووە. لەسەر شێوەی کـارکردن‌و چـۆنیەتی کۆکردنـەوەی کادرو ئەندام، پێکەوەنانی شانەکان، سەرکردایەتی‌و سـکرتێری کۆمەڵـەش، ئـەو هاوڕێیانـە، بـاری سـەرنجیان هـەبووە. ڕەخنـەیان گرتـووە. بەتایبـەتی لەسـەر چـۆنیەتی مشـتومڕی تیـۆری لەوکاتـە، لـەناو کۆمەڵـەدا. لەمـە گـەڕێین، هـەتا ڕاستیەکان، وردودرشتیان، باس دەکـرێن، کـە گومـانم نییـە لەپاشـەڕۆژدا، هـەر ڕاستیەك لەمەڕ ئەو ناکۆکیانە ساغبکرێنەوە، بەشی زۆری پێچەوانەی زانیـاری‌و گێڕانەوەی نوسەر دەبن.

دێمە سەر دیوێکی دیکەی کێشەی عێراقـی‌و کوردسـتانی. ئـەویش، ئەوەیـە کـە ئایـە، دوای داگـیرو دابەشـکردنی کوردسـتان، بەتایبـەتی لـەدوای پـەیمانی لۆزانەوە (١٩٢١) ئایە کێشەی کورد لە بەشەکانی کوردسـتاندا، هـەتا هـاتووە، بەرە بەرە، لـە قۆنـاغی ڕزگاریـدا، نەکراوەتـە بەشـێکی کێشـە دیموکراسـیەکانی وڵاتانی کوردستان پێوە لکێندراوەکان؟ بێگومـان وای لێکراوە. چۆن؟

لـەدوای دوا ســەرداری پەرچــەمداری ســەربەخۆیی کوردســتان، کــە شــێخ مــەحمودی نــەمرە، کــە دوا راپەڕینەکــەی دامرکێندرایــەوە، هاوکــات، دوای راپەڕینەکانی رۆژهەڵاتو باکوری کوردستان، مــەخابن، بــەرە بــەرە کوردایــەتی، هــەتا هــاتووە، ســەرەنجامی گەشــەکردنی بزوتنــەوەی نیشــتمانی ئــەو وڵاتانــەو سەرهەڵدانی ستراتیژی دیموکراسی لەو وڵاتانــەدا، کوردایــەتی لــە هــەر بەشــێکی کوردستاندا، هەتاڕادەیەکی دیار، بەستراوەتە خەباتی نیشتمانیو دیموکراسی ئەو وڵاتانە. ئەمەش وەنەبێ لەســەر دەســتی ســەردارو رابــەرانی ســەدەی نۆزدەهــەم، هەتا سەدەی بیستەم، کوردایەتی لەو قاڵبە درابێ؛ نەخێر، لەبســەردەمی (اتحــادو تــەرقی)دا، لەســەروبەندی جــەنگی یەکــەمی جیهانــدا، یەکــەمین جــار (شــێخ عەبــدولقادری نــەهری) دروشمــی ئۆتۆنــۆمی بــەرزکردەوە. ئــەمانیش لــە تورکــە لاوەکانی عوسمانیەوە ئۆتۆنۆمیــان وەرگــرت، تورکــە لاوەکــانیش ئــەو دروشمــەیان دژی قەڵەمڕەوی سیوکراتی (حکومەتی ئــاییني رەهــا)ی عوسمــانی بــەرزکردەوە. پاشــان، لــەژێر کاریگــەری تێزەکــانی حیزبــی کۆمۆنیســتی شــورەویو شــورەوی پەیڕەوەکاندا، ئۆتۆنۆمی کرایە ستراتیژو ئاوێتەی ئایدیۆلۆژیــەت کــرا. تەنانــەت، کــە (کۆمەڵــەی مارکســی لینینــی — ئەندێشــەی ماوتســیتۆنگ)یــش دامــەزرا، ستراتیژی سەربەخۆیی کوردستانی بەرزنەکردەوە، هەتا نوسەر، ئێستا بەڕومانــدا بداتەوە، کە گوایە ئــەوان ســەربەخۆخواز بــوینو خــەباتیان بــۆ رزگــارکردنی هــەر چــوار پارچــەکەی کوردســتانیش کردبــێ. خــەڵکی تــریش عێراقچــێتی کــردووە. هەمومان دەستوری کۆمــەڵەمان لەبیرە، کە لە دامەزراندنی کۆمەڵەوە نوســراوە، باسی ئۆتۆنــۆمی راســتەقینەی تیایــە. باســی ســەربەخۆیی کوردســتانی عێــراقو پاشان سەربەخۆیی هەر چوار پارچەکەی هــەر تیــا نییــە. لــە هــیچ ئــەدەبیاتێکی کۆمەڵەشدا، لەو سەردەمەدا، ستراتیژی وا مبەترەح نەبووە. هیچ کەســێکیش لــە مێژووی کوردایەتیدا، لەدوای پەنجاکانەوە، کــە بەهەشــتی بــاریم ئەحمــەد کتێبــی

(الاكراد والعرب)کەی نوسیوەو چارەنوسی ستراتیژی هاوبەشی کوردو عەرەبی نەخشاندووە، دەتوانم بلێم، لەدوای ئەوە (مام جەلال) لەسەر برایەتی کوردو عەرەب، خەباتی دیموکراسی سەرانسەری عێراق، هاوپەیمانی هێزە نیشتمانیەکانی عێراق، بەلکو هی هەموو عەرەبیش، لەم مەیدانەدا (مام) شۆڕەسوار بووەو بەشی زۆری کۆی نوسراوەکانی، چەند پێداگرتن بووە لەسەر کوردایەتیو کوردستانیبونی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەوە کەمتر سور نەبووە لەسەر خەباتی نیشتمانیو دیموکراسی هاوبەشی سەرانسەری عێراقو رۆژهەلات.

کە شۆڕشمان دەستپێکرد، تەنانەت شۆڕشەکەشمان ناو لێنابوو شۆڕشی عێراقی لە چیاکانی کوردستانەوە هەلگیرساو- الثورة العراقية المندلعة من جبال كوردستان). نوسەر، نە لەناو شاردا دژی ئەو دروشمەو ئەو ستراتیژە بووە، نە کە هاتیشە ریزی شۆڕش، رۆژێ لە رۆژان دژی ئەو دروشمە، قسەیەکی کردووە، یان وتارێکی نوسیووە. یاخود دوورونزیك توخنی مشتومڕ لەسەر رێبازەکە کەوتووە.

ئەوەی لایەنی کەمی زانیاریشی هەبێ لەسەر نیو سەدەی رابوردوی کوردایەتی، لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا، باش دەزانێ، جگە لە کاژیك(*) لەو پێنج دەهەیەدا، هیچ حیزبێکی دیکە لە کوردستانی عێراقو ئێرانیشدا، باسی سەربەخۆیی کوردستانی، بە راشکاوی نەکردووە، چونکە بارە بابەتیەکەی ولاتان بۆ خەباتی دیموکراسی هاوبەش، کاریگەرتر بووە. کوردستانی رۆژئاوا ئێستاش ناوی نیشتمانەکەمان لەوێدا بە کوردستان نابەن. تەنها لەدوای (١٩٧٧)وە، لە باکوری کوردستاندا، رێکخراوە چەپەکانی کوردستان، باسی

* کاژیك: کورتکراوەی کۆمەلەی ئازادی ژیانەوەی یەکێتی کورد، سالی (١٩٥٩) دامەزراوە، پاشان، سالی (١٩٧٥) پاسۆکی لێ پێکهات.

سەربەخۆییان هێنایەگۆڕێ. بەتایبەتی (P.K.K)، ئەمانیش رۆژگار، رێبازەکەی پێکردونەتە فیدراڵو ئۆتۆنۆمی.

سەیرەکە لەوەدایە، کە لە شاخدا بوین (P.K.K)و (ئاڵای رزگاری) باسی سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد. کۆمەڵە بەرپەرچمان دەدانەوەو دەمانوت: ئێستا ستراتیژێکی واقیعی نییە، کەچی کە ململانێی ناو کۆمەڵە، کە ئەقلیەتێکی تەسکی ئایدیۆلۆژیو رقەبەرایەتی دەستەگەری، سەریهەڵدا، بە مەرام، بە بەرنامە، بەڵکو بە پیلانیش، بە خوتوخۆڕایی ئەم کێشەیە قەبە کراوەو لە قەبارەی خۆی زیاتر دنەی رقەبەرایەتی درا. ئەم قەبەکردنەی بۆچونە جیاوازەکان، لەناو شۆڕشداو لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا، لەناو هاوسەنگەرو هاوڕێی چارەنوسی هاوبەشدا، بەوچەشنە شێوێنرا، ئاخۆ، لەدوای بەیاننامەی ئازارو دوای شکستی (جەلالیەکان)و لەسەرەتای کۆمەڵەدا، خەڵکانی وا، چۆن چۆنی لەگەڵ ململانێکانی ناو کۆمەڵە، هەڵوێستیان وەرگرتبێ؟ کە من خۆم لە شەهید ئارامم چەند جارێك بیستووە، ئەو کێشەیەی سەرەتای کۆمەڵە قابیلی چارەسەرکردن بووە. بەڵام هەبون لەناو کۆمەڵەدا، خواخوایان بووە، ئەوانەی بیروڕای جیاوازیان هەیە، دوربخرێنەوە.

کە ئەو هەموو قسەیە لەسەر کوردستانیەتی کۆمەڵە دەکات، رۆژێك لە رۆژان لێمان نەبیست دژی دروشمی (دیموکراسی بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان) بێ. هەرگیز لێشمان نەبیستووە، لەساڵی (١٩٧٧) کە یەکەمین جار دانوسان لەنێوان رژێمو مەکتەبی سیاسی کراو ئەو لە شار بوو، لەبەرئەوەی نوسەر ئاڵاهەڵگری رزگارکردنی چوار پارچەکە بوو، دژی گفتوگۆ بێ. کە هاتیشە دەرەوە، چەندین جار لەسەر ئاستی نزمیش دانوسان کراوە، قەت دژی نەبووە.

لەدوای راپەڕینیش، کە فیدراڵ راگەیەندرا، نەیگوتووە بۆچی حکومەتی عێراق لە کوردستان کشاوەتەوەو ناوچەی ئارام هەیەو پشتیوانی جیهانیشمان دەستەبەرە، نەیدەگوت: ئەی بۆچی سەربەخۆیی کوردستان راناگەیەنن.

کە دووەمین کۆنگرەی یەکێتی (٢٠٠١/١/٣٠) بەسترا، لە هۆڵی مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتیەکان، هەڤاڵ حەمە سابیرو ئەحمەد بامەرانی سەرپەرشتی کۆمیتەی پرۆگرامیان دەکرد، کە هاتە سەر ئەوەی ئایە کێشەی کوردستانی عێراق بەشێکە لە کێشە دیموکراسیەکانی عێراق یان نەء؟ یەکەمین کەس نوسەر هەڵساو گوتی:

کێ دەڵێ کێشەی کورد بەشێك نییە لە کێشە دیموکراسیەکانی عێراق، با بۆ خۆی قسە بکات. بەڵێ کێشەی کورد بەشێکە لە کێشە دیموکراسیەکانی عێراق.. تاد.

من.. روم کردە وێنەگرەکانو پێمگوتن: ئەو قسانە باش تۆمار بکەن. هۆڵەکە بوو بە پێکەنین. ئێستاش قسەکانی بەتۆمارکراوی دەبێ مابن.

پێش دوا هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقیش، نوسەرو چەند کەسێك لەوانەی هاوسەنگەری ئێمەیان بە عێراقی زانیو خۆیان بە کوردستانی عەیار بیستو چوار، هەوڵێکی زۆریان دا لەناو لیستی پەرلەمانی عێراقدا، ناویان بنوسرێو نوسراش. ئێستاش موچەی خانەنشینی (عێراقچیێتی) وەردەگرن. منو کاك سالاریش لە پەرلەمانی کوردستان بەولاوە، بۆ شەڕی پلەو پایەو موچەی خانەنشینی، لە سنوری حەمرین نەچوینە خوارەوە. موچەکەشمان هی خانەنشینی پەرلەمانی کوردستان نییە.

## ٢٣

# شەوێکی شوم لەمێژووماندا

لەسەر رۆشتنی هاوڕێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵە، بۆ ئێرانو چۆنیەتی تەسلیمکردنەوەیان بە رژێم، سەرگوزشتە بەئارەزوو دەهۆنێتەوە، بەڵام دوورونزیك لە راستیەکان نزیك ناکەوێتەوە. بۆ نموونە، لە لاپەڕە (٨١-٨٢)دا دەڵێ:

" لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٧٥/١٢ شەهید عەلی ئامەخانمان ناردە دیوی ئێران بۆ سەردانی هەڤاڵانمان لە زیندانی سەقز و شەهید عەلی پاش دە رۆژ گەڕایەوەو ئاگاداری کردین کە رژێمی ئێرانی لە هەفتەی ئایندەدا هەڤاڵانمان بە دوو ئەفسەری ئێرانی کە لای عێراق بوون و ئۆپۆزسیۆن بوون و خۆیان تەسلیم بە عێراق کرد بوو دەگۆڕدرێنەوە.

کۆمیتەی شارەکان لە ١٢/٢٨ دا کۆبوەوە و بڕیاریدا ئەوەندەی بکرێ هەوڵ بدرێ بۆ فراندنیان لە کاتی ناردنیان لە سنورەوە بۆ دیوی عێراق، بۆ ئەو مەبەستە کە ئاگاداری ئەوە بووین ئەو هەڤاڵانە لە سنوری پێنجوێنەوە دەدرێنەوە بە عێراق، شەهید عەلی ئامە خان چوو بۆ پێنجوێن و لەوێ بۆ ئەو کارە پەیوەندی لەگەڵ رێکخستنی کۆمەڵە کرد بوو."

ئەم هەواڵانە، دوورونزیك راست نین. بۆ؟ لەبەرئەوەی، هەتا خاڵە شیهابو هاوڕێکانی تەسلیمکراونەتەوە، کەس نەیدەزانی تەسلیم دەکرێنەوەو کەسیش نەیدەزانی لە کام زیندانن.

وەکوتریش.. بەپێی ڕێکەوتنامەی جەزائیر، هەر هاوڵاتیەك سنوری بیەزانایە، تەسلیم دەکرایەوە، ئیتر پێویستی نەدەکرد لەخۆیەوە، دوو ئەفسەری ئێرانی بە هاوڕێیانی کۆمەڵە، بگۆڕێتەوە. شتی وا دوورونزیك ڕاست نییە. باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە دوای روخاندنی ڕژێمی شا، بەڵگەنامەی لێکۆڵینەوەی دادگای سەقز دەست شوراکانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستانی ئێران کەوتن‌و دۆسیەی دادگاییکردنی خاڵە شیهاب ئەوانیشی تیا بوو، باسی گۆڕینەوەی تیا نییە. تەنانەت باسی ئەوەشی تیا نەبوو کە ئەم هاوڕێیانە لەسەر سیاسەت گیرابن‌و بەهۆی سیاسەتەوە تەسلیم بە عێراق کرابنەوە. ناوی دوو ئەفسەرەکەی نوسەرو گۆڕینەوەیان بە هاوڕێیان، لە پەراوێزی مەتنی دادگاکەشدا نەهاتووە. پاشان، هاوڕێیانی زیندانیش کە هاتنە دەرەوە، دوای ئازادکردنیان، قەت باسی گۆڕینەوەی خۆیان بە دوو ئەفسەری ئێرانی نەکرد.

سەبارەت بە شەهید "عەلی ئامەخان"یش. من، شەهیدی ناوبراو لە خەباتی ژێرزەمینیەوە دەناسم. دەشزانم چەند خاڵە شیهابی خۆشدەویست‌و ئامادەش بوو لەپێناوی ڕزگارکردنی خاڵە شیهاب‌و هاوڕێیانَ خۆی بەخت بکات. ڕاستیشە، قسەی وا کرا کە هەوڵێك بدرێ، بەڵام هەر قسە بوو. شەهید عەلی ئامەخانیش ئەوکاتە، لە ئەمنی سلێمانیدا گیرابوو کە شەهید شیهاب‌و هاوڕێکانیان گەیاندبووە ئەمنی سلێمانی، عەلی ئامەخان بە دەنگ ناسیونی، بە گۆرانی‌و دەنگێکی بەرز، تێیگەیاندبون، کە ئەویش گیراوە. سەرم سوڕدەمێنێ، بۆچی ناتوانێ جڵەوی رق‌و خۆپەرستی توند بگرێ‌و بەوشێوەیە نەکەوێتە هەڵەوە؟!

لەمبارەوە، ئەوەی هەیە دەرهەق بە هەڵومەرجی ئێستا دەتوانرێ بوترێ:

وا باشتر نەبوو، هەروەکو چۆن، ڕەخنە لە کۆمیتەی هەرێمەکان ناپارێزێ‌و ئەوەی رویشی نەداوە، بۆیان دادەتاشێ؛ هەروەکو چۆن، ڕەخنە لە تەواوی ئەو

کەسانە دەگرێ، کە دوورونزیك لە ڕێڕەوی خەباتدا ناسیونی.. تەنانەت دەستی لە شەهیدان‌و پێشمەرگە قارەمانەکانیش نەپاراستووە. با ئەرکی ئەوەشی بکێشایە کە هەڵسەنگاندنێکی لەسەر ڕۆشتنی خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی بکردایە.

ڕاستە.. خاڵە شیهاب‌و شەهید جەعفەر، لە قارەمانە دەگمەنەکانی بەردەم پەتی سێدارەن لە تەواوی سەدەی ڕابوردودا، ڕاستیشە، هاوڕێیانی زیندان، لە پێش‌و لە دامەزراندنی کۆمەڵەوە، لە تێکۆشەرە کۆڵنەدەرەکانی گەلەکەمان‌و ڕەنجدەران بون، کە ئازادیش کران لە زیندان، دەستبەجێ هاتنە ریزی شۆڕش‌و گیانبازیان لەپێناوی سەرکەوتنی شۆڕشدا کرد، ئەو هاوڕێیانە وەکو سیاسەت، نە کەمیان کردوەو نە درەنگیش هاتون. بەڵام هیچ لەم ڕاستیانە، ڕێگر نین لە هەڵسەنگاندنی بابەتی. مێژووی ڕاپەڕین‌و حیزبە سیاسیەکانی ئێمە، پڕە لە نمونەی ڕەخنەلێگرتنی سەرکردەو سەردارو ڕابەری مێژوویی. بەڵکو کەم سەردارو سەرکردە هەیە، شەهیدو کۆچکردوان‌و زیندوەکانیش، ڕەخنەیان لێنەگیرابێ.

- ڕەخنە لە میری بەدرخان لەسەر کەمێك چەوساندنەوەی مەسیحیەکان گیراوە.
- ڕەخنە لە پاشای گەورەی ڕواندوز؛ لەسەر کوشتاری یەزیدیەکان‌و فریوخواردنی بە گفتەکانی مەلای خەتێ، گیراوە.
- ڕەخنە لە شێخ عوبێدوڵڵای نەهری گیراوە؛ لەسەر ئەوەی هێزی بۆ تەبرێز ناردووە (کە کوردستان نییە)و دوای گەمارۆی ورمێ، ڕزگاری نەکرد.
- ڕەخنە لە شێخ سەعیدی پیران گیراوە؛ لە ئاگری داخدا شۆڕشەکەی دوچاری شەڕی نابەرامبەر کرد.
- ڕەخنە لە سمکۆی شکاك گیراوە؛ کە مارشەمعونی شەهید کردووە.

- ڕەخنە لە شێخ مەحمود گیراوە؛ ڕەچاوی شەڕی پارتیزانی نەکردوەو لەژێرەوە پەیوەندی بە (ئۆزدەمیری تورکیا) کردووە.
- ڕەخنە لە شەهید پێشەوا گیراوە؛ کە سیاسەتێکی شیاوتری دوای ڕوخاندنی کۆماری کوردستان، نەگرتۆتەبەرو خۆی داوە بەدەستەوە.
- ڕەخنە لە بارزانی گیراوە؛ کە دوای ڕێکەوتننامەی جەزائیر، بەرەنگاری نەکرد.
- ڕەخنە لە مام جەلال‌و برایم ئەحمەد، لەسەر کێشەکانی شۆڕشی ئەیلول گیراوە.
- ڕەخنە لە شەهید عەلی عەسکەری‌و هاوڕێکانی، لەسەر کارەساتی هەکاری گیراوە.
- ڕەخنە لە شەهید ئارام، لەسەرئەوەی لە قەراغ مایەوەو مەفرەزەشی لەگەڵ خۆیدا، ڕۆژی توشبونەکەی، نەهێشتبوو، ئاکام شەهید بوو، گیراوە.
- ڕەخنە لە مام جەلال‌و مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەسەر کارەساتی هەکاری گیراوە، کە وەکو پێویستە بەرنامەی عەسکەری‌و ستراتیژی بەرەنگاریان دانەنابوو. هەروا لەسەر ۳۱/ی ئابیش.

لەسەر ئاستی جیهانیش، لەناو تەواوی حیزبەکاندا، تەنانەت لە ناو چەپەکانیشدا، بەدەگمەن، حیزب‌و ڕابەری سیاسی هەیە، لەمێژووی خەباتیدا هەڵەی نەکردبێ‌و ڕەخنەی لێنەگیرابێ. لە مارکسەوە، هەتا لینین، بۆ ماوتسیتۆنگ، کاسترۆ، جیفارا، یاسر عەرەفات، تەنانەت لە قورئانیشدا، ڕەخنە لە پێغەمبەر گیراوە لەسەرئەوەی ڕێزی لە نابینایەك نەگرتووە کە لە دەرگاکەیانی داوە.

هەڵە.. دیاردەیەکی ئاسایی سیاسەتمەدارانە. هەڵەکردن پەشم نییە. هەڵە پۆشین پەشمە. جاری وا هەیە، رابەری گەورە هەڵەی بچوکی ئەوتۆ دەکات، ئەندامی شانەیەکی خوارەوەش نایکات، جاری واش هەیە، هەڵەی گەورەی ئەوتۆ دەکەن، کارەساتی لێدەکەوێتەوە.

- کاسترۆ؛ یەکەمین هەڵمەت کە دەچنە شاخی سیراماسترا، لەپرخەی خەودا، لەلایەن هێزێکی سەربازییەوە، دەگیرێ. بێگومان ئەم هەڵە گەورەیە، رابەری شۆڕش لەشوێنی ئاوەها، خۆیو حەرەسەکانیشی لەخەودا بگیرێن. پاش ئازادکردنی لەژێر فشاری رای گشتیدا، دەستپێدەکاتەوە.
- چیگوارا؛ لێکدانەوەکانی هەموو هەڵە بون، لەسەر کوانوی شۆڕش لە بۆلیڤیا، بۆیە سەرەڕای ئەوەی جیفاراش بوو، نەیتوانی بزوتنەوە چەکداریەکە پەرەپێبدات بۆ شۆڕشو، بەبریندار گیراو شەهیدیش کرا.
- لینین؛ دەرکەوت کە زوو سەپاندنی شۆڕشی سۆسیالیستی، بە پاساوی تیۆری لەو هەلومەرجەی روسیادا، هەڵە بوو، هەزاران رەخنەی لێگیراوە. هەروەها لەسەر داگیرکردنی پۆلۆنیاش.
- ماوتسیتۆنگ؛ هەڵەی ستراتیژی کرد، بەناوی شۆڕشی رۆشنبیریەوە، گەر ئەو هەڵەیە راستنەکرابایەتەوە، چین هەرگیز نەدەگەیشتە رۆژگاری ئێستای.
- د.قاسملۆ؛ هەڵەیەکی کوشندەی نەکرد، کە بێ گارد، خۆی خستە داوی شەهیدکردنیەوە؟!

ئەو نمونانە، مشتێکی سەدان خەروار هەڵەی گەورەو بچوکن، کە لەمێژوودا کراوون. رەنگە، هەزاران تێکۆشەرو سیاسەتمەدارو نوسەر، لەکاتی خۆیدا ویستبێتیان، ئەو هەڵانە داپۆشن، یان پێچەوانەکەی بلاوبکەنەوە، بەلام گەر

بەشێوەیەکی کاتیش بۆیان چوبێتەسەر، سەرەنجام راستیەکان تیژتر دەرکەوتونو زیاتر ئازاری خاوەنەکانیشیان داوە.

نوسەر وادەزانێ، گەر بە رقەوە هێرش بکاتە سەر کۆمیتەی هەرێمەکانو کوێرانەش بەرگری لە خالە شیهابو هاوڕێکانی بکات، بەم کارەی، خزمەتیان دەکاتو خۆیشی دەبێتە قارەمانی مێژوو؛ کۆمیتەی هەرێمەکانیش لەبەرچاو دەخات. بێگومان هیچیان وا نییە.

لایەنی چاکەو خراپەی کۆمیتەی هەرێمەکان، بەشێکی دیارنو بەشەکەی تریشیان، زوو یان درەنگ دەردەکەون. هەڵەو راستی لە هەردوو بەشە زانراوو نەزانراوەکەدا، هەن. چەند پێویستە باسی چاکەکان بکرێن، لەوەش گرنگترە هەڵەکانیش رەخنەیان لێبگیرێ.

ئەگەر بەخۆشەویستیو قارەمانێتیو جوامێری شەهید شیهاب بێ، ئارەزوو ناکەم کێلەکەشی گەردی لێبنیشێ. بەڵام خۆشەویستی باسێکی ویژدانیەو سیاسەتو بەرپرسیارێتی نوسینی مێژووش، باسێکی زانستیو ئەمانەتێکی نەتەوەییە.

بەش بەحاڵی خۆم، ناتوانم رۆشتن بۆ ئێران، لەو هەلومەرجەدا، بەبڕیارێکی راست بزانم؛ کە تەسلیمیشیان کردنەوە، دەبوایە خالە شیهابو هاوڕێکانی هەوڵی هەڵهاتن بدەن. بەتایبەتی دوو پۆلیسیشیان لەگەڵدا بووە. لە باشماخیشەوە هەتا ناو پێنجوێن، بە پیادە هێناویانن. ئاکامی رۆشتنو لەرێگەدا هەڵنەهاتنو شەهیدکردنی ئەم سەروەرانە، کاریگەری خراپی لەسەر کۆمەڵەو یەکێتیو شۆڕش هەبوو. پاشان دەرکەوت، ئەم ئاکامە خراپانە، چەندە زیانیان بە کۆمەڵەو لەرێگەی کۆمەڵەشەوە، بە یەکێتی گەیاند. مەخابن، نوسەر هیچی ئەو راستیانە لەبەرچاوناگرێو خۆیشی لە خزمەتکردنی مێژوو دووردەخاتەوە. تەنها بۆئەوەی هەرچی هەیەو نییە، بخاتە ئەستۆی کۆمیتەی هەرێمەکان.

هـەڵهاتنی زینـدانییش، لەمێـژووی زیندانیانـدا، چ لـەناو زینـدانو چ لـەکاتی گواستنەوەیاندا، هەمیشە رویداوە. بەڵکو جاری وا هەیە لەناو زیندانـەوە لـەژێر دیوارەکانـەوە تونێـل لێـدراوە بـۆ هـەڵهاتن. سـەبارەت بـە رابـەرانی رێکخـراوە چەپەکانو سیاسیەکانیش هەروا بـووە. بـۆ نموونـە، رابـەری بـەرەی رزگـاریخوازی میللـی فەلەسـتین، نەخشـەی فڕانـدنی خـۆی لـە زینـدانی سـوریا، بەمشـێوەیەی خوارەوە دەگێڕێتەوە:

" رۆژێکیـان، لـە وەدیـع حـەداد، نامەیـەکم لەرێگـەی حەرەسـێکەوە کـە پەیوەندیەکی باشـم لەگـەڵ هـەبوو، وەرگـرت. لەنامەکـەدا زانـیم کـە هاوڕێکـانم خەریکی فڕاندنمن لە زیندان. ئەویش لەرێگەی رێکخستنی سـەردانی خێزانیـەوە. دوای نۆ مـانگی درێژ لـە گـرتن، بەڕێوەبەرایـەتی زینـدان رێگـەیان بـە سـەردانی خێزانـی داو دوو هـاوڕێی ئـافرەت ئـەنجامیان دا، وایـان رێکخسـتبوو گوایـە خوشـکەزامن. بـەڵام راسـتیەکەی ئەوەیـە کـە وەدیـع حـەداد هەڵبـژاردبون بـۆ تەگبیرکردنی هەڵهاتنەکـەم. چاوپێکەوتنیان لـە مەکتـەبی موخابـەراتی زینـدان لەگەڵیاندا بۆ رێکخستین. لـەکاتی گێڕانـەوەم بـۆ زینـدان، هاوڕێیانمـان بـە جلـی ئەفسەریەوە توانییان لـە رێگـەدا سـەیارە سـەربازیەکەی دەیواسـتمەوە رابگـرن. حەرەسێك کە بە پیلانەکەی زانی هەوڵی دا بـەرەنگاری بکـات، بـەڵام هاوڕێیـانم توانیان بمفڕێننو حەرەسەکەش بە بارمتە گیرا هەتا گەیاندیانـە سـنوری سـوریا-لوبنان، ئینجا حەرەسەکەیان بەرەڵڵا کرد. لەوێشەوە بەرێگەی قاچاخ سەیارەیەك بەخێرایی سنوری بڕیو لەرێگەی دەشتایەتی بقاعەوە، هەڵشاخاین بە شاخەکانو سەرماو سۆڵەی سەختەوە، گەیشتینە بەیروت." (*)

* جورج حبش- الثوريون لا يموتون ابداً - حاورە جورج مالبرنيو — دار الساقي، الطبعة الاولى ٢٠٠٩ ، الطبعة الثانية ٢٠١١. ص(٨٠)

خۆزگە.. بیچێنی سەوز نابێ، بەلاّم هەر دەڵێم: خۆزگە خاڵە شیهابو هاورێکانی مابانو رابەرایەتی شۆڕشیان کردبا، هەنگینێ دەزانرا، نوسەرو کەسانی وەکو ئەو ئەرکە قورسەکانی شۆڕشو کۆمەڵەیان رادەپەڕاند، یان ئەو کەسانەی بە هەقو ناهەق نوسەر رەخنەئاژنیان دەکات؟

کەسایەتی گەر خاڵە شیهاب لەباتی مام جەلالیش سکرتێری یەکێتیو فەرماندەی هێزی پێشمەرگە بوایە، هەر زوو بۆی دەردەکەوت، کەسانی وەکو نوسەر، تێکۆشەری راپەڕاندنی ئەرکی قورسو شەڕە چارەنوسسازەکان، نین. ئەم حوکمدانەشم لە تاقیکردنەوە بۆدەرکەوتووە. هیچ ناڵێم، هێندە نەبێ، یەك پێشمەرگەی راستەقینەم لە سەرکردایەتی، لە قەراغ، لەناو کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران، تەنانەت یەك پێشمەرگەش لە کوردستانی ئێرانو عێراق شایەتی بدات کە نوسەر، لە شەڕدا، لە تەنگانەدا، لە بەرگریدا، یان لە هێرشدا، لە شاخ یان شار، بۆ یەك جاریش، یەك فیشەکی تەقاندبێ، یەك هەڵمەتی بردبێ، نەك کلاّشینکۆف، بەڵکو یەك مەخزەنی کلاّشینکۆفیشی دەستخستبێ.. ئەوکاتە من باوەڕ بە سەراپای کتێبەکەو سەرگوزشتەکانی دەکەم. ئاخر کەسێك، دەهەیەك زیاتر پێشمەرگە بوبێ، هەر هیچ هیچی نەکردبێ، جگە لە کێشە دروستکردن، کەسی ئاوا، تۆ بڵێی ئازایەتیو توانای خۆی بۆ کەی هەڵگرتبێ؟ خۆ بەتەما نەبووە، خاڵە شیهابو هاورێکانی زیندووبینەوەو لەجیهانێکی تردا، شۆڕش بکەنو لەو شۆڕشەی جیهانە خەیاڵاویەدا، هەڵمەتەکانی بەرێ.

وەکوتریش.. هاورێکانی شەهید شیهاب، ئەوەی ناونرا تەکەتولی زیندان، خۆ ئەمانە هاتنە ریزی شۆڕش. دوای نوسەر بە دووساڵیش هاتن؛ نوسەر هەر زوو لێیانئالاّو کوتومت، بۆچونەکانی ئەم کتێبەی ئەوکاتە بۆ هەڵڕشتبوون. بەڵکو یەکێك بوو لەوکەسانەی، رۆڵێکی خراپی لە پەیوەندی نێوان هاورێیانی سەرکردایەتیدا گێڕاو بوشە مایەی ناکۆکیو ململانێیەکی ناخۆش لەنێوانمان.

سـەرەڕای ئـەم رۆڵـە تێکدەرانـەی، لەبەرئـەوەی ئـەم کەسـە کەسـێکە، نـوقمی خۆپەرستییە، ناتوانێ لەژێر کاریگەری نەخۆشییە دەرونیەکانی، کەسایەتی خۆی تەنانەت لەگەڵ نزیکترین کەسەکانی خۆشیدا بشارێتەوە. بۆیـە، زۆری نەخایانـد، بـۆ بەشـێکی هاوڕێـانی زینـدان دەرکـەوت، هەڵسـوکەوتی چـۆنەو بـە چ مەرامێکیش قسەدەکات. لەبـەر ئـەم هۆیـە، گوایـە لەسـەر لیسـتی هاوڕێـانی زیندان ماڵ بوو، بەڵام لە هیچ کۆنفرانسێکدا بایی ئەوە دەنگی نـەدەهێنا، هـەتا دەربچـێ بـۆ سـەرکردایەتی. لـە هـەموو کۆنفرانسـێکیش بـەبێ ئـەوەی هـاوڕێ نزیکەکانی گفتیان پێ دابێ دەنگی بدەنێ، هەر خۆی کاندید دەکردەوە.

## ٢٤

## کۆبونەوە لەگەڵ ئارام

لە درێژەی گێڕانـەوەی سەرگوزشـتەی روداوەکـان، کـە ئاشـکرا بـە قسـەکانی نوسەردا دیارە، چ رۆڵێکی بۆ یەکنەخستنەوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە گێـڕاوە، لە لاپەڕە (٨٢)دا باسی ئەوە دەکات کە:

(( بە هەڤاڵ دلێرم ووت: " بۆ نزیکەی یەك مانگە ، کە تۆ داوات کرد و من پێم وابوو ئەوسا ئەو داوایەی تۆ، هی شاسوارە یەکتر ببینین، تا ئێسـتا دەنگیـان نەبووە، بۆ ئێستا پاش تەسلیم کردنەوەی هەڤاڵان ، دەیەوێ یەك ببینین؟ وادیارە ئێستا ئیتر دڵنیابوون لە گرتنی هەڤاڵانی سەرکردایەتی و دەرباز نەبوونیان. بۆیە دەیەوێ یەکتر ببینین". بەهەرحاڵ قایل بـوونم دەربـڕی و رۆژی ١٩٧٦/١/١١ لـە ماڵی هەڤاڵ دلێری سەید مەجید لەگەڵ شەهید شاسوار (شەهید ئـارام) یـەکمان بینی، بـە ئامـادەبوونی هـەڤاڵ دلێـرو کۆبەنـدی گفتوگۆکانمـان لـە تـەوەری ئـەم خاڵانەی خوارەوەدا بوو: ..))

ئـەم پیـاوە، لەگۆڕیشـدا، پێـی خۆشـە ئـازاری روحـی شـەهیدانو هاوڕێیـانی شەهیدان بدات. بۆ کەسێکی وەکـو شـەهید ئـارام، کـەی رەوایـە بگـوترێ: "بـۆ ئێستا پاش تەسلیم کردنەوەی هەڤاڵان ، دەیەوێ یەك ببینین؟ وادیارە ئێستا ئیتر دڵنیابوون لە گرتنی هەڤاڵانی سەرکردایەتی و دەرباز نەبوونیان."

ئەم قسانە، لێوانلێو نوقمی رقی کوێرانەیە. جارێ هاوڕێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵە، دەمێک بوو دەزانرا لەئێراندا گیراون. پاشان، لە (١٩٧٦/١/١)دا، رادەستی عێراق کرانەوە. مەسەلەی هەوڵدانیش بۆ فڕاندنیان، لەرێگەی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، بەرەزامەندی شەهید ئارام گفتوگۆی لەسەرکرا. ئەوەی لەبەینیشمان بوو (پاکیز)ی هاوسەری کاک فەرەیدون عەبدولقادر بوو، نەک عەلی ئامەخانی برای پاکیزە، کە ئەوسا گیرابوو. پاکیزە سەری لە پێنجوێن‌و لە زینداندا‌و چاویشی بە شەهید شیهاب‌و هاوڕێیان کەوت. وەڵامەکەشی لەرێگەی شەهید جەمالە رەشەوە گەیاندە کۆمیتەی هەرێمەکان، کەوتیشینە هەوڵ بزانین دەتوانین بۆسەیەک لەرێگەدا، بۆ فڕاندنی هاوڕێیان دابنێین یان نەء. بەڵام هەتا کەوتینە سۆراغی چەک پەیداکردن‌و پێشمەرگەی کارامە، هاوڕێیان تەسلیم کرانەوە. کارەکە ئاسان نەبوو، بەڵام کات‌و سەیارەو چەک هەبوایە، رەنگبوو (٥٠٪) زیاتر یان کەمتر کارەکە کرابا. بەڵام چی لەگەڵ رێکخستنێک دەکەی کە تاقە چەکێک‌و پەناگایەک‌و شڕە سەیارەیەکیشی نەبوبێ. کاتیش رۆژێک بەدەستەوە بووە؟ ئیتر چۆن شەهید ئارام، گوایە، دوای دڵنیابون لە تەسلیمکردنەوەی هاوڕێیانی سەرکردایەتی، بڕیاری بینینی نوسەری دابێ؟ نوسەر دەیەوێ وای لە خوێنەر بگەیەنێ کە شەهید ئارام پێی خۆش بووە، هاوڕێیان تەسلیمکراونەتەوە، بۆیە بە کەماڵی ئیسراحەت، بڕیاری چاوپێکەوتنی نوسەری داوە.

دوای ئەو قسانەی، باسی چاوپێکەوتنی خۆی‌و شەهید ئارام دەکات‌و زنجیرەیەک خاڵ ریزدەکات. لەوانە شەهید ئارام لە لاپەرە (٨٣)دا وتویەتی:

" أ- رێکخستنەکانی هەردوو کۆمیتەکە پێکەوە رێکبخرێنەوە.

ب- هەردوو کۆمیتەکە ببنە یەک کۆمیتە و لەژێر یەک ناویشدا کار بکەن.

ج- هەوڵ بدرێ گەر وەرزیش بێ ئۆرگانی کۆمەڵە دەربچێت.

د- بۆ مەبەستی خاڵی (ج) دەبێ کۆمیتەی شارەکان تایپ و رۆنیۆکەی کۆمەڵە تەسلیم بە کۆمیتە تێکەڵە بکات ، کە هەر بە ناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە بمێنێتەوە."

سەبارەت بە یەکخستنەوەی دوو کۆمیتە، دوورونزیك راست نییە. بەڵکو داوای لێکراوە کە واز لە هەوڵی تر بێنێو ئەویش وەکو زۆربەی هاورێیان بەهێمنی ئەرکەکانی راپەرێنێ. زیاتریش لەوە، شەهید ئارام کە باشی ناسی، ئیتر پشتگوێی خست.

بۆ تایپو رۆنیۆکە، راستە داوای لێکراوە. خۆیشی راست دەکات نەیداوە. بەڵام دوای کۆبونەوەکە، هەڤاڵ دلێری سەید مەجید بەتەواوەتی بۆی دەرکەوتبوو کە بۆچونەکانی شەهید ئارام راستو ئەوی نوسەر ناراستن، بۆیە، تایپو رۆنیۆکەی بەبێ پرس، لەرێگەی (سوارەی ئەحمەد عارف – ئێستا لە مانهایمی ئەڵمانیایە) تەسلیم بە کۆمیتەی هەرێمەکان کردو تەنانەت بوو بە یەکێك لە متمانەپێکراوترین کەسەکانی شەهید ئارامیش، لە شارو شاخیشدا.

لە وەڵامی ئەو خاڵانەی بەناوی شەهید ئارامەوە ریزی کردون، نوسەر ئەم خاڵانەی خۆیشی ریزدەکاتو لە لاپەرە (٨٣-٨٤)دا دەڵێ:

" داواکانی بەندە:

١-ئێمە پێمان شك نایە ، کە ئەوەی ناوتان لێناوە کۆمیتەی هەرێمەکان رێکخستنتان لەناو کۆمەڵەدا هەبێ. مەگەر بە (خط مائل) ، چونکە رێکخستنەکانی ئازاد هەورامی ئاگاداریەتی ، کۆمیتەی شارەکان سەرپەرشتیان دەکەن ، تۆش و نەجمەدینیش زۆر لە مێژە کۆمەڵە نین و لە کۆمەڵەش دابڕاون.

٢-كۆمیتەی شارەکان، بە هیچ جۆرێك دان بە شەرعیەتی ئێوەدا نانێن، تا لەگەڵتان تێکەڵ ببنەوە.

٣-هەر ئۆرگانێکیش دەربچێ، دەبێ هەر بەناوی ئالآی سورەوە بێ و هەمان رەوت رێباز و ئایدیۆلۆژی کوردستانیەتی کۆمەڵەی تیا رەنگ بداتەوە.

٤-کۆمیتەی شارەکان بە هیچ جۆرێ ئامادە نیە تایپ و رۆنیۆ و ئەو چەردە پارەیەی لە ئەندامان کۆکراوەتەوە بیدا بە ئێوە . دەکرێ بێ دروستکەن و ببنە پارویەکی چەوری ئاسان بە دەسکەوتووی رژێم و گورزێکی کوشندە تریشی پێ لە کۆمەڵە بدرێ."

بۆ خاڵی یەکەم و دووەم، کە کۆمیتەی هەرێمەکان رێکخستنی نەبوبێ لەناو کۆمەڵەدا، پاش کەمێکی تر خۆی دەیسەلمێنێ کە پێچەوانەکەی راستە.

سەبارەت بە خاڵی سێهەمیش، نە ئەوساو نە دوای ئەوەو نە لە شاخیشدا، تەنانەت دوای ئەوەی دەستەی هاورێیانی زیندان لەناو کۆمەڵەدا، شوێنی شیاویان هەبوو، ئۆرگانی (ئالآی سور) دەرنەکرا. چونکە نەدەگونجا لەگەڵ رێبازی شۆرشی رزگاری و دیموکراسی.

بۆ خاڵی چوارەمیش.. وەکو لەسەرەوە باسمان کرد، کاك دلێری سەید مەجید تایپ و رۆنیۆکەی تەسلیمکردەوە کۆمیتەی هەرێمەکان. وردە وردە کە کۆمیتەی هەرێمەکان سەرکەوتوو بون، کەس لەدەوری نوسەر نەمایەوە.

هەر لەم رێرەوەی روداوەکاندا، دەرونی خۆی باشتر دەردەخات و دەیسەلمێنێ کە چەند رقئەستورە! با دیقەت بدەین لە لاپەرە (٨٤)دا چی لەسەر کۆبونەوەیەکی خۆیان دەگێرێتەوە:

" أ- پێویستە کۆمیتەی شارەکان پەلە بکەن لە دەرکردنی بەیانێك لەسەر کۆمیتەی هەرێمەکان رونکردنەوەی چۆنیەتی پێکهاتەیان ، نیاز و مەبەستیان، رەوتی بۆچوونیان و رۆڵیان لە ناکۆکی عێراقچێتی و

کوردستانی و پاشان تاوانبارکردنیشیان بە تەقەلای کەرت و پەرتکردنی ریزەکانی کۆمەڵە."

ئـەم قسـانەی، لەسـەر ئەوەیـە کـە کۆمیتـەی هەرێمـەکان، ویسـتویەتی هەڵسـەنگاندنێك لەسـەر دۆخـی سیاسـیو کۆمەڵـە لـە ریزەکـانی کۆمەڵـدا، بڵاوبکاتەوە کە پاشان بە (راپۆرتی شوبات) ناویـانگی دەرکـرد. پاشـان دێینـەوە سەر ئەم راپۆرتە.

دەربارەی ئەو پەرەگرافەی نوسیویەتی، وەکـو کاردانەوەیـەك لەسـەر نوسـینی ئەو هەڵسەنگاندنە، ویستویانە چی بکەن. چی دەردەخات؟

دەڵێ: پێویستە کۆمیتەی شارەکان پەلە بکەن لە دەرکردنـی بـەیانێك لەسـەر کۆمیتەی هەرێمەکان.

سەیرە..! جارێ بەیان، یان هەڵسـەنگاندنەکە دەرنەچـووە، ئـەمان ویسـتویانە پەلـە بکـەن لـە دەرکردنـی بـەیان. بـەم ئاسـتی تێگەیشـتنو رقەبەرایـەتیو کاردانەوەیـە، جـوانی دەردەخـات نـاخی پـڕ بـووە لـە چ جـۆرە بیرکردنەوەیـەکی زیانبەخش!

لە کاردانەوەکەیدا، دوا چۆری رقی خۆیو ئەوانەی وەکو ئەوون، بەم شێوەیەی خـوارەوە هەڵدەڕێـژێ: (رونکردنـەوەی چـۆنیەتی پێکهاتـەیان، نیـازو مەبەسـتیان، رەوتی بۆچونیانو رۆڵیان لە ناکۆکی عێراقچێتیو کوردستانی).

بەم رستانەدا دیارە کـە ویسـتویەتی، پـێش ئـەوەی بەیاننامەکـەش دەرچـێ، ریزێك تۆمەت بۆ کۆمیتەی هەرێمەکان دابتاشێ، هەتا بەم رێگەیەوە، نـاکۆکیو ململانێی نێـوان ریزەکـانی کۆمەڵـە قـوڵتر بکـات، بـەڵکو بتوانـێ خـۆی بکاتـە کەسـایەتی یەکـەم. ئەمـەش ئۆبـاڵێکی گەورەیـە، کەسـێك، دۆخـی ئـاڵۆزی رێکخراوێك بەپێی باری دەرونی خۆی بقۆزێتەوەو هەوڵیش بدات، ببێتـە مایـەی ئاشوبێکی گەورە لەناو هاورێکانیا.

سەیرتر لە هەموو ئەو قسانە، لە کۆتایی ئەو پەرەگرافەدا، بێ پێچو پەنا، دەنوسێ: پاشان تاوانبارکردنیشیان بەتەقەلای کەرتو پەرتکردنی ریزەکانی کۆمەڵە.

رەنگە، ئەم رستەیە، ئاسایی لەسەر بەشێك لە خوێنەران تێپەرێت. بەڵام لەراستیدا، بەڵگەی گلۆڵەی رقی تۆڵەسەندنەوەیە. رستەیەکە، نوسەر نەیتوانیوە خۆی بگرێ، هەوڵیداوە، سەرەنجامی ئەو رقەی ئەوسا دژی کۆمیتەی هەرێمەکان هەیبووە، لەم رستەیەدا بەرجەستە بکات. من دەپرسم وشەی (تاوانبار کردنیشیان) چی دەگەیەنێ، جگەلەوەی ئەم نوسەرە، بۆ شکاندنی بەرامبەرەکەی (٣٥) ساڵ لەمەوبەر، هەموو رێگەیەکی گرتۆتەبەر؟ (تاواتبارکردنیشیان) واتا: کۆمیتەی هەرێمەکان خۆیان تاوانبارنین، یاخود تاوانەکانیشیان هێشتا نەسەلماوە، بەڵام ئەم پێشوەخت تاوانباریان دەکات. بە چیش تاوانبارمان دەکات؟ بە کەرتوپەرتکردنی ریزەکانی کۆمەڵە.. ئاخر کۆمەڵە خۆی کەرتوپەرت بووبوو شیرازەی رێکخستنەکانی پسابوو. پەیوەندی شانەکان نەمابوو. ئیتر چی کەرتوپەرت بکرێ. کۆمیتەی هەرێمەکان تانوپۆی شیرازە پساوەکەی چنیەوەو گەیاندیە ئاستێکیش نوسەر پیلان بگێرێ، بەڵکو ببێتە قارەمانی مەیدانەکە.

لەو کۆبونەوەیەی کردویەتی، کەسانی دڵسۆزی تیابوەو بیروبۆچونەکانی نوسەریان زۆر پێ خراپ بووە، بۆیە بەرپەرچیان داوەتەوە، خۆی لە لاپەرە (٨٥)دا دەڵێ:

> "ب- دووهەم پێشنیار ئەوە بوو، کە پەلە لەو کارە نەکرێ. بەڵکو هەوڵبدرێ بە زووترین کات پەیوەندی بە ئەندامە گیراوەکانی سەرکردایەتی بکرێ، بە تایبەت شەهاب شێخ نوریەوە بکرێ."

ئـەم هاوڕێیانـە شـەهید عەبـدلرەزاقی تیـابووە، عەبـدولرەزاق، خـەڵکی کەرکوکـەو تێکۆشـەرێکی سـەرەتای کۆمەڵـە بـوو. پیـاوێکی جـوامێر. پێشـتر نوسەرو هاوڕێکانی ناسیووە، بەڵام کە کۆمیتەی هەرێمـەکان پێکهـات، سـەرەتا بەوریاییـەوە پەیوەنـدی پێـوەکرد. زۆریـش چارەنوسـی هاوڕێیـانی زینـدانی لـە هەنگاوەکانیا دەخستە پێش چاو. بـەڵام بـەرە بـەرە تێگەیشـت کـە کۆمیتـەی هەرێمەکان دەتوانن کارەکان راپەڕێنن، نەك نوسـەر و ئـەو هاوڕێیانـەی لەتـەکیا بـون. گوناحیشـە نوسـەر دەیـەوێ وای پشـانبدات گوایـە (شـەهید عەبدولرەزاق بـەئاگاداری کۆمیتـەی شـارەکان لـە کۆمیتـەی هەرێمەکانیشـدا کـاری دەکـرد- لاپەڕە ٨٤) ئەم دێڕە، وەکو ئەوە وایە، کۆمیتەی هەرێمـەکان زۆر خـراپ بـوبن‌و شـەهید عەبـدولرەزاقیش جاسـوس بوبـێ لەناویانـدا. وا نییـە. عەبـدولرەزاق، نەیدەشاردەوە کە پەیوەندی هاوڕێیەتی بە نوسـەرو هاوڕێیـانی زیندانـەوە هەیـە. هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیشی دەدا. تەنانەت لەسـەر راپـۆرتی شـویاتیش، یـەکێك بـوو لەوانـەی گفتوگـۆی باشـی کـردو کاریگەریشـی بۆفـۆرمیلای هەڵسـەنگاندنەکە هـەبوو. بـۆ بـەرپابونی شۆڕشـیش، بیروبۆچـونی تایبەتیشـی هـەبوو. پێـی وابـوو، جڵـەوی شۆڕشـەکە لەدەسـت کۆمەڵـە دەردەکـرێ‌و دەبـێ لەمبارەوە زۆر وریابین. ئەم بۆچـونانەی هـەبوو. بـەڵام وەکـو ئەنـدامانی دیکـەی کۆمیتەی هەرێمەکان، پابەند بوو بە بڕیارەکان، هەتا رادەی بـەرپابونی شـۆڕش‌و پێکەوەنانی یەکەمین مـەفرەزەی شۆڕش لە دەشتی هـەولێر بەرابەرایـەتی شـەهید (عەلی ساڵح). (*)

(*) یەکەمین مەفرەزەی کۆمەڵە لە دەشتی هەولێردا، شەهیدان (عەلی ساڵح)و شەهید (محەمەد عەجەم)و شەهید (عەلی ئاوماڵ)و شەهید (ئامیق تەقتەقی)و شەهید (فاروق) بون. پاشان، شەهیدان شاخەوان‌و ڕێبازو نەبەز، هەروەها نەریمان (سامی — کارگێڕی مەڵبەندی کۆیە) هێمن (ئێستا ئاسایشەو ناوی زرارە) شەهیدان ئازاد خۆشناو و شێرزادی برای. سەرکەوتی گردەسور.

باشترین بەڵگەش کە شەهید عەبدولرەزاق‌و هاوڕێ دڵسۆزەکانی نەیانهێشتووە نوسەر مەرامەکانی، لە دەرکردنی بەیاننامەی دژی کۆمیتەی هەرێمەکان دەربکات، بەرپەرچدانەوەیەتی، سەرەنجام بڕیاردانیشیانە بۆ پەیوەندی پێوەکردنی هاوڕێیانی زیندان. نوسەر خۆی لە لاپەڕە (٨٥)دا دەڵێ:

" پێشنیاری دووهەم بە دەنگ سەرکەوت‌و بڕیاردرا بەندە پەیوەندی بە شەهید شەهابەوە بکات."

ئەمە گومان ناهێڵێ کە نوسەر لەناو ئەو هاوڕێیانەشدا کە خۆی متمانەی پێکردوون‌و دژی کۆمیتەی هەرێمەکان پشتی پێبەستون، لەبەرئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان سەرکەوتوو بون، بەرە بەرە بەقسەیان کردوەو بەقسەی نوسەریان نەکردووە. کە دەشڵێ بە دەنگ سەرکەوت، ناڵێ چەند کەس بون. چەند دەنگ دژی بون. هەر دەڵێ: پێشنیاری دووهەم بە دەنگ سەرکەوت.. وادیارە، تەنها خۆی‌و دەنگە تاقانەکەی ماونەتەوە!!

## ٢٥

## دانیشتنی وا نەبووە !!

نوسەر لەدرێژەی ئەم سەرگوزشتەیەدا، هۆنینەوەکەی دەگەیەنێتە هەڵبەستنی کۆبونەوەیەك قەت نەکراوە. با جارێ دیقەت بدەین لە لاپەڕە (٨٥)دا چۆنی هەڵبەستووە:

" لەڕێگەی شەهید عبدولرەزاقەوە داوای دانیشتنێکمان لێکردن لە ١٩٧٦/١/٢٥ لەماڵی شەهید سیروان (فەیسەڵ تاڵەبانی) نوێنەرانی هەردوولا کە بریتی بوون لە : (ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب)، شەهید سیروان، و بەندە لە کۆمیتەی شارەکان، حکمت محمد (مەلا بەختیار)، شەهید ئازاد هەورامی لە کۆمیتەی هەرێمەکان). "

کۆبونەوەی وا دوورونزیك لەماڵی شەهید سیروان نەکراوە. من.. لەو ماوەیەی خۆم شاردبوەوە لە سلێمانی، شەوێکیان لەماڵی شەهید سیروان خەوتومو هەتا نیوەشەو قسەمان لەسەر کۆمەڵە کردووە. وەکوتر، بیرمە ئەوکاتە شەهید سیروان تەنها ژوورو هەیوانێکیان بەکرێ گرتبوو، گەڕەکەکەشیان نزیك ماڵی پارێزگاری سلێمانی بوو، بۆ ئەم جۆرە کۆبونەوەیە، شیاو نەبوو.

ئەم دانیشتنەی بۆیە هەڵبەستووە هەتا بەخوێنەری بڵێ؛ من سەرپەرشتی بەشێکی ڕێکخستنەکانم دەکردو کۆمیتەی هەرێمەکانم ناچارکردووە لەگەڵمانـدا دانیشنو بەبێ من هیچیان پێنەکراوە. ئەمە ڕاست نییە. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە

کاتێك کۆمیتەی هەرێمەکانمان پێکەوەنا، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە شیرازەیان پسابوو. کەس پەکەس نەبوو. نائومێدی باڵی بەسەر هاوڕێیاندا کێشابوو. نوسەرو ئەو هاوڕێیانەی باسیان دەکات گوایە (کۆمیتەی ڕێکخستنی شارەکان)یان هەبووە، لە ڕۆشتنی خاڵە شیهابو هاوڕێیانی زیندان مانگی (۱۹۷۵/۹) هەتا دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکان، دەبوایە بەیانێك دەربکەن، سەردانی هاوڕێیانی خۆشاردوو بکەن، نومێدێك بە ڕێکخستن ببەخشن، جموجۆڵێکی کاریگەر بنوێنن. هیچی ئەمانەیان نەکردووە، ئەگەر لەدڵی خۆیاندا کۆمیتەی ڕێکخستنی شارەکان بوبون، ئەمەیان دەشێ!!

بۆچی کە کۆمیتەی هەرێمەکان پێکەوەنرا، دەستوبرد، کەوتە کۆبونەوە، هەڵسەنگاندنی دۆخەکە، گرتنەوەی شیرازەی پساوی ڕێکخستن، شانەکانی بوژانەوە، پەیوەندی شارەکانی پێکەوەبەستەوە، پەخشنامەی ناوخۆیی دەرکرد، کەوتە هەوڵ بۆ پەیوەندی پێوەکردنی مام جەلالو دەرەوەی وڵات.. تاد؟

ئەو هەوڵانەی کۆمیتەی هەرێمەکان لەماوەی مانگێکدا ئەنجامیدان، کەچی کۆمیتەکەی لەمەڕ نوسەر چوار مانگ متو مەنگ، دەستیان بە کڵاوی نائومێدیەوە گرتووە، نەکا بای بەعس بیباو لەزیندانی توند بکا؟ ئاخر کەسێك ئەم جیاوازیانە نەبینێ لەنێوان دوو کۆمیتەدا، ئێستاش بیەوێ بە ڕقو تۆڵەسەندنەوە، ڕوداوەکان بەهەڵگێڕاوی‌و هەڵبەستراوی‌و چەواشەکاری بگێڕێتەوە، بێگومان نوسینی لەمجۆرە، لەمێژوودا کاریگەری نابێ، ئەگەر تەنهاوتەنها دەرونی ئەو کەسانە ئاسوودە بکات کە وەکو نوسەر بیردەکەنەوە.

## ٢٦

## بەیانی شوبات، لە شوباتێکی چارەنوسازدا

لە زۆر شوێندا، باسی دەرکردنی بەیانی شوبات دەکات‌و دەیکاتە بەڵگەی پیلانگێڕانی کۆمیتەی هەرێمەکان لە هاوڕێیانی زیندان. زۆرتر بەرۆکی شەهید (ئارام)یش لەم باسکردنانەیدا، دەگرێ. کە بەداخەوە، لەسەراپای نوسینەکەیدا، هەر دەڵێ (شاسوار جەلال) تەنانەت ناوی شەهیدیش بە شەهید ئارام رەوا نابینێ. کەسێك، هێندە رقی لە شەهید ئارام بێ، کە پاش دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکان‌و بەرپابونی شۆڕش، دەرکەوتبێ چ رۆڵێکی مێژوویی گێڕاوە، ئیتر چۆن رقی لە منو کاك سالار و کەسانی دیکە نابێ؟ ئاخۆ ئەم نەخۆشییە دەروونیەی نوسەر، چەند قوڵ بێ؟ کە وایان لە نوسەر کردووە، رقی لە شەهید ئارامیش بێ، کە شەهید وێردی سەر زمانی تێکۆشەرانی یەکێتی‌و شۆڕشگێڕانی کوردستانە. بەڵکو نوسەر دەزانێ کە ناوی ئارام هێندە خۆشەویست بووە، لەناو ریزەکانی یەکێتیدا، هیچ شەهیدێك بەئەندازەی شەهید ئارام، منالانی بەناوەوە نەنراوە. کەچی نوسەر گوێ ناداتە هیچی ئەو راستیانەو رێز لە هەستی خۆشەویستی خەڵك بەرامبەر شەهید ناگرێ‌و لەسەراپای نوسینەکەیدا، هەوڵ دەدات لە کەسایەتیشی کەمبکاتەوە. بەهەرحاڵ..

کە دێتە سەر بەیانی شوبات، بە یەکێك لە خراپترین بەیاننامەو هەڵسەنگاندنەکانی دەزانێ‌و دەیەوێ لەرێگەی ئەم بەیانەوە دەریبخات کە گوایە کۆمیتەی هەرێمەکان چەند پیلانگێڕ بون. لەو کۆبونەوەیەی هەڵیبەستووەو

ئاماژەمـــان پێکـــرد کـــە هـــەرگیز کۆبونـــەوەی وا لـــەماڵی نوســـەردا نـــەکراوە، مەرامەکانی لە سێ خاڵی درێژدا باسی کردۆتەوە کە ناچارین چڕیان بکەینـەوەو بەپوختی بەمشێوەیە باسیان بکەین:

١-باسنەکردنی هاوڕێیانی زیندان، چونکە لە لێکۆڵینەوەدا لەسەریان دەکـەوێ، بەهیچ شێوەیەکیش بە (منحرف) باس نەکرێن.

٢-لەو بارودۆخەدا کە ڕاگواستن‌و کاولکردنی دێهات لەئارادایە باسـی ریفـۆرمی کشتوکاڵ نەکرێ.

٣-ناوی کۆمەڵەو بەشێکی بەندەکانی پەیڕەوی ناوخۆکەی، دەسـتکاری نـەکرێ. هەر (کۆمـەڵەی مـارکسی- لینینـی- ئەندێشـەی مـاوتسـیتۆنگ) بێنێتـەوە. (بڕوانە لاپەڕەی ٨٥ و ٨٦ و ٨٧ و ٨٨).

ئێمـە.. لەسـەر گریانـەی کۆبونـەوە هەڵبەسـتراوەکەی نوسـەر، ئـەم خاڵانـەو ڕاپۆرتی شوبات، شـەنۆکەو دەکـەین. بـا لـە ڕاپـۆرتی شوباتیشـەوە تێهەڵبچـین. پێشەکی دەپرسین ئەو ڕاپۆرتە یان ئەو هەڵسەنگاندنە بۆ؟

لەبەرئەوەی کۆمەڵە، دوچاری جەزرەبەیەکی ڕێکخراوەیـی‌و سیاسـی هـاتبوو، هاوڕێیانیشـی جۆرێـك لـە نائومێـدی دایگرتبـون. بـۆ شـەش مـانگ دەچـوو، ڕێکخراوەکـە بەیاننامەیـەکی دەرنـەکردبوو. دەیـان پرسـیار لەسـەر چارەنوسـی کۆمەڵەو دۆخەکە لەسەر زاری هاوڕێیان‌و دۆستانی بـوو. کـەس نـەبوو وەڵامیـان بداتەوە. دەشبوو شیرازەی ڕێکخستنەکان بگێڕێتـەوەو شـارەکان ڕێکبخرێنـەوەو کۆمەڵەش بۆ شۆڕش ئامـادە بکـرێن. دەی ئـەم ئەرکانـە، بـەبێ هەڵسـەنگاندنی دۆخـی سیاسـی‌و بـاری کۆمەڵـە، ئەنجامنـەدەدرا؟ بۆیـە، کۆمیتـەی هەرێمـەکان گەیشتە ئەو باوەڕە کە هەڵسەنگاندنێکی هەمەلایەنە، پێویستە. ئـەو خاڵانـەی بڕیاریش درا، بکرێنە بنچینەی هەڵسەنگاندنەکە، ئەمانەی خوارەوە بوون:

یەکەم: باسکردنێکی کۆمەڵەو ئاکامی ئەو روداوانەی بەسەر سەرکردایەتیو کادرەکانی هاتن.

دووەم: باسی سیاسەتی رژێم لە چەوساندنەوەی گەلەکەمانو مەترسی تەعریبو تەرحیلو تەهجیر لە رۆژگارەکە.

سێهەم: شکستی سیاسەتی خۆماڵیکردنی نەوتو ریفۆرمی کشتوکاڵی رژێم لە عێراقو کوردستاندا.

چوارەم: چۆنیەتی خەباتکردنو راپەڕاندنی ئەرکەکانمان.

پێنجەم: باسێکی هەلومەرجی جیهانیو رێبازی شۆڕشگێڕانەی مارکسیزم-لینینیزم.

ئەو خاڵانەم لەبیرە کە گفتوگۆمان لەسەر دەکردن، بۆئەوەی ببێتە هەوێنی هەڵسەنگاندنەکە. لەناویشماندا، جگە لە شەهید ئارام، کەسی دیکەی بەتوانا، ئەوکاتە نەبوو، کاری گرنگی وای پێ ئەنجامبدرێ. بۆیە ئەرکەکەی پێسپێردرا. لە کۆبونەوەی ئایندەدا، شەهید ئارام ئەم هەڵسەنگاندنەی نوسیبوو. بۆ مێژوو، راستیەکان وەکو هەبون، هێندە بیرم ماوون، باسدەکەمو باسەکەش وەڵامدانەوەی سێ خاڵە پوختکراوەکەی نوسەریشە.

شەهید ئارام؛ رۆشتنی هاوڕێیانی بۆ ئێران، بەهەڵەیەکی گەورە دەزانی. چونکە پێشتر بڕیاری وایان نەبووە. لەگەڵ مام جەلال لە سوریادا، کاك فەرەیدونو شەهید ئەنوەر، لەسەر ئەوە رێکەوتبون، کە خۆیان بۆ شۆڕشو چونەشاخ ئامادە بکەن. شەهید ئارام بەردەوام دەیگوت:

گەر مەسەلەی پەیوەندی پێوەکردنی مام جەلال گرنگە، دەبوایە، یەك یان دوان لە سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕۆن، نەك هەمویان. زیاتریشی رۆشندەکردەوەو باسی ئەوەشی دەکرد کە: سەرکردایەتی کۆمەڵە، لەبەرئەوەی نە لەکاتی

هەرەسداو نە دوای ئەوەش، باوەڕیان بە شۆڕش بەرپاکردن نەبووە، بۆیە، نە لە گەرمەی هەرەسەکەدا ئامادەی بەرگری بونو نە دوای ئەوەش، بچوکترین ئامادەکاری بەرپاکردنی شۆڕشیان کردووە. کە لێشیان قەوماوە، جێگەیان نەبووە تەنانەت خۆشیان بشارنەوە، بۆیە، بەناچاری ویستویانە خۆیان بگەیەننە سوریاو مام جەلال. ئەگەر مام هاتەوە لەگەڵیا بێنەوە، نەشهاتەوە، لە دەرەوە بمێننەوە. ئەمە پوختەی بۆچونی شەهید ئارامو کاك سالاریش بوو لەسەر رۆیشتنی هاوڕێیان بۆ دەرەوە. کە بەشی زۆری راستو دروست دەرچون. بۆیە لە هەڵسەنگاندنەکەدا، هەڵەی رۆیشتنەکەو کاریگەری ناڵەباری لەسەر رێکخستنو کۆمەڵە، باسکرابوو.

هەڵسەنگاندنەکە، لە شوباتی (١٩٧٦) دەرچوبوو، بەقسەی نوسەر گوایە لە ٨/ی شوبات بوبێ، کە ئەمەش راست نییە. بیرمە لەکۆتایی هەڵسەنگاندنەکەدا نوسرابوو (شوباتی ١٩٧٦) رۆژەکەی نەنوسرابوو. کە بە قسەی نوسەریش بێ، تێکرا مانگێك بووە، خاڵە شیهابو هاوڕێکانی گەیەندرابونە بەغداد. هێشتا سەرەتای لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا دەستپێکردبوو. دەشمانبیست هەمویان ورەیان بەرزو قارەمانانە وەڵامی لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانیان، لە ئەمنی سلێمانیەوە، هەتا بەغداد، داوەتەوەو شانازیشمان پێوەدەکردن. لەبەرئەوە نە کاتی نوسینی بەیانەکەو نە ماوەی کەمی تەسلیمکردنەوەی هاوڕێیان نە لێکۆڵینەوەش لەگەڵیاندا، نەگەیشتبووە ئەوەی کەمترین زانیاریش لەسەر ئەو (٧) هاوڕێیەی لەئێرانەوە تەسلیم کرابونە عێراق، بە (معترف) لە هەڵسەنگاندنەکەدا، ناو ببرێن. راستە، لە هەڵسەنگاندنەکەدا، رەخنە لە (إعتراف) کردن گیراوە. بەڵام لە خاڵە شیهابو هاوڕێکانی نەگیرابوو. بەڵکو ئەو رەخنانە لەو کەسانە گیرابوو کە نوسەر خۆیشی لەم کتێبەیدا، چەندین جار باسیان دەکاتو دەڵێ: خۆڕاگر نەبون.

کە من پێمخۆش نییە ناوی ئەوانو هی تریش بنوسمەوە. بەبێ ناوهێنانیان، دەپرسم:

- .ئایە.. بەشێك لە هاوڕێیانی کۆمەڵە، لە زینداندا، دانیان بە ڕێکخستندا نەنابوو؟
- ئایە ناوی بەشێکی هاوڕێیانی تریشیان نەدابوو، سەرەنجام گیراشن؟
- ئایە هەندێکیان رووبەڕووش لەگەڵ هاوڕێ گیراوەکاندا، دایاننەنابونو تاوانباریان نەکردبون؟
- ئایە لە هەڵمەتی یەکەمدا، لە سلێمانی، کەرکوك، هەولێر، بەغداد، کۆیە زیاتر لە (٣٠) کادری کۆمەڵە نەگیران؟
- ئایە شەهید شیهاب، لە بەغدادو زینداندا، لەو هاوڕێیانەی (اعتراف)یان کردبوو، قسەی بۆنەکردبونو پاشگەزی نەکردبونەوەو پاشان ئەمانە (ئیفادە)کەیان نەگۆڕیبوو؟

جاکە.. ڕێکخستنێك، دوچاری جەزرەبە بوبێو چەندین هاوڕێی خۆیان لەبەرامبەر ئەشکەنجەدا نەگرتبێو شپرزەیی خراپیان دوچارکردبێ، لەهەڵسەنگاندنی روداوەکاندا، چۆن دەشێ دوورونزیك باسی روداوی زیانبەخشی وا نەکرێ؟!

لەهەڵسەنگاندنەکەدا، ئاماژە بە سەرکردایەتیش لە زینداندا کرابێ، مەبەست لەو کەسانە بووە کە لەسەرەتای راوەدوونانی هاوڕێیانی سەرکردایەتیو ڕێکخستنەکاندا، گیراونو روخاون. نەك شەهید شیهابو هاوڕێکانی، کە تا ئەوکاتەو دوای ئەوەش، ناوی تاکە کەسیان لە ڕێکخستندا نەدرکاندبوو. بەڵکو بونە مایەی گۆڕینی ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەکانو رزگارکردنی گیانی ئەو هاوڕێیانەی بەرگەشیان نەگرتبوو (یەکێکیان نەبێ). بۆ سەلماندنی ئەم راستیانەش، با

بخوێنینەوە شەهید ئارام دوای شەهیدکردنی خالە شیهابو هاورێکانی چی فەرمووە:

"کاربەدەستە تکریتیەکان توشی هستریا بونو کەوتنە بەکارهێنانی ناشیرینترینو خراپترین شێوەی ئیرهاب لە راونانو گرتنو کوشتنی هاوولاتیانی نیشتمانپەروەر، تەنانەت زۆر کەسانی بێتاگاو بێلایەنیشی گرتەوە وە هەتا دێش هەر شێتگیرتر ئەبن. ئەوەبوو هەر لە سەرەتای شۆڕشەکەمانەوە بۆ چاوترساندنی رۆلەکانی گەل حوکمی ناڕەواو چەپەڵی خۆی بەسەر تێکۆشەرانی نەبەزو قارەمانی گەلەکەمانا دا شەهیدان (شەهابو جەعفەرو ئەنوەر) وە لە رۆژی ١٩٧٦/١١/٢١ لەسێدارەدرانو هەر لەوساشەوە دەستی کرد بە گرتنو دورخستنەوەی تێکرا کەس‌وکاری پێشمەرگە شۆڕشگێڕەکانی کوردستان لە پیری سەد ساڵەوە هەتا منداڵی ساوای سەر بێشکەش لە بەندیخانەکانی خوارووی عێراق توند کران"(*)

پێموایە ئەو دەقەی شەهید ئارام، تەمومژ ناهێڵێت. کە لە راپۆرتی شویاتیشدا کاك ئارام مەبەستی شەهید شیهابو شەهید جەعفەر نەبووە.

نوسەر دەیەوێ، رەخنەی دووتوێی هەڵسەنگاندنی شویات، دابەش بکاتە سەر تەواوی هاوڕێیانی زیندان، بەتایبەتی شەهید شیهابو هاورێ تەسلیمکراوەکان لەلایەن ئێرانەوە، هەتا ئەو مەرامو رقەی هەیەتی، بۆی بچێتە سەر.

سەبارەت بە دۆخی سیاسی عێراقیش، نوسەر دەیەوێ زۆربەی هەڵسەنگاندنی شویات لەوەدا کۆبکاتەوە گوایە، باسی ریفۆرمی کشتوکاڵی کراوە؛ گوایە

---

* کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان- عێراق (بەشی یەکەم) هەڵبژاردەیەك لە نوسینەکانی شەهید ئارام- نوسینگەی راگەیاندنی چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ- کانونی دووەم ١٩٩٠. ل(٦١)

ئەوکاتەش مەترسی راگواستن‌و ئۆردوگای زۆرەملێ هەبووە، نەك كێشەی ریفۆرمی کشتوکاڵ. لەمبارەوە لە لاپەڕە (٨٦)دا دەڵێ:

" ٢- لەم بارودۆخەی ئێستادا کە رژێم کەوتۆتە راگواستن‌و کاولکردن‌و سوتاندنی دێهاتەکانی کوردستان بەقوڵایی ٢٠ کیلۆمەتر لە سنورەکانی بەناو عێراق- ئێران، عێراق- تورکیا، عێراق- سوریا، و دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملێ کە دەیان کێشەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و فەرهەنگی کوردی لە منداڵدانی خۆیدا هەڵگرتووە بۆ ئایندەو پاشان دەرکردنی کوردان لە زێدی خۆیان لەناوچەکانی کەرکوك‌و کفری‌و خانەقین‌و بەشێکی گەرمیان‌و تعریبکردنی ناوچەکانیان، ئایا بەرزکردنەوەی دروشمی (اصلاح زراعی) لەم بارووددۆخەداو کردنی بە دروشمی کات‌و سات‌و قۆناغ بۆ جوتیاری کوردی راگوێزراو و زەوی‌وزاری چۆڵکراو سوتماك کراو راستە؟ یان بەرزکردنەوەی دروشمی بەرگری لە گوندەکان لە راگواستن لە سوتان لە چۆڵکردن‌و کاولکردن؟ "

ئەم برایە، لەو وایە، هەرچی بنوسێ بۆی دەبێتە نەخشی مێژوو، رقیش وایلێکردووە روداوەکانی لێ تێکەڵ‌و پێکەڵ ببێ‌و مێژووی روداوەکان پێش‌و پاش بخات.

تەنها دەشیەوێ، هەڵوێستەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان بشێوێنێ، ئەگینا خۆی باش دەزانێت، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە چرکەساتی دامەزراندنیەوە، لەسەر مەسەلەی جوتیاران، ئەمەی خوارەوەی وتوە:

" لەبەرئەوەی بزوتنەوەی رزگاری لە گەوهەردا، کێشەی جوتیارانەو خەبات دەیسەپێنێ لە دەرەبەگایەتی رزگار بکرێن، ئەمەش مەرجێکی بنچینەیی

رابـون‌و هوشـیارکردنه‌وه‌و هه‌ڵخرانـدنی وزه‌ی جوتیـاران‌و ئاوێته‌کردنیشـیانه بـه خه‌باتی رزگاری نیشتمانی شۆڕشگێڕانه." (*)

نوسه‌ر نه‌ك هه‌ر ئه‌م راستییه ده‌زانێت، بـه‌ڵکو ئـه‌وه‌ش ده‌زانێت، نامیلکـه‌ی (یه‌کێتی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟) حـه‌وت مـانگ پـێش نوسینی راپـۆرتی شویاتیش نوسراوه. که‌چی که قسه له‌سـه‌ر راپـۆرتی شـویات ده‌کـات، دوورونزیـك باسـی ئـه‌م پرنسـیپه‌ی یـه‌کێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان، لـه سـه‌ره‌تای دامه‌زراندنیه‌وه ناکات.

---

* الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟ - من منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني. ١٩٧٥.ص(٤)

## ٢٧

# تیژی سێجیهانو ناکۆکی لاوەکی

کێشەی ڕاگواستنی دێهاتو ئۆردوگای زۆرەملێ، کێشەی (١٩٧٥) نەبوو، بەڵکو کێشەی (١٩٧٨) بەدواوە بوو، دوای ئەوەی شۆڕش بەرپا بوو، پەرەی سەند، سنورەکان پەناگا بون، ڕژێم بڕیاری دا تەواوی سنور بۆ مەودای (٢٠ کم) ڕاگوازێ. پێشتر تەنها دێهاتی خانەقینو کەرکوکو مەخمورو هەندێکی موسڵی رادەگواستو عەرەبی لەجێدا نیشتەجێ دەکردن. لەبەرئەوە، لە هەڵسەنگاندنی شویاتدا، باسی وا لەئارادا نەبووە. لە قسەکانی نوسەریشدا، ئەوکاتە، شتی لەم بابەتە باس نەدەکرا.

باسی ڕاگواستنی ناوچە تەعریبکراوەکانو مەترسیەکانی لە هەڵسەنگاندنی شویاتدا کراوە. لە ڕێڕەوی باسەکەشدا، ڕەخنە لە سیاسەتی خۆماڵیکردنی نەوتو یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵیش گیراوە. ڕەخنەکەش لە پەیوەندی لەگەڵ شکستی سیاسەتی ئابوری سیستەمی سەرمایەداری دەوڵەتی مشەخۆر گیراوە، کە لە بەرنامەو پرۆژەکانیدا، شکستی خواردووە. کاریگەری شکستەکەش لەناو شارو دێهات رونکراوەتەوە. لەم ڕوانگەیەوە، وتراوە: ریفۆرمی کشتوکاڵ، نەیتوانیووە ژیانی جوتیارانی کەمدەرامەت چاك بکات. حکومەتیش تراکتۆرو ئامێری پێویستی بۆ دابیننەکردون. تەنانەت بیرمە لە هەڵسەنگاندنەکەدا لەمبارەوە هاتووە کە نە حکومەت ئامێری بۆ جوتیاران دابینکردووەو نە جوتیارانیش دەتوانن بەدڵی خۆیان (گاجوت) بکرن.. چونکە گرانە. ئەم

رەخنانە، لە بەشێکی کەمی هەڵسەنگاندنەکەدا هاتووە، نوسەر لێرە گەورەی کردووەو دەیەوێ بڵێ؛ کۆمیتەی هەرێمەکانو ئارام ئاگایان لە دۆخی جوتیارانو سیاسەتی رژێم نەبووە. بۆئەوەی ئەمەشی بۆ بچێتەسەر، دوو ساڵ راگواستنی سەرانسەریو دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملێی پێشخستووە.

بۆ هەلومەرجی جیهانیش؛ شەهید ئارام، دەمێك بوو باوەڕی بەوە نەبوو، کۆمەڵە زەقاوزەق، ناوی (ماوتسیتۆنگ)ی پێوە بلکێندرێ. لەنێوان یەکێتی سۆڤیەتو چینیشدا، ئەوکاتە کە دەمانویست شۆڕش بکەین، زۆرتر بێلایەنی پێ راست بوو. هەمیشە دەیگوت: چین خۆی کێشەی لەسەر تاکپەرستی تێکەوتووە. رەخنەی زۆر لەسەرە. لەسەر ئاستی جیهان نەیتوانیووە کاریگەری لەسەر کرێکارانو مارکسیستەکان هەبێ؛ تەنها لەناو چەند حیزبێکی لاوازی گەلانی ژێردەستە نەبێ، دەیگوت: وڵاتێكو حزبێکی کۆمۆنیستو رابەرەکەی، وایان لێهاتبێ، بۆچی کۆمەڵە پاشکۆیەتیان بکات؟ ئەوکاتە هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە کە چین، جوانترین کۆشکی کۆماری، بەخۆڕایی، بۆ حکومەتەکەی جەعفەر نومەیری دروستکردووە. کاکە ئارام دەیگوت: ئاخر ئەمە چ خزمەتێکی سۆسیالیستییەو چ دژایەتیەکی ریڤیژنستییە، بۆ دیکتاتۆرێکی ئاوای کە کۆمۆنیستەکانی قەتڵوعام کردووە، کۆشکی بۆ دروست دەکەن. ئێمەش، بەتایبەتی منو شەهیدان عەبدولرەزاقو ئازاد هەورامی، نەماندەسەلماندو دەمانگوت: ئێستا کاتی گۆڕینی رێبازی کۆمەڵە نییە. با پێمان نەگوترێ لە ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵە هەڵگەڕاونەتەوە. بۆیە هەر دەبێ پابەند بین بەو رێبازەوە. لەژێر فشاری قسەکانی ئێمەدا، شەهید ئارام لە راپۆرتی شوباتدا، بەشێوەیەك لە شێوەکان رێبازی ماوی جێکردەوەو دژایەتی ریڤیژنستیشی دوپات کردەوە. (دەرکەوت ئێمە هەڵەو ئارام راست بوو) پێشی گوتین: لەم بیروباوەڕەتان پاشگەز دەبنەوە. نمونەیەکی بۆ هێنایەوە، وتی:

جارێکیان لە بەغداد، شەهید شیهاب منی بۆ تەرجومە لەگەڵ خۆیدا بردۆتە سەفارەتی چین. سکرتێری یەکەمی سەفارەتەکە لەگەڵماندا کۆبۆتەوە، خالە شیهاب باسی کۆمەڵەو ڕێبازی ماوی بۆ کردوەو بۆی ڕونکردۆتەوە کە پشتیوانی چین دژی سۆڤیەت دەکەن. لەوەڵامدا هاوڕێی سکرتێر بۆی ڕونکردونەتەوە کە: ئێوە ئازادن لە دیاریکردنی ڕێبازی خۆتان. بەڵام ئێوە گەلێکی ژێردەستەن‌و دەتانەوێ ڕزگارتان بێ، هەقوایە زۆرترین لایەن‌و دەوڵەت بکەنە دۆستی خۆتان، چیتان داوەتە ئەم ناکۆکیانە. شەهید شیهاب لەوەڵامدا سوربونی خۆی لەسەر ئایدیۆلۆژیەت‌و ستراتیژی کۆمەڵە دوپاتکردۆتەوە. شەهید ئارام چەند جارێک ئەمەی بۆ گێڕاینەوەو دەیووت: سەرکردایەتی کۆمەڵە.. لە چینەکان چینیترو ماویتریش بون.

هەر لە باری ئایدیۆلۆژیەوە، ئەوکاتە باسی تیۆری سێجیهان لەئارادا بوو، کە سۆڤیەت‌و وڵاتانی سەرمایەداری وەکو دوو جەمسەری بە ناکۆکی بنچینەیی‌و سەرەکی دەزانراو چین‌و گەلانی ئازادیخوازو کرێکارانی جیهانیش، بە ڕێبازی سێهەم. ئەم تیۆرە، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، کرابوەوە بنچینەی سیاسەتی کۆمەڵەو ڕژێمی عێراقیان بە ناکۆکی ناسەرەکی دەزانی. کاکە ئارام ڕەخنەی لەم تیۆرەش هەبوو، پێی وابوو، تیۆرێکی نەزۆکەو هەرگیز جیهان لەم سێ قاڵبەی ئەم سێ تیۆرە نادرێ. هەروەکو چۆن باسمان کرد، ئەو پێی وابوو، پاشکۆیەتی بەوشێوەیەی کۆمەڵە، لەناو خەباتی ڕزگاریخوازی گەلاندا، زیانی زۆرترە. نمونەی ڕێکخراوەکانی فەلەستینی دەهێنایەوە، کە هیچکامیان، بەم شێوەیەی کۆمەڵە پاشکۆ نین. دەیگوت: چەند کەسێکی وەکو مونیر شەفیق ماوین‌و.. وەکو کۆمەڵە بیردەکەنەوە، کەچی کەمترین کاریگەریان لەناو شۆڕشی فەلەستیندا هەیە. باسی یاسر عەرەفاتیشی دەکرد، کە پەیوەندی لەگەڵ چین‌و سۆڤیەت

باشەو سەرکەوتوشە. تەنانەت دەیگوت، جۆرج حەبەش‌و نایف حەواتمەو ئەحمەد جبریلیش، کوت‌ومت وەکو کۆمەڵە ماوی نین‌و خۆشیان بە پاشکۆی چین نازانن.

نوسەر، هاتووە هەموو ئەو هەڵە بنچینەیانە لە مێژووی کۆمەڵەدا فەرامۆش دەکات‌و لەخۆڕا، کێشەی (ریفۆرمی کشتوکاڵ)و (راگواستنی دێهاتەکان) دێنێتەگۆڕێ. کە بەوشێوەیەی باسی دەکات، دورن لە راستیەوە. تەنانەت، هەتا کاکە ئارامیش شەهید کرا، راگواستنی دێهات بەقوڵایی (٢٠ کم) لەسەر سنورەکان، نەسەپێنرا، چ جای پێش ئەوە بە سێ ساڵ، نوسەر فاڵی بۆ گرتبێتەوە.

کەسێك هێندە زیرەك بوبێ، سێ ساڵ پێشتر، پێشبینی راگواستنی دێهاتەکانی کردبێ، دەبوایە، لە باقی بۆچونەکاندا، لەناو ئەو روداوانەی رویانداوە، یان ئەو کێشانەی بەسەر کۆمەڵەدا هاتون، یان ئەو هەڵانەی کراوون، یاخود، دوای هاتنەدەرەوەی نوسەر (١٩٧٨) لەناو شۆڕش‌و شەپۆلی روداوەکاندا، دەبوایە ئێستا سەدان وتارو دەیان لێکۆڵینەوەی هەبوایە، کە وەکو کەلەپوری شۆڕشگێڕانە، بخوێنرێنەوە. کەچی ئەو چەند نوسینانەی نوسیونی، ئەوەندە پڕن لە رق‌و قولکردنەوەی ناکۆکیەکان، پێش تەقینەوەیان. نوسینەکانی هی ئەوە نین، منداڵەکانیشی بیخوێننەوە، چ جای نەوەی نوێ!!

## ٢٨

## سەردانی خاڵە شیهاب

لە درێژەی گێڕانەوەی روداوەکانو ئەو ململانێ (ستراتیژی!)یەی نوسەر، لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا، کردویەتی. پێی وابووە، بەم سیاسەتە دەتوانێ لە رێکخستنەکانی بگەیەنێ کەسێکی خاوەن بیروباوەڕی راستەقینەو پارێزەری رێبازی کۆمەڵەشە. کە واشی کرد، دەشتوانێ پشتیوانی هاوڕێیانی زیندان دابین بکاتو ئیتر لەناو کۆمەڵەدا تەراتێن دەکات. بەڵام، سیاسەتی ناڕاست، هەر زوو دەردەکەوێ. بەتایبەتی لەناو رێکخستنێکی وەکو کۆمەڵەی بەر جەزرەبەکەوتوو.. کە بە لافلێدان نەدەبوژایەوەو بە رقەبەرایەتی یەکینەدەگرتەوە. بەڵکو بە سیاسەتی راستو شۆڕشگێڕانە، بەکردەوە، نەك بە لافلێدان، رابەرایەتی دەکرا. ئەم هاوڕێیە، دوای ئەوەی لە ریزەکانی کۆمەڵەداو بەناوی دڵسۆزی بۆ خاڵە شیهابو هاوڕێیانی زیندان، هەوڵێکی زۆری بەهەدەر داو کێشەی لابەلای بۆ ریزەکان دروست کرد، ئینجا ویستی بەم سیاسەتە جوانەو ئەم تێکدانەی ریزەکانی کۆمەڵە، وەکو دیاریەك بباتە زیندان، بەڵکو پشتیوانی ئەوان حەڵاڵ بکات، ئیتر چۆنی بوێ وا هەڵسوڕێ.

بە کەشکۆڵێ پڕ لە تەرامەکانی، سەردانی زیندانی کردووە. خۆی لە لاپەڕە (٨٨)دا ئاوای دەگێڕێتەوە:

" رۆژی ٢/١٠ سەردانی هەڤاڵانی بەندیخانەم لە بەندیخانەی (ئەبو غریب) کردو لەوێ شەهیدان شەهابو جەعفەرو هاوڕێ قەرەیدون عبدولقادرو ئاوات

عبدولغەفورو عەلی بچکۆڵم بینی، لەگەڵ عومەری سەید عەلیو جەبار فەرمانو کاک دارۆ.

شەهید شەهاب کە ئەوە مەترسی لەسەر ئایندەی کۆمەڵەو کەرتوپەرتکردنی دروستدەکات پێویستە لێیان نزیك ببینەوەو ئاگاداری هەڵسوکەوتیان بن، گەر بکرێ باشترە پێکەوە کار بکەنو ڕێگەی ئەوە نەدەن، کە کۆمەڵە بە دوو ئایدیۆلۆژی جیاوازو دوو هێڵی جیاواز کار بکات، "

نازانم قسەی ئەم هاوڕێیە، لەم گێڕانەوەیەدا، چەند ڕاستن، بەڵام تەنها ئەم قسانە، بەتایبەتی هی شەهید شیهاب، بەسن بۆئەوەی بزانرێ خاڵە شیهاب چەند پیاوێکی دوربین بوەو نوسەریش چەند کورتبین. با جارێ لێگەڕێین، کاک فەرەیدون کە وەکو جێگری شەهید شیهاب لە کۆمەڵەدا وا بووە، بیروبۆچونە ڕاستەقینەکەمان بەویژدانەوە چۆن بۆ دەگێڕێتەوە. دەنوسێ:

" وتی من ئاسودەم بە شەهیدبونم دەستی براکانم لەو شاخانە ئاواڵەتر ئەکەم ڕێکخستنەکانمان زیاتر ترسیان ئەشکێ، چونکە ئەوان تا ئێستا لەترسی ئەوەی ئێمە لەسێدارەنەدەن لە گەلێ چالاکی خۆیان پاراستووە ئامانەتی هەموو هاوڕێیانو ئەم ڕێبازە. تکام وایە نرخی یەکێتی خۆتانو براتانو قەدری مام جەلال بزانن، زۆربەمان ئازادین لە شارو لە شاخ کارئەکەین، ئێوەش ئازاد ئەبن بیرتان نەچێ کە ئەم دوژمنە بە زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە لەناوئەچێ، چیتان پێئەکرێ بۆ پەرەسەندنی خەباتی چەکدارانە درێغی مەکەن قسەوباسی خۆشو

لەمەڕ پەیوەندی برایانەو شەخسی زۆریشی لەگەڵ هاوڕێ دارۆو من کرد.
دواقسەش پێیوتین: بۆئەوەی کەڵ بژین کەم ئەژین." (*)

مرۆڤ، لەو کاتانەدا کە خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی بڕیاری لەسێدارەدانیان جێبەجێ دەکرێ، ئەم وەسیەتانەش، لە زاری خاڵە شیهابەوە، دەخوێنێتەوە، سەرەڕای ناکۆکی‌و هەڵەکان، سەرەڕای بەدبەختی‌و ناخۆشیەکان، تۆزقاڵێك پاشگەزنابێتەوە لەوەی شەهید شیهاب، گەورەو سەرکردەمان بووە. بەم قارەمانێتی‌و قسانەشدا، باشتر بۆمان دەردەکەوێ، شەهید ئەوەی کردویەتی، ئەو ڕێبازەی هەڵیبژاردووە، بەقەناعەت کردویەتی، نەك لەبەر هیچ هۆیەکی تری تایبەتی.

بەش بەحاڵی خۆم، ئێستا، دوای (٣٦) ساڵ لەو سەردانەی نوسەر بۆ زیندان، تێدەگەم خاڵە شیهاب چەند رابەرێکی وردو پاشەرۆژی روناك بینیبووە. ئەوەی ئامانجی بووە، گەلەکەی‌و بیروباوەڕەکەی بووەو بەس. هەرچی کێشەو بێشەش هەیە، هەموو کردۆتە قوربانی رەنجدەران‌و چارەنوسی نەتەوەکەی. ئەمەیە، هەڵۆی بەرزەفڕ.. روحی پاکی هێندە بەرز فڕیووە، گرفتی بچوك‌و هەموو ئەو قسەڵۆکانەی نوسەریش بۆ کۆمیتەی هەرێمەکانی هەڵبەستون، چاوی هیچی ئەوانەی نەبینیووە. لەسەر پەتی سێدارەشیدا، تەنها دوارۆژی نەمانی چەوسانەوەی چینایەتی‌و نەتەوایەتی دیووە. ئەم وەڵامەی خاڵە شیهاب، گەر بەراوردی بکەیت لەگەڵ ئەو هەموو قسانەی نوسەرو چەند کەسێکی دیکە، پەیتا پەیتا گەیاندویانەتە زیندان‌و هەوڵیانداوە، بە چەواشەکاری لە کۆمیتەی

(*) فەرەیدون عەبدولقادر- لە بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی. چاپی یەکەم – ٢٠١١. لاپەڕە(٨).

هەرێمەكانیان تێبگەیەنن، ئەوسا جوانیی دەركی خاڵە شیهابو هاوڕێیانی زیندان، بەرجەستە دەبێ.

پەیتا پەیتا قسەیان بۆ گێڕاونەتەوە. مەگەر هەر خۆم بزانم ئەوسا، نوسەرو چەند كەسێك، چەندیان رقو كینە لەدڵ بوەو چۆنیان هەڵدەڕشت. ئەو قسانە، كە ئەوانە لەناو زیندانیشدا هەڵیانڕشتون، دەبوایە خاڵە شیهاب هەڵوێستێكی خراپی وەرگرتبا، گەر واشی كردبا، زۆرینەی هاوڕێیانی زیندان هەمان هەڵوێستیان دەبوو. ئیتر بزانە چەند كێشە دەخولقا.

لەو قسانەی نوسەر دەیگێڕێتەوە، بۆچونی خاڵە شیهاب رونە. بەڵام بۆئەوەی گرێیەك بخاتە گێڕانەوەكە، لە لاپەڕە (٨٨-٨٩)دا دەڵێ:

" پێویستە ئێوە رێگە لە گەشەكردنی بیروڕای عێراقچیێتی لە كۆمەڵەدا بگرن، ئەویش بە كاركردنتان پێكەوەو دەبێ هەمیشە كۆمەڵە لە پەلاماری رژێم بپارێزن. رەنگە گەر بكەونە دژایەتی یەكتری، هەردوولا توشی پەلاماری رژێم ببنو بەتایبەتی ئەوانە كە هەم نەجمەدینو هەم شاسوار زمانیان لێبڕاوە لەلایەن رژێمەوە بڕیاری گرتنیان هەیە، رەنگە گەر بگیرێن زیانێكی ترو كەلێنێكی تر بخەنە كۆمەڵەوە. "

گێڕانەوەكانی كاك فەرەیدون، پاشان لە هاوڕێیانی تریشمان بیستووە، دووڕونزیك لەگەڵ ئەم گێڕانەوەیەی نوسەر یەكناگرنەوە. بەڵام نوسەر هێندەی رق لە دڵەو دەشیەوێ تۆڵەبكاتەوە، ئیتر تاوێك بۆ شەهید ئارامو شەهید ئازاد هەورامی هەڵدەبەستێ. تاوێكیش بۆ شەهید شیهاب، ئینجا زیندوەكان.

خاڵە شیهاب لەگەڵ كاكە ئارام خزم بون. تێكەڵاوی خزمایەتیو هاورێیەتیان هەبوو. كاك ئارامو كاكە دارۆی برای شەهید شیهاب، هاوڕێی نزیكی گیانی بەگیانی بون. پێكەوە لەناو قوتابیانو لاوانو كوردایەتیو لە دامەزراندنی

کۆمەڵەشەوە، خەباتیان کردووە. ئەم هەموو تێکەڵیە، خزمایەتیە، هاورێیەتیە، ئەگەر بایی ئەوە نەبووە خالە شیهاب کاك ئارام بناسێ‌و دڵنیابێ لە بیرکردنەوەو رێبازە ئایدیۆلۆژیەکەی، کەوابێ خالە شیهاب هاورێ ناس‌و ئەندام ناس‌و کادر ناس نەبووە. کە (پێچەوانەکەی راست‌و دروستە). کاك ئارام لە ناوەراستی شەستەکانەوە چۆتە ناو بزوتنەوەی قوتابیان. شەهید شیهاب لە کۆتایی چلەکانەوە. دەوروبەری (١٥) ساڵ خالە شیهاب ئەزمونی لە کاکە ئارام زیاتر بووە. هەورازو نشێوی دونیای سیاسەتیشی زۆر دیووە. ئیتر هەر لە جیابونەوەکەی باڵی (هەمزە عەبدوڵلا)وە، کە شەهید شیهاب لە رابەرە دیارەکانی ئەو رەوتە چەپە بووە. کە بۆتە خاوەن ئەزمونێکی بەرچاو، هەربۆیە، لە جیابونەوەی هەردوو باڵی (جەلالی- مەلایی)دا، سەرەرای ئەوەی هاورێی مام جەلال‌و خەڵکانی تری ناو جەلالیش بووە، بەلام باوەری بەو ململانێیە، بەوشێوەی چەکدارو سیاسی دەکرا، نەبووە. لەوکاتانەدا، لە بەسرەدا فەرمانبەر بووە. بەلام لەناو رەوتە چەپەکەی ئەوکاتە بەردەوام تێکۆشاوە.

دوای بەیاننامەی ئازار، ئیتر بەگەرمی لە دامەزراندنی کۆمەڵە (١٩٧٠/٦/١٠) دەستپێشکەری کردووە. لەسەرەتای دامەزراندنیشەوە، کاك ئارام یەکێك بووە لە کادرە نزیکەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەتایبەت خالە شیهاب. ئەم هەموو ئەزمونەو رێرەوی خەباتە، ئەم هەموو ململانێی‌و دیالۆگی ئایدیۆلۆژییە، تۆ بڵێی بایی ئەوە نەبوبن خالە شیهاب نەزانێ کاك ئارام کوردستانی یان عێراقی بووە؟

دوای نوسینی ئەم کتێبە، رەنگە لە (٥٠) کەسم پرسیبێ کە هاورێی شەهید ئارام بون، ئایە رۆژێك لە رۆژان، بیستوتانە، شەهید ئارام عێراقی بوبێ؟ لەوەلامی کەسیاندا بیری عێراقی لە کاك ئارام نەبیستراوە. بەلام ئەم لە کەلی شەیتان ئایەتەخوارەوەو ئیستەرەم شەهید ئارام دەکاتە عێراقی. ئەمە لەکاتێکدا

هەتا یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەش ساڵی (١٩٨٠) نوسەر دوو ساڵ بوو هاتبووە دەرەوە، دورونزیك کەس باسی عێراقیبونی کاك ئارامو کەسی تریش نەدەکرا. لەناو کۆنفرانسیشدا کە ململانێیەکی ئاشکرا لەسەر مێژووی کۆمەڵەو رێرەوی کۆمەڵەو رێبازی کۆمەڵە هەبوو، یەك ئەندامی کۆنفرانسیش باسی ئەوەی نەکردووە شەهید ئارام رۆژێ لە رۆژان بیری عێراقی بوبێ. باشترین کادرو فەرماندەکانی قەراغیش لە کۆنفرانسەکەدا بون، کە چەندین مانگ لەگەڵ شەهید ئارامدا بون، یەکێکیشیان باسی بیری عێراقچێتی ئارامی نەکرد. لەکاتێکدا، لەناو کۆنفرانسدا، باسی رەوتی عێراقی لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵە دەکرا. (*) هەر لەو سەروبەندەشدا، لە دووەمین ساڵرۆژی شەهیدبونی کاکە ئارامدا (ناوەندی کۆمەڵە) بەرهەمەکانی کاك ئارامی لە نامیلکەیەکدا چاپکردو پێشەکیەك بەناوی (ناوەندی)یەوە بۆ نوسرا، لەبەشێکیدا، لەسەر بیری کوردستانی شەهید ئارام ئاوا هاتووە:

"هاورێ ئارام، لەوەش باش گەیشتبوو کە خەباتی خەڵکی کوردستان لەعێراقدا بەشێکی نەپچڕاوە لەخەباتی خەڵکی کورد لەهەموو پارچەکانی تری کوردستانا، ئەو یەکیەتیەش دەبێ لەگەڵ رەوتی مێژودا گەشەی پێ بدرێو بەرەوپێشەوە بچێت لەپێناوی هێنانەدی ئەنجامی کۆتایی لەخەباتی دوورودرێژی خەڵکی کوردستاندا لەپێناوی دامەزراندنی کوردستانێکی سۆشیالیستیدا. ئەمە

---

* لە دووەمین ساڵرۆژی شەهید ئارامدا، لە شێنێ مەراسیمێکمان سازدا. مام جەلالو شەهید رەسول مامەندو د.مەحمودو کاك سالار، وتاریان خوێندەوە. تازە دەستەی دامەزرێنەر، گەڕابونەوە کوردستان. لەو مەراسیمە، بە (برایم جەلال)م وت: پەخشانێك لەسەر ئارام بخوێنەرەوە. زۆری پێخۆشبوو لەو شوێنانە وتار بخوێنێتەوەو دەربکەوێ. شیعرێکی لەسەر شەهید ئارام نوسی، لەژیانمدا کەسم نەدیوە، بەبالآی هیچ شەهیدێکیدا، بەوشێوەیە هەڵیدابێ. لەبیرمە کە دەیگوت: ئارام رابەر بوو. ئارام قارەمان بوو. ئارام رچەشکێن بوو. ئارام چرای رزگاری کوردستان بوو. ئارام قارەمانی تەنگانە بوو. ئارام هیوای رەنجدەران بوو..تاد.

وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورەو گەشەکردنێکی چۆنایەتی گرنگ بوو لە خەباتی گەلەکەماندا، بەتایبەتی دوای ئەو هەموو دابڕین و تاکڕەویەش کە بنەماڵەی مەلا مستەفا بەسەر شۆڕشی کوردیان هێنا، ئەو هەموو پەیوەندیە گومان لێکراوانەش کە بەسەر شۆڕشی کوردیان سەپاندوە.. هاوڕێ ئارام زۆرجار دەیووت (هیچ بەدوری نازانم، کە کوردستان ببێت بە فێتنامی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.)." (*)

خۆ ئەوکاتە نوسەر دەیتوانی بڵێ؛ وا نییە. شاسوار جەلال عێراقی بووە. بێگومان نەیتوانیووە، بۆیە نەینوسیووە، ئەگینا لەوکاتەش دەرونی پڕ بووە لە رق بەرامبەر شەهید ئارام و هاوڕێکانی. بەڵام لەبەرئەوەی دەیان هاوڕێی شەهید ئارام لە سەرکردایەتی بون و دەیانتوانی بەرپەرچی بدەنەوە، بۆیە متەقی لەوبارەوە نەکردووە!

* کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان- عێراق (بەشی یەکەم) هەڵبژاردەیەك لە نوسینەکانی شەهید ئارام- نوسینگەی راگەیاندنی چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ- کانونی دووەم ١٩٩٠.ل(١٢).

## ٢٩

## برایم خەلیلو ڕێکنەکەوتن

لە ڕەخنەلێگرتنی کۆمیتەی هەرێمەکاندا، کۆڵ نادات و هەر درزێکیشی دەستبکەوێ، تیرێکی ژەهراوی لەو درزەوە دەهاوێتە سەنگی کۆمیتەی هەرێمەکان. بەبێ ئەوەی حساب بۆ ئەوە بکات، خوێنەر بەئاسانی تێدەگات کە ئەم مێژوو نانوسێ، ڕق دەڕێژێ. دیقەت بدەن ڕوداو چۆن هەڵدەگەڕێتەوەو لە باسکردنی شەهید برایم خەلیلو کێشەی جیاکردنەوەی ڕەوتێك بەناوی (کۆمەڵەی ڕەنجدەران) چۆنی دەگێڕێتەوە. لەمبارەوە لە لاپەڕە (٩٠)دا دەڵێ:

" دوای ڕوودانی ئاشبەتاڵو کاریگەری لەسەر ڕیزەکانی کۆمەڵەو پەیدابوونی چەند بیروڕایەکی زۆر جیاواز لەیەکترو تەقەلای برایم حەسەنو برایم خەلیلو کەسانی تر بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانو کارکردن لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەشدا بەمەبەستی هەڵتەکاندنی، لە پێکهێنانی کۆمیتەی هەرێمەکان ئەو پەروپاگەندانەی کۆمەڵەی پاش ئاشبەتاڵو هێڵەکەی برایم خەلیل پەیوەندیان بە کۆمیتەی هەرێمەکانەوە کرد، و بوونە جەماوەری ڕێکخستنی کۆمیتەی هەرێمەکان. "

لەدوای هەرەسی (١٩٧٥) لەلایەن چەند هاوڕێیەکی کۆمەڵەوە، بەسەرپەرشتی شەهید برایم خەلیل، کێشەو ململانێیان لەگەڵ سەرکردایەتی

کۆمەڵەدا هەبوو (نەك شەهید ئارام). ئەمە پێش ئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان پێکبێت. ئەم ململانێیە قوڵ بوو. گەیشتە لێکترازانیش. وابزانم بەهاری (١٩٧٦) گەیاندیانە دامەزراندنی رێکخراوێك بەناوی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) هەر لەوکاتەشدا بوو، کۆمیتەی هەرێمەکان دامەزراو کەوتە چالاکی. کۆمەڵەی رەنجدەران، کۆمیتەی هەرێمەکانیان بە درێژەپێدەری رێبازی کۆمەڵەو شەهید شیهاب دەزانی (پێچەوانەی نوسەر) لەسەر ئەم بنچینەیە، دژایەتی شەهید ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکانیان دەکرد. لەوکاتەدا هەتاڕادەیەك چالاك بونو گفتوگۆیان لەگەڵ هاوڕێیانی کۆمەڵەدا، بەگەرمی دەکرد. چەند کادرێکی هەڵسوڕاویان هەبوو، لەوانە (برایم حەسەن)، (سەمەدی برای سەلامی خەبات)، رۆژنامەشیان دەرکرد بەناوی (رەنجدەران)و بوشبونە مایەی مشتومڕێکی باش لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا. کاتێك کۆمیتەی هەرێمەکان پێکهێنراو چالاکتر لەوان کەوتە گەڕ، ئەوان هەستیان کرد مەیدانەکە هەتادێت لەبەردەمیاندا تەسك دەبێ، بۆیە، لەرێگای شەهید (شوان عەلی- شامیل) (*) برایم خەلیل داوای گفتوگۆی لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکان کردبوو. شەهید ئارام منی راسپارد بچم لەگەڵیاندا کۆببمەوە. بەڵام پێی وتم: وەکو رێکخستنی جیاواز قسەیان لەگەڵدا مەکە. بەڵکو وایان قسە لەگەڵ بکە، کە ماوەی سەرکردنەکەیان لە کۆمەڵەدا تەواو بووەو با بێنەوە ریزی رێکخستن. منو شەهید شامیل، چوینە ماڵی برایم حەسەن، کە نزیکی فولکەی سجن بوو. کە چوین، شەهید

---

* شوان عەلی- شەهید شامیل؛ لاوێکی خوێنگەرمی شۆڕشگێڕی کۆمەڵە بوو. لەبەردەستی باوکێکی کۆمۆنیستدا پەروەردەکرابوو. هەر زو بو بەئەندامی کۆمیتەی سلێمانیو زۆر چالاك بوو. ساڵی ١٩٧٧ چووە دەرەوەو لەشەرێکدا دوای ئەوەی شەڕی قورس لەگەڵ جاشەکان دەکەن کە گوندی (قازان قایە) یان لێ گەمارۆدابون. چەند پێشمەرگەیەك شەهید دەبن. شەهید شامیل فیشەکی پێنامێنێ. بە دوا فیشەك خۆی شەهید دەکات.

برایم خەلیل، لەژورێکدا دانیشتبوو. کاسکێتێکی لەسەربوو. ئەستێرەی سوری لێدابوو. تەمەنی (٢٧-٣٠) ساڵێك دەبوو. وەکو شۆڕشگێڕێکی دڵسۆز دەهاتە بەرچاوم. بەحەماسەوە قسەی کردو رەخنەیەکی زۆری لە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵەو شەهید ئارامیش گرت. سەراپا رێبازی کۆمەڵەی پێ قبوڵ نەمابوو. رێکخراوەکەی خۆشیان پێ کۆمەڵەی راستەقینە بوو. من گوێم لێگرت، بەلاّم قسەکانی تەواو نەکردبوو، پێموت:

من بۆ گفتوگۆ لەگەڵتاندا دانەنیشتوم و ئێوەش بە رێکخراو ناناسین. بەڵکو هاتوم پێتان رابگەیەنم کە چەند هاوڕێیەکی کۆمەڵەن، ماوەی سڕکردنەکەتان تەواو بووەو ئێستا دەتوانن بێنەوە ریز.

کە قسەکانم تەواو بوو، شەهید برایم خەلیل، بەتوڕەییەوە قسەی کردو گوتی: شێخ شیهاب شکستی خوارد، ئینجا نۆرەی شێخ شاسوارە کوێرە.

کە ئەم قسەیەم لێبیست، بەرەقی وەلاّمم دایەوەو کۆبونەوەکەم جێهێشت. دوای ئەم کۆبونەوەیە، ئیتر پەیوەندیەك لەنێوانماندا نەما. هەتا شۆڕشمان دەستپێکرد. کۆمەڵەی رەنجدەران کەوتنە بەر شالاّوی گرتن. چەند کەسێك لەوان بەرگەی نەگرت، بەتایبەتی (برایم حەسەن) سەراپا رێکخستنەکانی بەگرت دان. برایم خەلیل پەیوەندی بە شۆڕشەوە کردو هاتە ریزی کۆمەڵە. لە شەڕێکی دەستەویەخەدا لەگەڵ رژێمدا، لە گوندی (بێسەلمێن)ی نزیك هەڵەبجە، لەگەڵ شەهید عومەر محەمەد ساڵح و پێنج پێشمەرگەی تردا، شەهیدکران و تەرمەکانیشیان بردنە ناو هەڵەبجەو بە لولەی دەبابە هەڵیانواسین و بەناو بازاڕدا گێڕایانن. ئەم رەفتارە فاشستیە، ئەوکاتە، رقی پیرۆزی خەلکی هەڵەبجەی زیاتر هەڵسان و لەدەوری کۆمەڵەو یەکێتی و شۆڕشدا، زۆرتر کۆبونەوە.

ئەوە سەرگوزشتەی ڕاستەقینەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو، کە نوسەر دەیەوێ وای پشانبدات، ئەمانیش وەکو ڕەوتێکی جیابووی کۆمەڵە، لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا، لەبەرئەوەی یەك ئامانجی کۆن و نوێی دژایەتی ڕێبازی کۆمەڵە کۆیاندەکاتەوە، هەردوولا یەکیانگرتۆتەوە.

## ٣٠

## بەیانی شوبات، گریّ دەرونیەکە

نوسەر.. لە لاپەڕە (٩١) وە هەتا لاپـەڕە (٩٨) رقو قـین رشـتن دەگەیەنێتـە ئەوپەڕیو هەوڵیداوە، چی لەناخیا هەبووە، هەڵیڕێژیّ. لەژێر ناونیشانی (بـەیانی شوبات لە هەڵسەنگاندنێکدا) پەرەگرافێك دەکاتە دەستپێكو لە لاپـەڕە (٩١)دا ئاوا دەست لە راستیەکان ناپارێزیّ:

" ئەگـەر هەرکەسـێك کـەمێك لـە دیسـپلین گەیشـتوو، کـەمیّ لـە رەوشـتی سیاسـیو کـەمێکیش لــە هەســتی نەتەوایــەتیو ریّ و رەسمــی کۆمەڵایــەتی گەیشتوو، بکەوێتە هەڵسەنگاندنی بەیانی شوبات، پێموایـە هـەر جۆرە بـیروڕاو رێبازێکی سیاسی هەبیّ، با هەر بێلایەنانە رەفتـار بکـا، بـۆی دەردەکـەویّ، کـە نەك هـەر نـاکریّ شـانازی پێـوەبکریّ، بـەڵکو دەبـیّ ئـەو بەیانـە بـە هەڵەیـەکی مێژوویی ناو مێژووی کۆمەڵە ئاماژە بکریّ. "

ئێمەش دەڵێین: ئەگـەر کەسـێك، تێڕوانینـی بابـەتی هـەبیّ؛ لایـەنی کـەمی رەوشتی سیاسی هەبیّ، یان لایەنی کەمی پاشمـاوەی پـەروەردەی بـیری چـەپی لا مابیّ، ئایە دەشیّ راپۆرت، یان هەڵسەنگاندنی شوبات، تێکرا بخاتە ناو زبڵـدانی رقی خۆیو یەك لایەنی گەشی هەڵسەنگاندنەکە نـەبینیّ. حوکمەکەشـی ئەوەیـە کە هەڵسەنگاندنەکە بە (هەڵەیەکی مێژوویی ناو مێژووی کۆمەڵە) بزانیّ.

ئاخر نوسەر.. گریمان قسەی جەنابت لەسەر ئەو رەخنانە راستن، کە لە هەڵسەنگاندنەکەدا هاتووە (پێشتر روونمانکردۆتەوە رەخنەکان لە چیو لە کێ گیراون) گریمان لە هەموان رەخنەکان گیراون، ئێ دە باشە، ئایە لە هەڵسەنگاندنەکەدا، دوو دێڕی جوانی تیا نەبوو؟ دوو بۆچونی باشی تیا نەبوو؟ دوو وشەی کوردیو زاراوەی سیاسیو رستەی شۆڕشگێڕانەی تیا نەبوو؟ هەر هیچ؟!! (*)

نوسەرێك باسی رەوشتی سیاسیو هەستی نەتەوایەتیو رێورەسمی کۆمەڵایەتی بکات، خۆ دەبوو خۆی پەیڕەوی لەلایەنی کەمی ئەو قسانە بکات کە ریزیکردوون. پاشان، من دەپرسم: ئەوە بۆچی، جگە لە نوسەر، کەسێکی تر، تەنانەت لە هاوڕێیانی زیندانو لە سەرکردایەتی کۆمەڵەش (جگە لە ئیعترافی زیندان) دوورونزیك قسەیان لەسەر ناوەرۆکی هەڵسەنگاندنەکە نەکردووە، تەنهاو تەنها نوسەرە، کردویەتیە وێردی سەر زمانیو بە چەپو راست، قسەکانی دەفرۆشێتە خوێنەر؟

لەدرێژەی قسەکانیا، بۆئەوەی بەسەر خوێنەریا تێپەڕێنێ، دێتو چیرۆکێکی سەراپا داتاشراو دروستدەکاتو بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، ئەم چیرۆکە، ئاسانە پێچەوانەکەی بسەلمێندرێ، لەبەرئەوەی هەرچی چۆنێ بووە دەیەوێ رقەکەی برێژێ، لە لاپەڕە (٩٢)دا ئاوای دادەتاشێ:

" ١- بەشی یەکەمی بەیانەکە ٨ لاپەڕەی واتە (نیوەی) بەیانەکە تایبەت بوو، بە هێرش بردنە سەر ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە کە هەموویان لە بەندیخانەی بەعسدا لەژێر چەقۆی رژێم دا بوون، و تا ئەوکاتەی کە بەیانەکەش

---

* لەم ماوەیەدا لە چەندین هاوڕێی زیندانم لەوانە( فەرەیدون عەبدولقادر، ئاوات عەبدولغەفور، ئاسۆی شێخ نوری) سەبارەت بە راپۆرتی شوبات پرسی: ئایا راپۆرتەکە لەکاتی لێکۆڵینەوەدا روبەڕوتان کراوەتەوە؟ هەرسێکیان وتیان: نەخێر، شتی وا هەرگیز نەبووە.

دەرچوو، و تا مانگی ئاداریش کە شەهید (وەستا ئەنوەر)ی برای (خولە کەشکۆڵ) شێخ عەلی، لە هەڵەبجە بەو بەیانەوە گیرا، هیچ کامیان دانیان بە لێپرسراوی خۆیان لەکۆمەڵەدا نەنابوو نەشچووبوونە ژێر باری هیچ بڕوبیانو و خواستو هەڵبەستراوێکی رژێم. ئەو بەیانەی کە بە شەهید (وەستا ئەنوەر) گیرا لەکاتی دادگایکردنی بەندیەکان وەك بەڵگەنامەیەك لەسەریان بۆ دادگایی کردنیانو تاوانبارکردنیان بەکارهێنرا. "

مرۆڤ لەژیانی ئاساییدا، رقهەڵگر بێ، جارویار زیان دەگەیەنێ. گەر لە دەسەڵاتیشدا رقهەڵگر بێ، کارەسات دەقەومێنێ. گەر لە نوسینی مێژووشدا، نوسەر رقهەڵگر بێ، ئازاری ویژدانی نەتەوەیەك دەدات. هەمووومان لەژیانماندا، ئەم مرۆڤگەلە رقهەڵگرانەمان بینیووە، یان بیستووە. سەیر ئەوەیە نوسەر، هەرسێ قۆناغەکەی رقهەڵگرتنو رقهەڵڕشتنو رقسەپاندنی دیووە.

لەژیانی کۆمەڵایەتیدا، ئەم رقە لای ناوبراو، بەردەوام هانیداوە راستگۆ نەبێ. لەو ماوەیەشدا، شتێك دەسەڵاتی هەبوو لەناو یەکێتیو کۆمەڵەدا، دەسەڵاتەکەی بۆ تۆڵەسەندنەوە بەکاردەهێنا. ئێستاش کە بەحساب بەشێکی مێژوو دەنووسێ، ئاوا بە چەواشەکاریو شکاندنی تەنانەت شەهیدەکانیشمان، مێژوو دەنوسێ. نەگبەتی نوسەر لەوەدایە، لەم کتێبەدا، دوو رەمزی گەورەی کۆمەڵەو یەکێتیو شۆڕشی کردۆتە ئامانجی رقهەڵڕشتن، ئەوانیش: شەهید ئارامو شەهید ئازاد هەورامییە.

لەو چیرۆکانەی دایتاشیون، ئەم چیرۆکەیە گوایە، شەهید (وەستا ئەنوەر - برای کاکە شێخ عەلی) (*) راپۆرتی شوباتی پێگیراوەو ئەمەش بۆتە بەلگە بۆ دادگاییکردنی هاوڕێیانی زیندان!!

نوسەر.. رقو تۆڵەسەندنەوە بەچەشنێ زالدەبێتە سەری، پانۆمارای روداوەکانی لێتێکدەچیو رۆژمێری روداوەکان، بەچەواشەیی ریزدەکات. چۆن؟

جارێ.. هەڵسەنگاندنی شوبات، مانگی (شوباتی/ ١٩٧٦) دەرچووە. شەهید ئەنوەر لە (١٩٧٧/٥/١٣) گیراوە. واتا: سالێكو سێ مانگ دوای تەسلیمکردنەوەی خالە شیهابو هاوڕێکانی. سالێكو هەشت مانگیش دوای گیرانی شەهید ئەنوەر زۆرابو باقی هاوڕێیان. هاوڕێیانی زیندان، پێکەوە نەگیراوون:

- شەهید ئەنوەر زۆراب لە (١٩٧٥/٩/٣) لە بەغداد گیرا.
- پاشان.. بە دوو سێ رۆژ، حەمەی میرزا سەعیدو چەند هاوڕێیەکی تر گیران.
- دوای ئەمانیش.. یەك یەك و دوو دوو هاوڕێیانی تریش گیران..
- شەهید شیهابو هاوڕێیانی تریش (٧ هاوڕێ) ئێران لە (١٩٧٦/١٢/٣١) تەسلیمی کردن.
- پاش ئەمانیش.. دەیان هاوڕێی تریش لە هەولێرو بەغدادو کەرکوكو سلێمانی گیران.

---

* شەهید وەستا ئەنوەر: قارەمانێکی ئەفسانەیی کۆمەڵەو یەکێتی بوو. گیرا، ئەشکەنجەیەکی ئەوتۆ درا، وەکو دەیانگێڕایەوە لە فیلمیشدا نەبینراوە. سەرێان تاشی، لە ئیستخباراتی سلێمانیدا، تەپلی سەریان بریندار کرد. شیلەیان بەسەردا کردو زەردەوالەیان وروژاندە سەری.. دەیان زەردەوالە پێوەیان دا، ئەم کەلە کۆمەلەیە، گالتەی بە جەلادەکان دەهات. بەعس لە قارەمانێتی ئەفسانەیی شەهید ئەنوەر ترسان، بۆیە زوو لەژێر ئەشکەنجەدا شەهیدیان کرد.

یەك یەكو پۆل پۆل گرتنی هاوڕێیان، لەخۆڕا نەبووە. بەڵكو سەرەنجامی خۆڕانەگری چەندین هاوڕێی كۆمەڵە لەسەركردایەتیەوە بۆ شانەكانی خوارەوە، بووە. كاتێك، ئەو كەسانە دانیان بە بونی كۆمەڵە ناوە، بەئەندامەتی خۆیان. تەنانەت هەشیانە رووبەڕوو لەتەك هەندێ لە هاوڕێ خۆڕاگرەكان دانیشتونو زمانیان لێداوون.

لەو ماوەیەشدا كە نوسەر دەڵێ، گوایە، هەڵسەنگاندنی شوبات بە شەهید وەستا ئەنوەر گیراوە، كۆمەڵەو یەكێتی، جۆرەها بەیانی چاپكراویان لەسەر كۆمەڵە، یەكێتی، لیژنەی باڵای دەستە چەكدارەكانی شۆڕشو یەكێتی خوێندكارانی كوردستان (*) جۆرەها بەیان بەناوی جۆراوجۆرەوە، بەچاپكراویو ژمارەیەكی بەرچاویش، لەناو خەڵكدا، لەسەرانسەری كوردستان هەتا بەغداش، بڵاومان دەكردنەوەو دڵنیاشین دەست رژێم دەكەوتن. ئەمە جگەلەوەی مام جەلالو دەستەی دامەزرێنەر لەدەرەوەی وڵات كەوتبونە چالاكیەكی باش. چالاكی پێشمەرگانەش دەستپێكردبوو. بەچالاكیەكانی ناوشاریشەوە. دەستەی دامەزرێنەری یەكێتی، پێش ناردنەدەرەوەی كاك سالارو مەفرەزە سەرەتاییەكان، مەفرەزەكانی بادینانیان، بە رابەرایەتی شەهید برایم عەزۆ، نارده بادینان. هەواڵنامەی شۆڕش، هەواڵەكەی، ئەوكاتە ئاوا بڵاوكردۆتەوە:

---

* پێش ئەوەی كۆمەڵەی خوێندكارانی كوردستان ئەم ناوەی لێبنرێ، لەژێر فشاری من، بۆئەوەی لە یەكێتی قوتابیان جیابكرێتەوە، ناومان نا یەكێتی خوێندكارانی شۆڕشگێڕی كوردستان. شەهید ئارام بۆی رونكردمەوە كە نازناوی (شۆڕشگێڕ) بۆ رێكخراوی دیموكراسی هەڵەیە. بەڵام من سوربوم. سەرەنجام كە لە نامەیەكدا شەهید ئارام هەواڵی دامەزراندنی یەكێتی خوێندكارانی شۆڕشگێڕی كوردستان دەگەیەنێتە مام جەلال، لەوەڵامدا، رونیدەكاتەوە كە نازناوی شۆڕشگێڕ هەڵەیەو لابرێ. تومەزە، ئەم گفتوگۆیە ساڵی (١٩٧٣) لە لوبناندا، لەنێوان شەهید ئارامو مام جەلال، لەسەر رێكخراوی دیموكراتی شۆڕشگێڕ، كراوە. بەڵام مام ئەوسا بە شەهید ئارامی سەلماندووە، رێكخراوی دیموكراسیو پیشەیی، پێویستە نازناوی ئایدیۆلۆژی نەبێ. ئەوسا شەهید ئارام سەلماندبوی، من دوای (٦) ساڵ سەلماندم!

" بەبۆنەی تێپەڕبوونی ١ ساڵەوە بەسەر دامەزراندنی ی.ن.ك دا نقیب مهندس ابراهیم عزو محمد (جەبار) فەرماندەی دەستە چەكدارەكانی بادینان بۆ یەكەمین جار لەنزیك روباری هیزل لەپشتی زاخۆوە لەگەڵ (پ.م)ەكانی تردا یەكیگرتەوەو كۆبووەوە بۆ رێكخستنەوەی مەفرەزەكانو دابەشكردنی كارو فرمان بەسەریاندا، ژمارەیان ٣٧ پ.م بوو، بوون بە ٤ مەفرەزە:

- دەستەیەك بە فەرماندەیی شەهید ابراهیم عزو.
- دەستەیەك بە فەرماندەیی شەهید عزت اسماعیل شەنگاری.
- دەستەیەك بە فەرماندەیی شەهید عمر ابراهیم رشید.
- دەستەیەك بە فەرماندەیی جەباری مەلا غەنی سندی.

ئەم ٤ دەستەیە بۆ جێبەجێكردنی ئەركەكانیان دابەشبوون بەسەر ناوچەكانی زاخۆ، ئامێدی، دهۆك، هەریەكەیان لەلایەكەوە كەوتە چالاكی سیاسیو تەنزیمیو پێشمەرگەیی.

ماوەیەكی باش بە ناوچەكاندا گەڕانو دەستیان كردەوە بە خەڵك هاندانو رێكخستنو پەیوەندی دروستكردن لەگەڵ تێكۆشەرانی شارەكانو مژدەیان بە جەماوەر دا كە خەباتی چەكدارانە وا خەریكە دەستپێبكاتەوە، لەو ماوە كەمەدا زۆر سەركەوتووانە كارو فرمانەكانی خۆیان بەجێهێناو لە زۆر شوێنو ناوچەدا تۆوی رێكخستنو پێشمەرگەیان چاندو دەورێكی گەورەیان گێڕا لە جۆشدانی كۆمەڵانی خەڵكو سازدانەوەی تێكۆشەران بۆ شەڕی پێشمەرگانە، بەڵام سەد مەخابن كەوتنە داوی سەركردایەتیی شۆڕش فرۆشو كوردكوژی

بارزانی خائینەوە کە بە فیتو یارمەتی ساواكو دەزگای جاسووسی ئیسرائیل بۆیان نابوونەوە." (*)

لەهەموشی سەیرترو سەمەرەتر، ئەوکاتەی شەهید وەستا ئەنوەر گیرا، خاڵە شیهابو مامۆستا جەعفەرو ئەنوەر زۆراب، شەش مانگ بوو، لە (١٩٧٦/١١/٢١) شەهیدکرابون. ئێمە دوای مانگێك (١٩٧٦/١٢/٢١) پارێزگاری سلێمانمان لەناو ناوەندی سلێمانیدا، لە جادەی مەولەوی، خستە بۆسەوە. هەر بۆ مێژوو کاتێتی رونیبکەمەوە کەوا:

---

* هەواڵنامەی خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کوردستانی عێراق لەماوەی دوو ساڵدا- لەبڵاوکراوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. مایسی ١٩٧٨. لاپەڕە(٢٥)

## ٣١

## تۆڵەسەندنو خۆدزینەوە!

ئەو رۆژەی تەرمی شەهید شیهابیان هێنایەوە سلێمانی. ئاپورەیەکی بەرچاو، لە گەڕەکی دەرگەزێن، لەبەردەم ماڵی شەهید شیهابدا، چاوەڕێی تەرمەکەیان دەکرد. شەو کە لە مزگەوتی دوودەرگا (بن تەبەق) تەرمەکە مایەوە، خەڵکی دڵسۆزی شاری سلێمانی، جگە لە کەسوکاری، جگە لە دەیان هاوڕێی کۆمەڵەو یەکێتی، لەوێ بون. ئەوکاتە، کە نوسەر پێی وایە دژی شەهید شیهابو هاوڕێکانی کۆمیتەی هەرێمەکانمان دروستکردووە، پێچەوانەی ئەم بوختانە، کاتێك شەوی پێشتر بروسکەی لەسێدارەدانەکە لەڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانیەوە، گەیشتە ماڵی خاڵە شیهاب، شێخ جەنابی براگەورەی شەهید شیهاب، شەهید ئاشتی حەمەسەعیدی یەکسەر نارد بەدوای مندا، ئەوکاتە، لەماڵی شەهید جەمالە رەش بوم. کە چوم بروسکەکە لە دوو دێڕدا بەعەرەبی نوسرابوو، بەرەبەیانی (١١/٢١) ئامادەی دوا دیداری (شیهاب نوری) بن. بروسکەیەك بوو، بەناوەرۆكو نوسینکەدا، مۆری فاشیەکانی پێوە دیار بوو. بروسکەیەکی دوور لە هەموو هەستێکی مرۆیی‌و دادپەروەری، بەوپەڕی خوێنساردیەوە، کەسوکاریان بۆ دوا دیدار ئاگادارکردبوو. هەمان بروسکە، بەهەمان ناوەرۆکی بەعسیانە، بۆ هاوڕێیانی دیکەش نێردرابوو.

که گەیشتمە ماڵی شێخ جەناب، بەتەنها لەگەڵم دانیشتو پێی وتم: کە بینیم چی پێبڵێم. تەنها هێندەم پێوترا بڵێم:

دڵنیای بکە کە هاوڕێکانی ڕێبازەکەی بەرنادەنو خوێنی ئەو سەرکردانە، بەفیڕۆ ناڕوات. تکام وایە، لەباتی من هەردوو دەستو هەردوو چاوی خاڵە شیهاب ماچ بکە. هەروەها گەر شەهید جەعفەرو ئەنوەریشت بینی، بەهەمان شێوە.

شەوێك بوو، هەتابڵێی ماتەمینی، دڵتەنگو جەرگبڕ. قوڕگم پڕبوو لە گریان. دەستم کردە ملی شێخ جەنابو سەیارەمان بۆ گرتنو بەڕێمان کردن.

کە تەرمەکەشیان گەیاندە بەردەرگا، شێخ جەناب لە سەیارە دابەزیو دەستی گرتمو گوتی: بەختیار، شیهاب وتی، بە بەختیار بڵێ: هاوڕێیان لەکاتی ناشتنی تەرمەکاندا جیفارستی نەبن. بەهێمنی کارەکە ئەنجام بدەن.

ئەو شەوە.. جگە لە من، لە کۆمیتەی هەرێمەکان، کەسی تر لەشاردا نەبوو. هاوڕێیانی دیکە لە شاخدا بون. بەڵام چەندین هاوڕێی کۆمەڵەو مەفرەزەیەکی ناوشار پێکەوە بوین. مەفرەزەکەی شەهید یاسینە ڕەش خۆیو (٣) پێشمەرگە ئاگایان لێمبوو. خۆشم دەمانچەم پێبوو. ئەوشەوە هەتا بەیانی ئەشکی تەرمەکەمان گرت. (*) شەو درەنگێ، شێخ جەناب ناردی بەدواما، منو کاك دلێری سەید مەجید چوین. (١٠ – ١٢) کەسێکی خۆیان دانیشتبونو یەکێکیان (نامەوێ ناوی بێنم) وتی:

- وامان پێباشە ئەمشەو بەبێدەنگی، شیهاب بنێژین، نەکا حکومەت پەلاماری خەڵك بداتو خەڵکیش دوچاری گرتنو ڕاونان بێن.

---

* لەو کەسانەی هەتا بەیانی بەدیار تەرمەکەوە، لە مزگەوت ئەشکیان گرت، د.کمال مەزهەر، فاروقی مەلا مستەفا، ڕوشدی عەزیز، جەمال تایەر، جەماڵە ڕەش. شێخ ڕەزای خزمیان. هەروەها زیاتر لە (٥٠) هاوڕێو پێشمەرگەی کۆمەڵە.

شێخ جەناب، وتی:

- کاك بەختیار دەتوانێ بڕیار بدات.

منیش وتم:

- تازە ئەوەی لێی دەترساین قەوما.. شەهید شیهاب سکرتێری کۆمەڵەیەو لەسەر کۆمەڵەو گەلەکەمان شەهیدکراوە. نەك لەسەر بنەماڵەو کەسوکاری. لەبەرئەوە ئێمە سبەینێ سەرپەرشتی ناشتنی تەرمەکەی دەکەین. هەوڵیشدەدەین بەهێمنی کارەکە ئەنجام بدەین. شەهید شیهاب خۆیشی وەسیەتی وابووە.

کە ئەو قسانەم کرد. ئامادەبوان مت بون. کەس بەرپەرچی نەدامەوە. قسەکانیان سەلماندم. شێخ جەناب‌و شێخ نیهادی برای، قسەکانیان پێخۆشبوو. باقیەکەی دیار بوو، مەترسییان هەبوو. ناهەقیشیان نەبوو.. بەعس بەعس بوو.

بەیانیەکەی.. کۆمەڵێك هاوڕێی کۆمەڵەمان ئامادەکرد. پیکابێك. چاویشمان بڕیبووە دەوروبەر ئەمن چی دەکات. زۆری نەخایاند، بەردەم مزگەوت بەرە بەرە بە لێشاو خەڵك کۆدەبونەوە. وایلێهات جمەی دەهات. تەرمان خستە ناو پیکابەکەوەو سۆزو خۆشەویستی شەهید شیهاب‌و گیانی تۆڵەسەندنەوەی، وا زاڵبوبوو بەسەرما، خۆشم چومە ناو پیکابەکەو لەتەنیشت تەرمەکەوە کڕنوشم بۆ بردو بە شەقامی کاوەدا، بۆ بەردەمی خانەقاو لەوێشەوە بەرەو گردی سەیوان. کەژاوەکە، بەشێنەیی دەڕۆشت‌و پەیتا پەیتاش خەڵك لەگەڵمان دەکەوتن. کە گەیشتینە سەر قەبران، ئاپورەی خەڵك شەپۆلی دەدا. ئەمن هەبون، بەڵام لەناو خەڵکەکەدا، ون بوبوون. کە تەرمەکەشیان ناشت، من هەر بەدیاریەوە بوم. شەهید جەمال تایەر لەتەنیشتم بوو، شەهید یاسینە ڕەش‌و شەهید سمایل قاسم لەدوامەوە بون‌و ئاگایان لێمبوو. کە مەلا کەوتە تەلقین،

مامۆستا جەمال تایەر بە منی وت: بڕۆی باشترە. ڕۆشتمو هەستیشم دەکرد، ئەمنەکان چاویان تێبڕیوم. ئەویش لەبەرئەوەی زەق بوبوین لەناو خەڵکەکە. بەشێك لە خەڵکەکە هاتنەوە بەردەمی ماڵی شەهید شیهابو هەندێك لە گەنجەکان هاواریان دژی ڕژێم کردبوو، ئەمنەکانیش پەلاماریان دابون. یەکێك لەوانە شەهید مارفی برازای کاك عەلی بچکۆل بوو. بەلاّم نەیانگرتبون.

بێگومان ئەم کارەی کردم، سەرچڵی بوو. نەدەگونجا لەگەڵ خەباتی نهێنیو دۆخی من. بەلاّم مرۆڤ وایە، زۆرجار لە دۆخی کارەساتباری وادا، جڵەوی سۆز شڵو دەماری تۆڵەسەندنەوەی ئەستور دەبێت. بەتایبەتی لەوکاتەدا، کاری گەورەمان پێنەدەکرا. تەنها دەمانتوانی یەك دوو ئەمنو بەعسی بکوژین. ئەمیش لەوکاتەدا باش نەبوو. لەم باسەوە دێمە سەر نوسەر.

نوسەر.. لەکاتی هاتنی تەرمەکەدا، جوامێر بوو. هاتو لەگەڵێشمان وەستا. دیاریش بوو بەئەندازەی ئێمە خەمبار بوو. ئێوارەکەی، لە مزگەوت بوین، بەتوڕەییەوە هاتەلاّمو وتی: بۆ وەستاون؟ بۆچی چەند نارنجۆکێك فڕێنادەنە ناو ئەمنەکانو تۆڵەناسەننەوە؟ خاڵە شیهاب ئەوەندە ناهێنێ؟ لەناو ئەو خەڵکە، نەدەکرا بکەوینە مشتومڕ؛

وتم: - توڕەمەبە، دڵنیابە چیمان پێبکرێ درێغی ناکەین بۆ تۆڵەسەندنەوە.

وتی: - نا.. ناتانەوێ هیچ بکەن. خواخواتان بوو، خاڵەتان لەکۆڵ بێتەوە.

لەوەلاّمدا، قسەیەکی رەقم پێوتو بەتوڕەییەوە پێمووت: - لەکاتی تۆڵەسەندندا.. پیاو بەو ئەم قسانەت بیرنەچێتەوە.

دوای ئەوە.. نامەم بۆ شەهید ئارامو کاك سالار نوسی، دەمانەوێ تۆڵەی شەهیدان شیهابو جەعفەرو ئەنورە زۆراب بە چالاکیەکی گەورە بکەینەوە. چوار پێشمەرگەی ئازامان بۆ بنێرن. شەهید ئارامو کاك سالارو شەهید عەلی

عەسکەری، ئەوکاتە لەدۆڵی جافایەتی دەبن. پێکەوە لەسەر نامەکەی من کۆدەبنەوەو دوای هەفتەیەك مەفرەزەیەکی (٥) کەسیی هاویەشیان لە پێشمەرگەکانی کۆمەڵەو بزوتنەوە بۆ ناردین. شەهید عەلی عەسکەری، کاك جەمال ئاغاو رێکخستنەکانی بزوتنەوەشی لە سلێمانی ئاگادارکردبوو، هاوکاریان بکەن، بۆ ئەم چالاکییە. (*)

ئەم مەفرەزەیە لەبەر نەبونی رێوشوێنی شاردنەوەیان ناچار چەند ماڵێکمان پێکردن(+) (وردەکاریەکی زۆری هەیە، هەڵیدەگرم بۆ هەلی تر) شەوێکیان، لەماڵی (تەهای حەمەرەش) لە جولەکان، سوسەیان کردبونو پێویست بوو بۆ شەوێك بۆ ماڵێکی دووریان بگوازینەوە. رومان کردە نوسەر، کەچی ئامادەنەبوو بۆ شەوێك پێشمەرگەکان داڵدە بدات. منیش بەیانیەکەی کە بینیم، بەتورەییەوە پێموت: لەسەر تەرمیْ شەهید شیهاب خۆت بۆ تۆڵەسەندنەوە هەڵدەکێشا، کەچی ئێستا ئامادەنیت، بۆ یەك شەویش شوێنی تۆڵەسێنەرانی بکەیتەوە. بڕوبیانوی ئەوتۆی دەهێنایەوە، جگە لە خۆپارێزی، هیچی راست نەبوو!! لەهەمووشی سەیرتر، نوسەرو کەسانی دیکەش لەناو کۆمەڵەو بزوتنەوە، لە رێکخستنەکانی شاردا، پێیانوابوو ئەو نەخشەیەی بۆ لەبۆسەخستنی پارێزگاری سلێمانی دامانڕشتووە، سەرچڵییەو مەحاڵە سەربگرێو پێشمەرگەکانو بەشێکی

---

* کۆمەڵەکان: شەهید سۆران، فاخر کەرکوکی، (لەتیف حەسەن عەزیز- مستۆ)ی برازای کاك سالار بوو، بۆ تۆڵەسەندنی شەهید شیهابو جەعفەرو ئەنوەری ناردبوو! بزوتنەوەکان: غەریبی ئەمینی بوكو عومەر هێلکە.

+ ماڵی مامۆستا ئەنوەرو شەهید ئەحمەدی ئەندازیار. بەداخەوە، هەر بەهۆی چۆنی ئەم مەفرەزەیەوە، بۆ ماڵی ئەحمەدی ئەندازیار، دوایی یەکێك لە پێشمەرگەکان دەگیرێ. زمان لە ئەحمەدی ئەندازیار دەداتو شەهیدیان کرد.

ڕێکخستنیش توش دەبن. نەخشەکەمان سەریگرتو کوتومت دوای مانگێک (١٩٧٦/١٢/٢١) لەسەر جادەی مەولەوی سەعات (٨,٤٥) دەقیقە، کاروانی پارێزگار کەوتە بۆسەکەمانەوە. شەهید سۆرانو فاخر کەرکوکی لەسەر مزگەوتی (شێخ سەلام) تەقەکەیان کرد. من رابەری چالاکیەکەو دلێری سەید مەجید هاوکارمو عەبدوللا خورشە (ئاسۆ) سایەقی گواستنەوەی پاش کشانەوەی مەفرەزەکە بوو.(*) مالی شەهید د.سەرداریشمان لە برایم پاشا، بۆ خۆشاردنەوەی پێشمەرگەکان دانابوو. نەخشەکەمان چۆن دارِشتبوو، (٩٠٪) سەرکەوت. تەنها دوو کەس، بە نەخشەکە پابەند نەبونو هەلهاتبوون (ناویان ناهێنمو دەیانبەخشمە مێژوو).

بەش بەحالی خۆم، ئەم چالاکییە تۆلەسێنە، لەناو یەکێتیدا تاقیکردنەوەیەکی نوێی سەرەتای بەرپرسیارێتیم بوو. ئەو رۆژانەی پێشمەرگە لەناو شار بون، من سەرقالی ئامادەکاری پلانەکە بوم. کەرەسەم بۆ ئامادە دەکردن. ئەو بەیانیەی پێشمەرگەکان هاتنە سەر مزگەوتەکە بۆ ئەنجامدانی نەخشەکە، خۆم پێشوازیم لێکردن. لەسەربانی مزگەوتەکە کە بەدلەراوکێوە چاوەڕێی گەیشتنی کاروانی پارێزگار بوین. کە گەیشتنو مارسیدسە رەشەکەی پارێزگار گەیشتنە ئاقاری دەسترێژو دەسترێژی لێکراو وەکو برێشکە گوللە دادەباریە سەر سەریارەکەو پارێزگار بەلادا کەوت. پۆلیسەکانی پارێزەری پارێزگام دەبینی چۆن چۆنی هەلدەهاتن. تاقیکردنەوەیەکی سەیر بوو.

لەوەوبەر لەسەر چیگوارا، لەسەر شەری ناو شار، لەسەر تۆپامارۆسو ئەلویەی حەمرای ژاپۆنی، لەسەر کارلۆس، ناو شۆرشی فەلەستینو چیگوارا

---

* ئەو سەیارەیەی پێشمەرگەکانی پێ گوێزرایەوە، لادایەکی شر بوو. هەر ئەوەشمان دەستکەوت. ئەویش هی باوکی (د.رێکەوت)ی بەرێوەبەری گشتی تەندروستی سلێمانی بوو. لەسەریشی گیراو چەرمەسەریەکی زۆری بەسەرداهات.

غەزە، چالاکیەکانی بەرەی رزگاریخوازی میللی فەلەستینی، زۆر شتم خوێندبوەوە، بەلاّم خۆم لەهیچ چالاکیەکدا بەشداریم نەکردبوو. لەم چالاکیەدا، بەبێ ئەزمون، بەبێ مەشق، بەبێ شارەزایی، تەنانەت دەمانچەکەی پێشم بوو، شارەزای کردنەوەو بەستنەوەی نەبوم. سەرەڕای ئەوەش، گیانی تۆلّەسەندنەوەی شەهید شیهابو هاورێکانی بەجۆرێ زالّبو بەسەرماندا، نە ترسو نە رێگریو نە دودلّیمان نەبوو. دوای تێپەڕینی (٣٥) سالّ بەسەر ئەو روداوەدا، دوای کێشمەکێشێکی زۆرو روداوی نالەبار بەسەرداهاتنیش لەناو یەکێتیو کۆمەلّەدا، بۆ یەك رۆژیش، لەو خۆشەویستیەی شەهید شیهابو ئەو چالاکیانەو هەرچیم کردووە، پێی زانرابێ یان نەزانرابێ، هەرگیز لێی پاشگەز نیم. ئەم نوسینانەی نوسەریش، سەرەڕای ئەوەی بەدەرونێکی پڕ لە رق نوسیویەتی، هەولّی زۆریشی داوە منو هاورێکانمان بخاتە بەرەیەکەوە، نەوەی ئێستاو ئایندە، لە دوو سەنگەری دژبەیەك بمانخوێننەوە، بەلاّم دلّنیام ئەم هەولاّنە ناتوانن چرکەیەك دلّەڕاوکێیەتی چالاکی تۆلّەسەندنی شەهیدانو دلّۆپێك ئارەقی ئەوکاتەمان، لەویژدانی خەلّکی دلّسۆز، بیرببەنەوە، یان بسڕنەوە. بەلّکو چەندین بەناو کتێبی تریش، لەلایەن چەندین کەسی دیکەوە، نوسراوونو هەولّیانداوە لە خەباتو خزمەتەکانمان کەمبکەنەوە، ئەوانە، گەر منالّیان بکوشتمایە، گەردنم ئازاد دەکردن. بەلاّم من ناتوانم لەسەر بێنمەکیو بێئەمەکی بەرامبەر روداوەکانی مێژوو، دەسەلاّتی ئەوەم نییە لێیانببورم. بەلاّم دلّنیام ئەو نوسینانەی ئەوان، وەکو چەمە زستانە وان، لەبەردەم تینی گەرمی راستیەکانی مێژوودا، زوو وشك دەبنەوە.

## ٣٢

# شەرمەزاریی جەلادو شانازیی قوربانیی

ورده ورده، نوسەر دێتە سەر ئەو لاپەڕە ڕەشانەی، کە دەبوو لە خەویش بیانبینێ، شەرم بکات بۆ هاوسەرەکەشی بگێڕێتەوە. بەڵام شەرمو جەلاد! شەرمو پاسەوانی زیندانی شۆڕشگێڕان! کوجا مەرحەبا.

بەڵێ هەروەکو بیەوێ بەخوێنەر بڵێ: ئەم کتێبەم بۆ شکاندنی دوو کەس لە کۆمیتەی هەرێمەکان نوسیووە، یەکەمیان شەهید ئارامە.. کە دڵنیام گەر زیندووبا، نوسەر زۆر خراپتری لەسەر دەنوسی. دووەمیشیان (مەلا بەختیار)ە، مادام زیندووم، درێغی دژ نەکردوم. بۆیە، جگەلەوەی لە باسی گشتی ڕوداوەکاندا، منیشی داوەتە بەر نەشتەری ڕق، بەتایبەتیش دەیەوێ باسی زیندانو زیندانیکردنم بکاتو دوا نوکی ژەهراوی ڕمی تۆڵەلێکردنەوەم، پیابچەقێنێ. لەسەر هیچ، لەکوێ ئەم (٥٠٦) لاپەڕەیەی کتێبەکە سوپاسی نەکەم، لەسەر هەڵدانەوەی چەند جارێکی ئەم لاپەڕانە، سوپاسی دەکەم.

یەکەمیان: لەبەرئەوەی لای خوێنەر، دەرونی ڕەشی خۆی دەرخستووەو ئیتر خوێنەر دەزانێ باقی قسەو بوختانەکانیشی چۆن چۆنی هۆنیوەتەوە.

دووەمیشیان: چونکە، یەکەمین جارە دەرگای باسکردنی ڕوداوەکانی زیندانم بۆ دەکاتەوە. کە هەتا ئێستا، دوورونزیك نەمدەویست توخنی ئەو باسانە بکەومو ببمە مایەی کێشەیەکی ناوەخت. لەمبارەوە سوپاسی دەکەم، وادەزانم ئەم باسانە، ئەو کاتژمێرەیە کە دەرگای دوای چوار ساڵ گۆڕی ئازادیم، لە تەنگەی

تۆژەڵە لێکرایەوەو بەکۆڵێ ئازارەوە، دوای ئەوەی لەوپەڕی باڵادەستی شۆڕشدا، پەلاماردرامو خرامە زیندانەوە. لەدوای هەرەسی (١٩٨٨) و ئەنفالەکانو قەتیسمان لەسەر سنوری کوردستانی عێراق- ئێرانو دوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانیش، دەرگای تاقە زیندانی کوردستانی عێراقو منی تاقە زیندانیی ئەو زیندانەم بۆ کرایەوە. ئەوکاتە، یەکێتی زیندانی نەبووە، هیچ کەسیشی لەزینداندا نەبوو.. جگە لە زیندانەکەی منو منی زیندانی!! بەڵام نوسەرو خوێنەریش دڵنیا دەکەمەوە، تەنانەت لە رونکردنەوەی ئەم بەشە خەمناکەشدا، بە کاردانەوەو رقو تۆڵەسەندنەوە، راستیەکان ناگێڕمەوە.

نوسەر.. بۆئەوەی زەمینەی رقهەڵڕشتنەکەی خۆشبکاتو خوێنەر باسی زیندانیکردنەکەی من بەهەق بزانێ، لە دوو شوێندا، راستەوخۆو ناراستەوخۆ پەلاماری من دەداو بەبێ ئەوەی دوای (٣٥) ساڵ لەو روداوانە، دەرسی لەو هەڵە گەورەیە وەرگرتبێ، دوای ئەم هەموو تاقیکردنەوەیەو کۆڵێك دەستکەوتنی بەڵگەنامەکان، نوسینی یاداشتنامەو ساغکردنەوەی راستیەکان، کەچی هەمان ئاگری رقەبەرایەتی بەردەداتە ئەو روداوە نەخوازراوەو لە باسکردنی زیندانیکردنماندا سەرەنجام بە تاوانباریشمان لەقەڵەم بدات. لە لاپەڕە (٩٣)دا دەڵێ:

"گەر وەك بەیانەکەی شویات دەڵێ (محترف) واتە لادەر بوونایە، ئەوانیش وەك نوسەرەکانی بەیانی شویات دەمێك کوردستانیو دەمێك مارکسیەکی عەیار ٢٤ و دەمێك پاڵەوانی مەیدانو دەمێکیش ترسنۆکێکی خۆڕانەگر لەبەردەم کەمترین مەترسیدا نەدەبوون؟"

لەم باسە راگوزەرەدا، بەبێ ناوهێنانم، دوای دوو لاپەڕە دێتەوە سەر هەمان بەسەرهاتی تراژیدی ویستگەیەك لە ویستگە خەمبارەکانی یەکێتی‌و، راستەوخۆ ئەم تێزابە دەکاتەوە بەو برینە قوڵەدا:

"بەندە لە ١٩٨٦ دا لێکۆڵینەوەم لەگەڵ حیکمەت (مەلا بەختیار) کردووەو ئەوسا دەمووت: هەزارجار ئۆخەی کە لە ٧٦ دا نەکەوتە بەردەستی رژێم"

جگە لەم دوو خاڵە، لەشوێنێکی تریشدا، کە دەکەوێتە بەرگی دووەمی ئەم کتێبە، زۆرتر باسی زیندان‌و نامەی من‌و هەست‌و نەستی ئەوکاتەم بەرامبەر منداڵەکانم‌و (زیلان)ی کچە گەورەی ئازیزم دەکات. بەڵام دەرهەق بە ئێستاش، پێویستە بڵێم:

من کە قوربانیی سیاسەتی پێشێلکردنی ئازادی بووم، کە بێمە قسە، شانازییە لەسەر بیروباوەڕ گیرابم. بەڵام کە قسەم لەسەر جەلادەکانی زیندان کرد، شەرمەزارییە. ئەوانیش چەند کەسێکن، بەدرەوشترین رەفتاریان بەرامبەرمان نواندو کێشەکەیان، لە کێشەیەکی سیاسییەوە، کردە کێشەی تۆڵەسەندنەوەی شەخسی. خراپترینی ئەو کەسانە، برایم جەلال بوو.

- دەمەوێت لەمێژوودا یەك جەلادم بۆ بدۆزنەوە شانازی بە جەلادبوونی خۆیەوە بکات؟!
- دەمەوێ یەك زیندانەوانم بۆ بدۆزنەوە، بەتایبەتی لەناو یەك رێکخستن‌و یەك شۆڕش‌و یەك رێبازی مێژووییدا، شانازی بە گرتن‌و ئیهانەکردنی هاوسەنگەرەکەی بکات؟!

- تۆ بزانە لە شۆڕشی ئەیلولدا، هیچ زیندانەوانێك لە زیندانەکانی چۆمانو دەربەندی رایات، باسی چۆنێتی گرتنی خەڵکی سیاسیان کردووە، هەروەها هی حیزبو تێکۆشەرەکانی تر لەناو ئەو زیندانانەدا؟!

- تۆ بزانە کەس هەیە باسی چۆنێتی شەهیدکردنی فاخر مێرگەسوریو باوکیو کەسوکاری بکات؟! کە من دڵنیام سەرۆكو سەرکردایەتی ئێستای پارتیش، هەروەکو چۆن لە رووداوەکەی هەمزە عەبدوڵلا پاشگەزن، لەو رووداوەش پەشیمانن. هەروەکو چۆن لەدوای راپەڕین، بەڕێز مەسعود بارزادنی سەردانی ماڵی شەهید عەلی عەسکەری کردو داوای لێبوردنی لێکردن. دڵنیام ئاواش بەرامبەر بە رووداوەکانی تر لەناخیاندا هەمان هەست هەیە.

- هەروەها لەناو یەکێتیو حیزبەکانی تریشدا. خۆم دەیان جارم لە مام جەلال بیستووە، لە زۆر رووداوی مێژوویيو رەفتاری ناشایستە لەناو شۆڕشی ئەیلولو شۆڕی نوێدا، پاشگەزە.

- ئایا ئەو شەڕانەی لە قرناقەو پشتئاشان کرا، لە شاخی سەفین بەرامبەر (جود) کرا، شەڕەکانی یەکێتیو هێزەکانی جود لە مەڵبەندی یەك، لەروانگەو هەستی بەرپرسیارێتی ئێستاوە، ئایا یەکێتی، لەهەمان روانگەی ئەوساوە، هەڵیاندەسەنگێنێ؟

- یاخود، شەڕەکانی جود دژی مەڵبەندی سێی هەولێر، کە کاردانەوەیەکی توندو لەچاو رووداوەکانی پێشتر، رووداوێکی یەکێتی هەژێن بوو، سەرەنجام یەکێتیش لەبەرامبەر ئەو کاردانەوەیە کاردانەوەیەکی زۆر توندتری نواند، یان داڵدەدانی محەمەدی حاجی مەحمودو قوڵکردنەوەی شەڕەکانو گرتنی نەوشیروان مستەفا و دیل کوشتنەکانو دروستکردنی جەوقەد، ئایا راست بوون؟

هەندێك روداو هەیە، روبەڕومان بۆتەوە، قوربانی تیا دراوە، کە بیرمدەکەونەوە موچرکم بەلەشدا دێت. گەر بێمە سەر نوسینیشیان، بێگومان بەش بەحاڵی خۆم، رەخنە لەخۆم دەگرم. تەنها دەرون نەخۆش وەکو نوسەر، لەزەت لە ئەشکەنجەدانی رۆحیی بەرامبەرەکانی دەبینێت. ئەمە سادییەتی (چێژبینین لە ئەشکەجەو ئازاردانی بەرامبەر)ی سیاسیە.

من دڵنیام، نوسەر، هەروەکو پێشینان دەڵێن: (دز بازاڕی شێواوی ئەوێ) سیاسەتمەداری خۆپەرستیش، تێکدانی ریزی رێکخستنەکانی‌و شێواندنی مێژووی هاوڕێکانی‌و چارەسەرنەکردنی کێشەکانی دەوێ. بەڵێ وایە..

لەم هەلومەرجەدا، کە ناکۆکی لایەنە سیاسیەکان، کێشەی جۆراوجۆری تێدایە. دەیەوێ بەهەڵدانەوەی ئەم لاپەڕانە، ناکۆکیەکان بگەنە بنبەستی چارەسەرنەکراو. هەروەکو چۆن لەکاتی یەکگرتنەوەی (جەلالی- مەلایی)دا، کە هەموو کورد پێی خۆشبوو، شانازی بەوەوە دەکات، زوو لە پارتی دوای یەکگرتنەوە دوورکەوتۆتەوە. ئێستاش بەهەمان ئەقڵیەتەوە، دەیەوێ کای کۆن، بە شەنی رقەبەرایەتی، بکا بە بادا. لەمەشیاندا، مەرامی ئەوەیە پاڵ بە کەسانی وەکو منەوە بنێ، ئۆباڵی چارەسەرنکردنەکە، بگرینە ئەستۆ. هەروەکو چۆن باسی دەمەقاڵێی پێشمەرگەکانی ئێمەو شەهید شێرکۆی شێخ عەلی دەکاتە، هۆیەك لە هۆیەکانی جیابونەوەی بزوتنەوەی سۆسیالیست. بەڵام خەیاڵی خاوە.

لە لاپەڕە (٩٥)دا دەڵێ:

" ئاش لە ساڵی ١٩٨٦ سەبارەت بە هەڵوێست وەرگرتنی سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتیی بەرامبەریان، تاوانی لە رێ لادان‌و هەڵفریواندن‌و کردنە

جاش‌و پیاوی رژێمی دەیان پێشمەرگەی قارەمان‌و خۆنەویستیان گرتەنەستۆ و بەئاشکراو بێ پەروا بۆ لاوازکردنی ریزەکانی کۆمەڵەو یەکێتیی دەیان کادری سیاسی‌و پێشمەرگانەو پێشمەرگەو ئەندامی کۆمەڵەیان هاندەدا بۆ تەسلیمبوونەوە بە رژێم‌و چۆڵکردنی سەنگەری شەرەف‌و تەنانەت چەك پێ هەڵگرتنیان لای رژێم بەو هیوایەی کودەتایەك بەسەر یەکێتییدا. دەرکەوت‌و جارێکی تر ئەو جاشانە بەچەکەوە دەبەنەوە لای خۆیان. "

ئەم قسانە، بەبێ بەڵگە، نەك هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش تاوانبار ناکات، بەڵکو نوسەرو ئەوانەی ئەو تاوانەیان بەناهەق دادەتاشی، دەخاتەوە بەردەم قەفەسی تاوانبارانی مێژوو.

گەر سەلماندی (ئاڵای شۆڕش) یەك پێشمەرگەی لەوانە، کە ئاڵای شۆڕش کردبێتیە جاش‌و پاشان بەکاریهێنابێ، ناوی سەلماند، من قسەکانی تێکڕا دەسەلمێنم.

بەم تومەت داتاشینە، دەیەوێ ئەو راستیانە داپۆشێ کە هەندێك لەبەرپرسان، ئاڵای شۆڕشەکانیان بانگدەکردو پێیاندەگوتن: جاش باشترە لە ئاش. بڕۆن تەسلیم ببنەوە، ئەگینا خراپتان بەسەردێنین.

دەتوانم بە سەدان پێشمەرگە، بە دەیان فەرماندەو کادر، ناویان ریزبکەم، کە ئاڵای شۆڕشیش نەبون، بەلام لەداخی سیاسەتی خراپی خەڵکانی وەکو نوسەرو هەلپەرستەکانی ناو شۆڕش‌و پێشێلکاریەکانی ئازادی، وازیان دەهێنا، یان دەچونە دەرەوەی وڵات، یاخود تەسلیم دەبوونەوە. هەندێکیان تاوانیشیان ئەنجامدا، ئەمانە نەك ئاڵای شۆڕش نەبون، بەڵکو دژی ئاڵای شۆڕشیش بون.

سەیرە..! نوسەرێك خۆی بە هێزی حیزبەکەی بلێ: ئەنفالچی، تالانچی، بە سکرتێری حیزبەکەی بلێ (فیرعەون) کەچی خڕ خڕ دێتە سەر ئاڵای شۆڕشە

راونراوەکان، ئەشکەنجەدراوەکان، سەرنگونکراو و زیندانیکراوەکان لەسەر دەستی بازرگانەکانی شەڕ، دژەکانی دیموکراسی، ئەقلیەتە سەربازییەکانو تازە تازە، دوای دەرکەوتنی راستیەکانو دەستکەوتنی بەلگەنامەکانی رژێمیش، دەیەوێ تاوانبارمان بکات. (*) چەند شەرمە بۆ کەسێك، تاوانی کردبێ‌و دوای سەلماندنی تاوانەکەی، بیەوێ تاوانەکانی بە کەسانی تردا هەڵبواسێ!

نوسەر.. دەبوایە دوای ساغبونەوەی روداوەکان، دوای دەرکەوتنی راستیەکانو دەستکەوتنی (فایل)ەکان، دەبوایە بوێر بوایەو دانی پیابنایە کە چەند ناهەق بون لەو تومەتانەی بۆ ئاڵای شۆڕشەکانیان دەهۆنیەوە. دەبوایە، بۆ یەك جاریش بێ، دەست بخاتە سەر ویژدانیو چاوێکی مرۆڤانەی هەڵبهێنایەو دان بەو هەڵانەدا بنێ. بەڵام، وادیارە ئێستاش چێژ لە جەلادی خۆی دەبینێ‌و ئەو تاقە سەرکەوتنەی لە سەرپەرشتی زیندانەکەی ئێمەدا، لەتەمەنی پێشمەرگایەتیدا، کردۆتە سەروەری بۆ خۆی. دەك پیرۆزی بێ، ئەم سەروەریو سەرکەوتنە!!

---

* لەناو تەواوی ئاڵای شۆڕشدا، چەند کەسێك لەناو شارەکاندا، لەسلێمانیو هەولێر، پەیوندیان بە رژێمەوە هەبووە. هەموویان (٦) کەس بون. من ئێستاش قسەیان لەگەڵ ناکەم. لەناو پێشمەرگەکانی ئاڵای شۆڕشدا، تەنها فەرماندەیەکی مەفرەزە، دوای پەلادارمانی ئاڵای شۆڕش پەیوەندی بە ئیستخباراتی هەولێرەوە کردبوو. لەگەڵ ئەویشدا، قسەم نییەو ناشبێ.

# بەشە وەڵامی سێهەم

## کۆمەڵە و شۆڕش و نوسەر

١. دواخستن یان فریاکەوتن؟
٢. کام یەکگرتنەوەی کۆمیتەکان؟
٣. یەکێتیە سپڵەکەی نوسەر
٤. کافتریایەکی دیمەشق‌و دەستەی دامەزرێنەر
٥. مەفرەزە رچەشکێنەکان
٦. کۆمەڵەو پێشمەرگەو شۆڕش
٧. قوڵبونەوەی ناکۆکیەکان
٨. بزوتنەوەو کۆمەڵەو دەرەبەگ
٩. ئارام‌و دێ، مەلا بەختیارو شار
١٠. سەردانەکانی "ئارام"یش نابینی؟!
١١. ناکۆکی لەسەر سەرکردایەتی‌و سکرتێر

١

## دواخستن یان فریاکەوتن ؟

چۆنیەتی بەرپابونی شۆڕشو پێکهێنانی مەفرەزەکان، نوسینی کتێبێک هەڵدەگرێ. کورتیەکەی:

لەناو کۆمیتەی هەرێمەکاندا، شەهید عەبدولرەزاق لایەنگری ماوەیەك دواخستنی بەرپابونی شۆڕش بوو، هەتا چارەنوسی شەهید شیهابو هاوڕێکانی، زیاتر نەکەوێتە مەترسیەوە.

هەرچی ئێمەش بوین، دەمانگوت: تازە، ئەوان گیراونو هەندێ کەسیش دانی بە نهێنیەکاندا ناوە، شۆڕشکردنو نەکردن، کاریگەری لەسەر دادگایکردنیان نابێ. چونکە ئەوان شۆڕشیان نەکردووە. زیاتر مام جەلالو ئێمەونانان تۆباڵمان دەکەوێتەئەستۆ.

لەو کەینو بەینەدا، پێویستمان بە بڕیاری مام جەلال بوو. (*) جارێکیان لەرێگەی دهۆکو جارێکیشیان لەرێگەی روتبەوە، من لەرێی دهۆکو شەهید ئازاد هەورامی لەرێگەی روتبەوە (سنوری سوریا) هەوڵماندا، سەرینەگرت. لە دهۆك لەماڵی (محەمەد کەریم کەشخەو ستاری برای شەهید جەبار فەرمان) خەوتم. دوای ئەوە بۆ جارێکی تر، منو ئازادی سەگرمەو کەمال محەمەد ئەمین

---

* لەوماوەیەی گۆڕینەوەی نامەکان، تەنها پەیوەندیمان بە مام جەلالەوە دەکرد، نەك دەستەی دامەزرێنەر. مامیش بەشەخسی بەناوی (جوتیار)ەوە وەڵامی دەدایەوە.

(خەڵکی خانەقینو کۆمەڵەی ساڵی ١٩٧٣ یە) هەوڵماندا بگەینە شەهید برایم عەزۆ، سەرینەگرت.

نوسەر لە لاپەڕە (٩٩-١٠٠)دا دەڵێ:

" کۆمیتەی شارەکان لەرێگەی ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب) ەوە نامەیەکی نارد بۆ هەڤاڵان لەدەرەوە بەتایبەت هەڤاڵ مام جەلالو لە نامەکەدا ئیشارەی بە سەفەرەکەی ساڵی ١٩٧٥ ی فەرەیدون عبدولقادر دابوو، بۆ لای مام جەلال، کە پەیوەند هەبوو، بە پێکهێنانی مەفرەزەی سەرەتایی چەکداریی. "

سەیرە! ئەو رووداوانەی راستیشنو لەبەرژەوەندی بۆچونەکانی خۆیەتی، چەواشەیان دەکات. راستیەکەی ئەوەیە، ئەبو شەهاب، کابرایەکی دۆزیبوەوە لە بەغداد، رۆشتووە بۆ دیمەشق. متمانەی پێکردووەو نامەیەکی بۆ مام جەلال ناردووە. مامیش وەڵامی داوەتەوەو نامیلکەی (الاتحاد الوطني لماذا؟)یشی پێ ناردۆتەوە. ئەبو شەهاب، نامیلکەکەی گەیاندە کۆمیتەی هەرێمەکان، شەهید ئارام نامیلکەکەو لێکدانەوەکانو بەرنامەکەی، چوارچێوە نیمچە بەرەییەکەی، زۆر بەدڵ بوو. هەربۆیەش بڕیاری وەرگێڕانی داو بڵاویشمان کردەوە. دوای ئەم پەیوەندییە، لەرێگەی شەهید جەمالە رەشەوە، کۆمیتەی هەرێمەکان، هەر لەو دەوروبەرەدا، پەیوەندیان بە مام جەلالەوە کرد. دەستبەجێ وەڵامیشمان وەرگرت. لەوەڵامدا بۆ ئێمە، دوورونزیك باسی کۆمیتەکەی لەمەڕ نوسەر ناکات. بیرمە لەنامەکاندا، مام شەهید ئارامی باش ناسیوە. بەردەوام باسی تەبایی‌و گونجاوی نێوان کۆمەڵەو بزوتنەوەو رێزگرتن لە شەهید عەلی عەسکەری‌و عومەر دەبابە دەکات. بۆ یەك جاریش، لە سێ نامەی گەیشتوی مامدا، ناوی نوسەر، ناڕاستەوخۆش، نەهاتبوو. تەواوی بەرنامەی چۆنیەتی شۆڕشکردنو دروستکردنی

مەفرەزەکان لە قامیشلو، هەروا پەیوەندی یەکێتی بە فەلەستینیەکان، هێزە عێراقیەکان، سەردانی مام بۆ ڕۆژئاوا، ئەرکەکانی ناو وڵات، پێکەوەنانی مەفرەزەی پروپاگەندەی چەکدارانە.. تاد، ئەم بابەتانە لە نامەکانی مام جەلالدا، هەبون، ئەگەر نوسەرو کۆمیتەکەی، لای مام، بونیان هەبوایە، خۆ دەبوو بۆ جارێکیش بێ، ئاماژەیان پێ بکات. لەبەرئەوەی نامەکەی ئەبو شەهابیش، بەکەسێکدا نێردرابوو، ناسراو نەبوو، مام جەلال کە گەڕایەوە، گوتی: ئێمە گومانمان لەو کابرایە هەبووە. نامەمان بۆ ئەبو شەهاب ناردبوو بێتە سوریا، هاتبا، دەمانگرت. واتا" گومانیان لە ئەبو شەهابیش پەیدا کردووە، ئیتر چۆن باسی یەکخستنی کۆمیتەکانو نهێنی لە نامەی مام جەلالدا، هاتووە.

ئەو قسانەی نوسەریش لە لاپەڕە (١٠٠) دا باسیان دەکات گوایە، مام جەلال چۆن چۆنی پێی وتوون، مەفرەزە پێکەوە بنێین، یان هەوڵی چەك کۆکردنەوە بدەنو لەگەڵ بزوتنەوە ڕێکبکەوین، ئەو قسانە هەمووی، مام جەلال بۆ ئێمەی نوسیبوو، شەخسی خۆشم بۆ نوسەرو شەهید سیروان تاڵەبانیم، لە کۆبونەوەیەکدا لە (گردی سەیوان) بۆم باسکردن. تەنانەت ئەوکاتە (٢٠٠٠) دیناریشی بۆ ناردبوین.

نوسەر لە لاپەڕە (١٠٠)دا دەڵێ:

" لە ناوەرۆکی نامەکەی مام جەلالدا دەردەکەوت، کە نامەی بۆ کۆمیتەی هەرێمەکانیش ناردبوو، لەڕێگەی (ئەنوەر شاکەلی) یەوە، کە کۆمیتەی هەرێمەکان خۆیان نامەیەکیان بۆ مام جەلال پێدا ناردبووە سوریا. "

ئەم قسانەش راست نین. راستیەکەی ئەوەیە، کە ئەنوەر شاکەلی‌و شەهید برایم عەزۆ و برایم عەبدەلی، دوای گرتنی شەهید ئەنوەر زۆراب، بەبێئەوەی بێنە سلێمانی، یان پەیوەندی بکەن، تەنانەت کۆمیتەی هەرێمەکانیش پێکەوەنەنرابوو، کۆتایی مانگی (٩/١٩٧٥) یان سەرەتای مانگی (١٠/ی ١٩٧٥) خۆیان گەیاندبووەوە دیمەشق. ئیتر لەوساوە، تەنها جارێك، ئەنوەر شاکەلی، نامەیەکی دۆستانەی بۆ شەهید ئارام بە پۆستەکەی مام جەلال ناردبوو و بەس.(*)

* یەکەمین جار لەرێگەی شەهید جەمالەوە، دووەم لەرێگەی حاجی عوسمانەوە (ماوەو لە سلێمانیشە) سێهەم جار لەرێگەی شەهید شازادەوە، نامەی مام و برایم عەزۆمان دەستکەوت.

## ٢

## كام يەكگرتنەوەى كۆميتەكان ؟

بە زۆرەملىێ، دەيەوێ كۆميتەكەيان بكات بە كۆميتەو بەئارەزووى خۆيشى ململانێى پێدەكات، هەڵوێستى پێدەردەبڕێ، ئەندامانى بۆ دادەنێ، پەيوەندى بە زيندانو دەرەوەى وڵات دەكات، بەياننامە دەردەكات.. يەك بەڵگەنامەشى لەسەر هيچى ئەو قسانەى ريزيكردون، پێ نييە. دواى ئەو هەموو هۆنينەوانە، ئێستا ئيتر لە لاپەڕە (١٠١)دا باسى ئەمەى خوارەوەيە:

" هەر لە مانگى ١٩٧٦/٥ ەوە، لەگەڵ بەردەوامى مشتومڕى نێوان هەردوولا، هەردوو كۆميتەكە يەكيانگرتەوەو پەيوەنديش بە هەڤاڵ شەهيد عەلى عەسكەريەوە كرا، بەڵام لەسەر داواو سوربوونى هەڤاڵانى كۆميتەى شارەكان. "

جارێ.. لە مێژووى كۆميتەى هەرێمەكاندا، روداوێك بەناوى يەكگرتنەوە بەناوى كۆميتەى هەرێمەكانو كۆميتەى رێكخستنى شارەكانى لەمەڕ نوسەر، دورونزيك لەئارادا نييە. تەنانەت لەتەك حيزبى رەنجدەرانيشدا، من بۆ يەكگرتنەوە لەگەڵياندا، هەروەكو پێشتر گوتومانە، دانەنيشتوم. خۆم، چەندين جارم ديووە، ئەوەى باسمان نەكردووە، يەكگرتنەوە بووە. بەڵكو هەوڵەكانى ئەوەندە لاواز بون، كۆميتەى هەرێمەكانيش هێندە سەركەوتوو بوو، نوسەر،

ڕۆژێ لە ڕۆژان باسی کۆمیتەی ڕێکخستنی شارەکانو یەکگرتنەوەی لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا، نەکردووە.

بەشی دووەمی پەرەگرافەکە، گوایە، پەیوەندی بە شەهید عەلی عەسکەریەوە کردووە، ئەویش، هەر زۆر دورە لە ڕاستیەوە. بۆ؟

لەبەرئەوەی مام جەلال، تەنها ناوی شەهید ئارامی دابوو بە شەهیدان: عەلی عەسکەریو د.خالیدو عومەر دەبابە. بزوتنەوە دوو جار د.خالیدیان، بە نامەی مام جەلالەوە، ناردبوو بۆ سلێمانی، مەخابن، ڕێکنەکەوتبوو، یەکتربببینن. هەتا کۆمەڵە مەفرەزەکانی نارده دەرەوە، هیچ جۆرە پەیوەندیەکمان بە بزوتنەوە، بەرەسمی نەبوو. تەنها ئەبوشەهاب (جارێکیان شەهید ئازادیش) لە بەغداد، بەنارەسمی، چاویان بە شەهید کاردۆ گەلاڵی دەکەوتو گفتوگۆی گشتیان دەکردو دەمانزانی ئەوان، بزوتنەوەی سۆسیال — دیموکراتی کوردستانیان دامەزراندووە. شەهید کاردۆ خۆیشی بە چەپ دەزانی، هەر ئەوکاتەش نامیلکەی (زێدەبایی) وەرگێڕابوو.

مانگێك زیاتر دەبوو، مەفرەزەکانی قەندیل، شارەزور، شارباژێر، دۆڵی جافایەتیو هەندێك ناوچەی دیکەش نێردرابونە دەرەوە، پێموایە ناوەڕاستی مانگی هەشت بوو، شەهید شەماڵی باخ (*) هاتە لای شەهید ئارام، ئەوکاتە هەردوکمان لەماڵی شەهید جەمالە ڕەش بوین، پەیامی شەهید عەلی

---

* شەهید شەماڵی باخ؛ ئەندامێکی هەرە چالاکی کۆمەڵەو پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕش بوو. (من یەکەمین جار لەماڵی شەهید جەمالە ڕەش لای شەهید ئارام دیمو پێکەوە ئەوڕۆژە چون شەهید عەلی عەسکەرییان لەشەدەڵە بینی) پاشان لە قەراغ ساڵی (١٩٧٧) هەر لای شەهید ئارام بینیمەوە. ماوەیەکیش نوێنەری یەکێتی بوو لە سوریا. دوای هاتنەوەی کرایە فەرماندەی تیپو هەتا بڵێی جوامێر بوو. مەخابن، لە پیلانێکی چاوەڕوانەکراوی جەرگبڕدا. لەگەڵ شەهید سەربازدا شەهید کران.

عەسکەری پێبوو، کە لە (شەدەڵە) یەك ببینین. دێی شەدەڵە، دێیەکی گرنگ‌و شوێنێکی هەرە ئەمینی پێشمەرگەو هەقەکانی کوردستان بوو. دەتوانم بڵێم: بەهۆی شەهید عەلی عەسکەری‌و ماڵی شێخ عەبدولکەریم شەدەڵەوە، زۆربەی خەڵکەکە یەکێتی‌و دۆستی یەکێتی بون. زۆریشیان بونە پێشمەرگە. شەهید عەلی عەسکەری، شەدەڵەی بۆ دیداری شەهید ئارام هەڵبژاردبوو. مەرجیشی دانابوو، کە تەنها ئامادەیە شەهید ئارام ببینێ، نەك کەسێکی تر. هەردوو شەهید، یەکیانبینی‌و خاڵە هاوبەش‌و لێکجیاوازەکانیان باسکردبوو.

کە چویشینە دەرەوە، دورونزیك شەهید عەلی عەسکەری باسی ئەوەی نەکردبوو، کە نوسەر لەڕێی ئەبوشەهابەوە، پەیوەندییان پێوەکردووە. تەنانەت لە (دۆڵی گۆستێ) [*] شەهید عەلی عەسکەری لەگەڵ ئەبوشەهاب تێکچوبون، کە مام جەلال هاتەوە، شکاتی لە ئەبوشەهاب کردو بڕیاری تەجمیدکردنی درا. تەنانەت دەستبەسەریش بوو. ئیتر نازانم پەیوەندی نوسەرو شەهید عەلی عەسکەری، لەکوێی هێناوە؟!

---

* دۆڵی گۆستێ: دۆڵێکی دووروودرێژە، لەسەرەتای دەشتی (بەرازگر)ەوە هەتا دەگاتە شاخی دالآمپۆ، درێژە. دۆڵێکی لێرەواری سەخت‌و ئاوی سازگارو کوێستانێکی بەلەوەڕە. سەرەتا بارەگای گەڕۆکی مەکتەبی سیاسی لەوێ دانرا. مام جەلالیش کە (١٩٧٧/٧/٢٠) گەیشتەوە، شەهید د.خالید، شەهید حسێنی بابەشێخ، کاك نەوشیروان، لەوێ بارەگایان دانابوو. مام جەلالیش لەوێ دوو مانگ مایەوە. سەرکردایەتی ناو وڵات‌و دەستەی دامەزرێنەر، هەر لەم دۆڵەدا، کرانە یەك. مام جەلالیش بەڕەسمی لەوێدا، بە سکرتێری گشتی (ی.ن.ك) هەڵبژێردرا.
دۆڵەکە، هەڵکەوتەیەکی ستراتیژی هەبوو. سێ بەشی کوردستانی پێکەوە دەبەست. ئەوکاتە بیرمە بڕیاردرا، دوای ساڵێکی تر، دۆڵی گۆستێ بکرێتە بارەگای سەرەکی سەرکردایەتی یەکێتی. تەنانەت بیریش لەوە کرایەوە، دوای رزگارکردنی کوردستان، ئەو ناوچەیە، وەکو پایتەختێکی نوێ، بۆ بەستنەوەی بەشەکانی کوردستان، ئاوەدانی سیاسی بکرێتەوە. بەداخەوە، لە کارەساتی هەکاریدا، ئەم پرۆژانە.. ئیتر لەبار چون.

## ٣

# یەکێتییە سپڵەکەی نوسەر

بواری ئەوە نییە، زیاتر لەوەی لەسەر کۆمەڵەم، لە بەش‌و بڕگەکانی پێشتردا، وتومە، شتی تر بڵێم، ئەمەیان بۆ رۆژگار با بمێنێ. بەڵام ناشکرێ هەندێك بۆچون لەسەر کۆمەڵەو یەکێتی هەن، لێرەدا باسیان نەکەم، کە پێموایە، بەشێکی باشی ئەو بۆچونانە، رەنگە تەنها لای من پارێزرابن‌و نەمدرکاندبن، ئێستا کاتێتی لایەکی لێفەکە لەسەر هەتیو هەڵبدەم!

نوسەر، لەم پەیوەندیەی یەکێتی‌و کۆمەڵە، لە لاپەڕە (١٠١-١٠٢)دا بەمشێوەیەی خوارەوە شیوەن دەکات:

" کۆمەڵە بۆ یەکێتیی بوو، بەو دایکە میهرەبانە بەبەزەیی‌و بەویژدانەی، کە هەر لە رۆژی لەدایکبوونی یەکێتیەوە، بەخوێنی رۆڵەکانی یەکێتیی پەروەردە کردو گۆشی کردن‌و بەردەوام بوو، لە خوێن و گیان و بیری پاك پێ بەخشینی، یەکێتیش وەك ئەو رۆڵە بێ ئەمەکە، بێ وەفایە، سپڵە بێ ویژدانە، وا بوو کە لە ئاهەنگی یەکەم کۆنگرەی خۆیدا لە بانی شەربەتی شادی پەرداخێك زەهری دەروونی خۆی، بۆ کۆمەڵە کرد بە دیاری پاداشت‌و پاش بەدەستهێنانی تاجی سەرکەوتنی خەبات‌و رزگاربوونی وولات‌و وولات بە دەرکردنی دوژمن، کاری بە کۆمەڵە نەماو بگرە بە ئەلتەرناتیڤی خۆشی زانی‌و لەوەش ترسا، کە کۆمەڵە بێتە ئەو حزبەی کە بتوانێ رۆڵی پێشرەوی‌و هاوکاری‌و هاوخەباتی بگێرێ."

ویژدانم لەئاست نوسەر ناسوتێنم کە یەکێك بووە لەو تێکۆشەرانەی، بەپێی باوەڕو ڕێبازێك، پەیڕەوی لێکردووە، لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا، سەرەڕای گرفتە دەرونیەکانی، پێکهاتەی خۆی، هەر تێکۆشاوەو پشوودرێژیش بووە. دوو براشی شەهید بووە. ماڵو منالی دەربەدەر بون. ئەمانە مشتێك لە خەرواری خەباتی ئەم پیاوەن. بەلآم کاتێك دێتە سەر باسی روداوەکانو خووی تایبەتی خۆی بەسەریا زالدەبێ، بەداخەوە، ئەم هەڤاڵە نەك ڕێز لە هاوڕێکانی ناگرێ، بەڵکو لە گێڕانەوەی رووداوەکاندا ڕێز لەخۆیشی ناگرێ. لەوەش زیاتر، هەوڵدەدات، خۆی وەکو شۆڕەسواری مەیدانی کۆمەڵە پشانبدات، راستیەکانیش بەویستی خۆی چەواشە دەکات. با دیقەت بدەین ئەم برایەمان لە لاپەڕە (١٠٢)دا چی دەڵێ:

" یەکێتیش وەك ئەو رۆڵە بێ ئەمەکە، بێ وەفایە، سپڵە بێ ویژدانە، وا بوو کە لە ئاهەنگی یەکەم کۆنگرەی خۆیدا لە بانی شەربەتی شادی پەرداخێك زەهری دەروونی خۆی،.."

جارێ.. با ئەوە باس بکەین کە کۆمەڵە، لەسەردەمی شەهیدی نەمر خاڵە شیهابو سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵە، دوای مشتومڕێکی هەڤاڵانە، دامەزراندنی یەکێتیان قبوڵ بووە. کۆمەڵەش یەکەمین ڕێکخراو بووە، هاوزای یەکێتی، بۆتە بەشێکی یەکێتی.

یەکەمین کەس، کاك فەرەیدون عەبدولقادر، لەگەڵ مام جەلال وەکو سکرتێری کۆمەڵە گفتوگۆی کردووە. هەتا پێکەوە وەکو کۆمەڵە بڕیار بدەن. سەرەتا مام ویستویەتی حیزبێکی وەکو (رزگاری) چلەکان دابمەزرێنێ. بەلآم

سەرکردایەتی کۆمەڵە رازی نەبووە، سەرەنجام لە یەکێتیدا ساغبۆتەوە (ئەمەم لە کاك فەرەیدون بیستووە). کەوابێ:

پەسەندکردنی دامەزراندنو چونەناو ریزەکانی یەکێتی، سەرەرای ئەوەی جیاوازی لەنێوان مام جەلالو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا لەسەر ناکۆکی سەرەکیو بنچینەییو رێبازی کۆمەڵە، هەروەها لەنێوان سەرکردایەتی کۆمەڵەو مام جەلالیشدا، هەبووە، بەڵام لەدوائاکامدا، سەرکردایەتی کۆمەڵە، پێش گرتنو راوەدونانی لەلایەن رژێمەوە، بەباوەری تەواوەوە، یەکێتی پەسەندکردوەو هاوزای دامەزراندنیشی، کۆمەڵە بەشێك بووە لە یەکێتی. نەك چوبێتە ناو یەکێتی. چونکە ئەوکاتە مام جەلال، سکرتێری کۆمەڵە بووە.

ئەوسا، وەکو دەیگێرێتەوە کە بەوشێوەیە لە سەرکردایەتی کۆمەڵە نزیکبووەو، هەروەکو دەشیهۆنێتەوە گوایە سەرپەرشتی کۆمیتەی رێکخستنەکانی ناوشاری کردووە، ئەمیش لەسەر هەمان رێبازی یەکێتی بەردەوام بووە، گوایە، لەرێی ئەبوشەهابەوە نامەی بۆ مام جەلال نوسیووە.

لەوماوەیەدا، دوای دەوروبەری شەش مانگ لە دامەزراندنی یەکێتی، کۆمیتەی هەرێمەکان پێکهێنراوەو دوای ساڵێکیش ئینجا پەیوەندی بە مام جەلالەوە کردووە. کە دەستیش کراوە بە جێبەجێکردنی بەرنامەی پێکەوەنانی مەفرەزەکان، لەسەر بریاری مام جەلال، (وەکو سکرتێری کۆمەڵەو دامەزرێنەری ی.ن.ك) بۆئەوەی لەگەڵ هاتنەوەی شەهید برایم عەزۆ و هاورێکانی هاوئاهەنگ دەستپێبکەین (دەستیشمان پێکرد) نوسەر، سەرەرای ئەو هەموو ناکۆکیەی خۆی باسی دەکات، دورونزیك، بۆچونێکی جیاوازی لەسەر یەکێتیو مام جەلالیش نەبووە.

کاتێك هاتۆتە دەریشەوە، ئەو ناکۆکۆییە دەستکردانەی لەخەیاڵیا دروستیکردبونو هاندەری بون، هەمیشە لای مام جەلالو کاك نەوشیروان، دژی

کۆمیتەی هەرێمەکان قسە بکاتو لەپاڵ ئەوانیشدا، دژایەتیمان بکات. تەنانەت، پێش هاتنەدەرەوەشی، کە زانیبوی کاکە ئارام شەهید بووەو لەسەر پێشنیازی من، نامەم بۆ مام جەلال نوسیبوو کۆبونەوەی فراوان بکەینو سەرکردایەتیو سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێرین، کە ئەمەی زانیبوو، نامەی بۆ مام جەلالو کاك نەوشیروان نوسیبوو، تیایدا، هێرشی کردبووە سەر کۆمیتەی هەرێمەکانو جۆرەها سوێندی دابون هەرچی چۆنێ بووە، بەرگری لێبکەنو بۆ سەرکردایەتی هەڵیبژێرن. دەقی ئەم نامەیە کاك نەوشیروان کاتی خۆی بۆی خوێندمەوە. لێی پرسیم رام چییە؟ گوتم: پێمباشە کاندید بکرێ، بەڵام بەومەرجەی بێتە شاخ.

لەکۆبونەوەکەی نەورۆزی (١٩٧٨)ی نۆکان، پێش بەرێکەوتنی کاروانی هەکاری، کاك نەوشیروان بەشێکی نامەکەی نوسەری خوێندەوەو بۆ مێژوو دەیلێم: من لەو کەسانە بوم دەنگمدایە. دەرچوو بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە. هاتیشەدەرەوە. ئەوکاتە من ئامر هەرێمی یەکی شارەزورو هەورامان بوم. لەباتی شەهید رەئوف بەگ، کە ئامر هەرێمی شارەزوور بوو، سەرپەرشتی ئەو هەرێمەشم دەکرد.

لەدەرەوەشدا، بۆ یەکجاریشم نەبیستووە نوسەر، قسەیەکی لەسەر سەربەخۆیی کۆمەڵەو پاراستنی سیاسەتی کۆمەڵەی کردبێ.

لەدوای یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەو هەڵبژاردنی سەرکردایەتی نوێو نوێنەرەکانی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی یەکێتیدا، لە کۆبونەوەی سەرکردایەتیدا مام جەلال، لەناو باسەکانیا، وتی:

- لەبەرئەوەی یەکێتی لە ناکۆکی سیاسیو عەسکەری جۆراوجۆردایە لەگەڵ پارتیو سۆسیالیستو پاسۆکدا، وا چاکە لەمەودوا، باڵەکانی ناو یەکێتی،

لەناو خەڵکدا، تەنها باسی یەکێتی بکەن، کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان، بەجیا کۆبونەوە بەخەڵك نەکەن.

ئەو کۆبونەوەیە، کاك نەوشیروان، وەکو سکرتێری کۆمەڵە ئامادە نەبوو. شەهید جەمال تایەر، عەلی بچکۆل، ملازم عومەر، فەرەیدون عەبدولقادرو من لە کۆبونەوەکەدا بوین.

تازە لە کێشمەکێشی یەکەمین کۆنفرانس هاتبوینەدەرەوەو باری دەرونیم هیلاك بوو. کەمێك وەستام بزانم هاوڕێیانی تر دەڵێن چی؟ هیچیان نەووت. ناچار قسەم کردو گوتم:

- ئەم سیاسەتە سەربەخۆیی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان ناهێڵێ. ئێمە کۆمەڵەیەکی یەکێتین. یەکێتیەکی کۆمەڵە نین. بۆیە، ئەو بڕیارە پەسەند ناکەم..

کاك عەلی بچکۆل، دژم قسەی کردوو.. گوتی:

- دۆخی کوردستانو یەکێتی ئەوە تەحەمول ناکاتو هەرواچاکە بەناوی یەکێتیەوە هەمومان قسە بکەین.

شەهید جەمال تایەر، کە زانی مشتومڕەکە گەرم بوو، هەڵوێستەیەکی لە بڕیارەکەی خۆی کردو.. گوتی:

- من رای خۆم دەکێشمەوەو داوام وایە مۆڵەتمان بدەن لەگەڵ ناوەندی کۆمەڵە قسە بکەین.

بۆ کۆبونەوەی ئاینده، شەهید جەمال راوێژی بە کاك نەوشیروان کردبوو، ئەویش پێی گوتبوو: بۆچونەکەی مەلا بەختیار راستە، سەربەخۆیی کۆمەڵە لەدەست مەدەن.

نەرم نەرم، نەرمی نواندن لەناو یەکێتیدا، بەبێ ئەوەی گیانی دیالۆگو پێکەوەکارکردنی ئۆرگانیکیانە لەسەر بنچینەی یەکێتیو ناکۆکی، برەوپێبدرێ، سەرەنجام، قولکردنەوەی ناکۆکیەکانی ناو ریزەکانی کۆمەڵەو روداوە نالەبارەکانی وەکو زادەی ئەو ناکۆکیانە، هاوڕێیانی کۆمەڵەی خراپ لێکترازانو کاك نەوشیروانیش، بوو بە تاکە رابەری بێ ئەملاوئەولای کۆمەڵە، کە ئیتر لەسەر رێبازو چارەنوسی کۆمەڵە، دیالۆگو ئازادی بیروڕای جیاواز دەربڕین، بوو بەقوربانی خەڵکانی وەکو نوسەر. کاتێکیش گەلەکەمانو شۆڕش ئەنفالەکانی بەسەردا سەپێنرا، کۆمەڵەی چوارپارچەخواز، لەسەر سنوری دوو پارچەی کوردستان نێژرا، تەنانەت فرمێسکیشی بۆ نەرێژرا!!

بێگومان، لەو مێژووەدا، هەمومان پشکی هەڵەمان بەردەکەوێ. ئەوکاتە، بەئاستو ئەندازی ئەوکاتە لە خەباتو ململانێیو رێبازی چەپ، تێدەگەیشتین. تاقیکردنەوەمان کەمو ئەرکەکانمان قورس بوون. بەڵام، لەم مێژووەدا، ئەوانەی تەمەنیان لە ئێمە زیاترو تاقیکردنەوەیان زۆرتر بووە، ئەوان پتر بەرپرسیاری کێشەو روداو و بڕیارەکانن. زۆربەی بڕیارەکانیش، یان ئەوان داویانە، یان لەژێر کاریگەری ئەواندا، دراوون. بەشێکیشی سەپێنراوون.

لەو پەرەگرافەی باسی یەکێتی دەکاتو تیایدا پێی وایە یەکێتی: یەکێتی بێنەمەکە، سپڵەو بێویژدانە.. تاد.

ئەو قسانە، دوای (٢٢) ساڵ لە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا، جگە لە شەوارەی سیاسیو لە کاروان جێمان، هیچی تر ناگەیەنێ. ئێمەومانان، سەرەڕای ئەوەی، لەسەر رێبازی جیاوازی ئایدیۆلۆژیو سیاسی، کێشەی گەورەی

چاوەڕوانەکراومان بەسەردا هات، کە نوسەریش لەو کەسانە بووە (بڕیاری لەسێدارەدانی) پەسەندکردوین‌و قبوڵیشی کردووە ببێتە زیندانەوانی زیندانەکەمان، بەڵام پاش مانگێك، لەسەر دزینی بەشێکی بودجەی نانخواردن‌و پێویستیەکانمان، دەریانکرد، تەنانەت لەم ئەرکەشدا سەرنەکەوت. سەرەڕای ئەوەی ئێمەومانان دوچاری ئەو کێشانە بوین، ئێستا ئەو بیروبۆچونەمان لەسەر یەکێتی نییە. گەر لەئایندەشدا، رەخنەمان، یان بۆچونی دیکەمان، لەسەر ئەو رۆژگارەو ئەو رەفتارانەو ئەو ئازارانە هەبێ کە بەرامبەرمان کراوون، هەرگیز مێژووی یەکێتی لەچوارچێوەی ئەو روداوانەدا قەتیس ناکەین‌و لەبری لێکدانەوەی بابەتی، رقەبەرایەتی‌و ئازاری دەرونی ناکەینە بنەمای هەڵسەنگاندنی یەکێتی.

گریمان، وەکو (فەرمویەتی!!) یەکێتی بێئەمەکە، سپڵەو بێویژدانە، بابە گریمان ئەم قسانە راستن. بەڵام ئەو قسانە، یان ئەم حوکمدانانە، ناکرێ بەبێ لێکدانەوە بەسەرماندا تێپەڕن. لێکدانەوەکەش، بەبێ هەڵوێست‌و سیاسەتی خودی نوسەر، لەدوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، هەتائێستا، راست‌و دروست دەرناچێ. لەم پێودانگەوە، مادام ئەوە بیروڕای نوسەرە لەسەر یەکێتی، جێی خۆیەتی لە جەنابی بپرسین کە:

- لەبەرئەوەی دەزانین، نوسەر، چەند هۆگری سەرکردایەتی بووەو لە سێ کۆنفرانسی کۆمەڵەو دوو کۆنگرەی یەکێتی خۆی بۆ سەرکردایەتی هەڵبژاردووەو لەهیچیاندا، چارەکێکی دەنگەکانیشی نەدەهێنا. لە سێهەمین کۆنگرەی یەکێتیشدا کە دڵنیابوو دەرناچێت، خۆی بۆ ئەنجومەنی ناوەند هەڵبژارد. لەبەر ئەم هۆگرییەی، لە کۆنگرەکان دەیبەخشین. ئەی بۆ

پەرلەمانی عێراق، بۆچی قبوڵی کرد، نوێنەری یەکێتی‌و لەناو لیستی یەکێتیدا، بێ؟

خۆ.. لە دامەزراندنی کۆمەڵەوە، سەروبنی زمانی، بەو توانا تیۆری‌و فەلسەفییە کەمەی هەیەتی، دژی عێراقچێتی کۆمیتەی هەرێمەکان‌و شەهید شاسوارو هاوسوارانی تائێستاش قسەدەکات، نازادە.. گەرچی بۆچونەکانی کەمترین بنچینەی زانستی هەیەو هیچ بەڵگەیەکیشی لەسەر ئەو تومەت خستنەپاڵەمان نییە. لەمیشیاندا، دەیناسین کە ئەندێشەی دۆگمی هەیەو ئەوەی دەیلێ لەسەر کەسانی تر، هەرئەوەیە، برپەنگی لێبدەی کەمی ناکاتەوە. بەڵام لەرووی لۆژیکیەوە شایەنی پرسیارلێکردنە کە:

ئەوێکی دوژمنی عێراقچێتی، ئەوێکی کوردستانیەکی چوارپارچەیی، ئەرێ ئەوە چۆنە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا دەبێتە نوێنەری کورد؟

ئەگەر لەو کۆبونەوانەی پەرلەمانی عێراقدا، تەنها بۆ تاقە جارێك، باسی سەربەخۆیی کوردستانی عێراق، یان هاوخەباتی هەرچوار پارچەکەی کوردستان کردبێ، دەڵێین: بابە ئەم گوڵئەندامە ئەندامی نوێنەرانی عێراقی بۆ کوردستان ویستوەو حەڵاڵی بێ. ئەمیشی نەکردبێ، ئەگەر لەو هەموو یارمەتیەی تائێستاش وەریدەگرێ، کە لە ئەندام پەرلەمان‌و.. وەزیرو.. مەکتەبی سیاسیەکانی یەکێتی زیاتریش وەردەگرێ، گەر بۆ مانگێك، یان مانگانە لایەنی کەمی موچەکەی، بۆ پێشمەرگەی پارچەکانی تری کوردستان، یان ماڵە شەهیدێکی هێزێکی کوردستانی، یاخود بۆ ماڵی ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵ شەهید فوئاد سوڵتانیدا، بەبەرچاوی خۆی شەهیدکراو زاتی نەکرد تاقە فیشەکێك لەسەر شەهید فوئادو ئەو شەهیدە، بتەقێنێ، بەڵکو گیانیان رزگار

بکات. گەر یارمەتی ئەو شەهیدەشی دابێ، ئیتر لە ئەندامەتی پەرلەمانی عێراق، دەمان دادەخەین.

یاخود ئەگەر، بۆ تاقە جارێکیش یارمەتی ماڵی ئەو دوو شەهیدەی دابێ کە لای سێوسێنان ( ئەکرەمو خەبات) کە لە شەڕێکی نابەرامبەردا شەهیدکرانو خۆیو مەفرەزەکەی لە شاخی کەولۆشدا، لەپشتی سێوسێنان، دەیانتوانی تەقەیان لەسەر بکەن، رەنگبو لە هەڵمەتی کۆپتەرەکانیش رزگاریان بکەن، یان هیچ نەبێ هەردوکیان شەهید نەبنو ئەیوبو غەریبیش (برای شەهید سیروان) هەر لەو شەڕەدا بریندار نەکرابان، بەڵکو گەر بۆ جارێکیش سەری کێشابێتە ماڵی یەکێکیشیان، ئێستا.. خەڵك باشتر باوەڕی بە قسەکانی دەکردو هەموو کەسێکیش دەیگوت:

بابە.. بۆیە لە ئەنجومەنی نوێنەرایەتی عێراقدا بۆتە نوێنەر، هەتا بەرگری لە کوردستان سەرانسەر بکات؛ هەتا هاوکاری شەهیدان بکات.. تاد. بەڵام کەسێك، هیچی ئەوانەی باسمان کردن: لەکاتی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەدا؛ لەدوای ئەوەش، لەناو کۆنگرەکانی یەکێتیدا؛ لەکاتی هەڵبژاردنی نوێنەراندا؛ هاوکاری شەهیدان لە موچەو هاوکاری ئەندامەتی ئەنجومەنەکەدا؛ لە دانیشتنو مشتومڕەکانیدا، رۆژێك لە رۆژان، باسی کوردستانیەتی نەکردبێ، باسی کۆمەڵەی نەکردبێ، رەخنەی لە یەکێتیو (بێئەمەکیو بێوەفاییو، سپڵەی بێویژدانی- قسەکانی نوسەرن) نەکردبێ، ئێستا، دوای تێپەڕینی زیاتر لە دوو دەهە، کە خانەنشینیەکەی، بۆ ژیانی خۆی (کە هەقیشیەتی) دەستەبەرکردبێ.. وەکو بێمنەتێك، تازە تازە، رەخنە لە یەکێتی دەگرێو نازناوی دزێو دزێوی دەخاتە پاڵ. کاکی برا، لەپاش باران کەپەنەك!!

## ٤

# کافتریایەکی دیمەشق‌و دەستەی دامەزرێنەر

لەکۆتاییدا، دوو لاپەڕە لەسەر مێژووی یەکێتی‌و فەرامۆشکردنی یادی کۆمەڵە لە یادەکانی دامەزراندنی یەکێتیدا دەکات؛ دەیەوێ، گەر بۆ جارێکیش بێ، دەست بخاتە سەر ویژدانی‌و رۆڵێکیش بداتە کۆمیتەی هەرێمەکان. بەڵام نەك لەبەرئەوەی رێڕەوی گێڕانەوەی رووداوەکان، هانیاندابێ باشتر بیر لەو مێژووە بکاتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی دەیەوێ، ئێستاش، وای پشانبدات دڵسۆزترین کەسی کۆمەڵە، لەدوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەش، تەنها خۆیەتی.. بۆئەوەی ئەمەشی بۆ بچێتەسەر، کەوتۆتە رەخنەلێگرتنی یەکێتی‌و لەم رەخنەگرتنەشدا، بۆ سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی‌و چۆنیەتی دامەزراندنی شانە سەرەتاییەکانی یەکێتی لە کوردستاندا دەگەڕێتەوە. ئا لێرەدا، باسی کۆمیتەی هەرێمەکانیش بە چاکە دەکات. بخوێننەوە لە لاپەڕە (١٠٣-١٠٤)دا چی دەڵێ:

" ئەو هەڤاڵانەی دەستەی دامەزرێنەر، پێیان وایە کە بە کۆبونەوەی شەش کەس‌و لە (کافتریایەکی دمشق)دا، بە سحری ساحران‌و بەیانێکی راگەیاندنی دامەزراندنی یەکێتیی بێ هاوکاری‌و هیچ ئەندام‌و کادری لە کوردستان بۆ دروستکردنی رێکخستنی یەکێتیی کوردستاندا، ئەم بەیانە دۆست‌و لایەنگری بۆ یەکێتیی پەیداکردووە. راستە ئەو هەڤاڵانە دەستپێکەربوون لە دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و بەتایبەتی‌و لەسەرو هەموشیانەوە هەڤاڵ مام جەلال، بەڵام هەرگیز ئەو بەیانە سحراویە بە بڵاوکردنەوەی لە رادیۆی دیمەشقەوە

نەبووە هۆی پەیداکردنی دۆستو لایەنگر بۆ یەکێتیی، ئەوەی کە دۆستو لایەنگری بۆ یەکێتیی دروستکرد، تەنیا کۆمەڵە بوو، بەڵگەشم ئەوەیە کە ئەو بەیانە بە ووتەی نەشیروان لە ۱۹۷٥/٥/۲۲ و بە ووتەی فواد مەعسوم لە ۱۹۷٥/٥/۲٥ بە ووتەی کەمال فواد لە ۱۹۷٥/٦/۱ دا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام یەکێتیی لەپاش مانگی ۱۹۷٦/۲ وە لە کوردستاندا دۆستو لایەنگری بۆ پەیدابوو، کە بە هەوڵو کارو تەقەلاو هیمەتی کۆمیتەی شارەکانو کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵ کرا، نەك بە سحری خوێندنەوەی بەیانێك لە رادیۆی دیمەشق پایتەختی وڵاتی داگیرکەری پارچەیەکی کوردستانەوە. "

سەبارەت بە دامەزراندنی یەکێتیو دەستەی دامەزرێنەرو پەیوەندی بەناو کوردستانەوە، بەشێك لە قسەکانی راستن. بەڵام قسەوباس لەسەر چۆنیەتی دامەزراندنی یەکێتی، بیروڕای کۆمەڵە بۆ دامەزراندنی یەکێتی، جیاوازیەکانی نێوانیان، چۆنیەتی دامەزراندنی بزوتنەوەی سۆسیالیست- دیموکرات کە دوای کۆمەڵە، چۆن چۆنی چۆتە ناو یەکێتی؛ پاشان.. لەکوردستاندا، شانەو رێکخستنەکان چۆن پێکهێنرانو سەرەنجام کۆمیتەی شارەکان چۆن دامەزرانو رابەرایەتی دەکرانو پەرەیانسەند.. ئەمانە تێکڕا پرسیارگەلێکن، وەکو پێویست وەڵامنەدراونەتەوەو ئەو وەڵامانەی دراویشنەتەوە، پیاچونەوەو لێکۆڵینەوەی وردیان پێویستە. لەمبارەوە، من پێموایە، حیزبو رێکخراو، لەسەدەی رابوردودا نییە، بەئەندازەی کادرە سەرەکیەکانی یەکێتی، غەدری لە ماندووبونی تێکۆشەرانی راستەقینەی خۆی کردبێ. کەم حزبییش هەیە، بەقەد کادرەکانی یەکێتی، لە نوسینی روداوەکانی مێژوودا، غەدریان لەیەکتر کردبێ. هۆی سەرەکی ئەم بەدبەختیەی یەکێتی لەوەدایە، یەکێتی خۆی، بڕیاری نەداوە، لەرێگەی لیژنەیەکی پسپۆڕەوە، بەڵگەنامەکان، چ نوسراو، چ چاپکراو، چ

گوتراو، چ شایەتەکانی زیندوو، چ وێنەکان.. تاد، کۆبکاتەوەو بەبەرنامەیەکی زانستی، توێژینەوەی لەسەر بکاتو ئەو مێژووە پڕ لە شانازییە، پڕ لە سەرکەوتنە، پڕ لە جوامێرییە، پڕ لە سەروەرانو قارەمانانی شاخو شار، هەروەها ئەو مێژووەی کە هەڵەی کەمی تیانەکراوە، شکستی کەم بەسەر یەکێتیدا نەهێنراوە، غەدری سەیر سەیر کراوە، رەفتاری ناپەسەندیش ئەنجامدراوە.. تاد. تێکڕا، لایەنەکانی گەشو خامۆش، چاکو خراپ، هەڵمەتو هەڵهات هەڵهات، قارەمانو ترسنۆك، راستگۆو درۆزن، بەناو دامەزرێنەرو بەکردەوە هیچ لەدەستنەهاتوو، بەناو سەرکردەو بە تاقیکردنەوە شکستخواردوو، کەسایەتی بچوکی بە مەرام گەورەکراو، بە تەکەتول داپۆشینی هەڵەکانو هەر بەتەکەتول شکاندنی بەرامبەرەکان.. بەڵێ..

هێشتا شۆڕشگێڕ و ناشۆڕشگێڕ، ئازاو ترسنۆك، خاوەن هەڵوێستو هەلپەرست، خۆراگرو روخاو، درۆزنو راستگۆ، تێکدەرو روخێنەر، بۆچونە راستو چەواشەکاریەکان، خۆفرۆشو بێگەردەکان، هەناسەکورتو پشوودرێژەکان، دیموکراتو خۆسەپێنەرەکان، قین لەدڵو لەخۆبوردوەکان، پیلانگێڕو پیلانلێگێڕاو.. تاد. بەڵێ ئەو قسانە هەموو کەسێك دەزانێ، لەمێژووی یەکێتیدا هەبونو هەن (هەروەها لەمێژووی لایەنەکانی تریشدا زۆرتر نەبن کەمتر نین) بەڵام، تەواوی ئەو راستیانە، بەهەردوو دیودا، یەکێتی بەڕەسمی، بەزانستی، خۆی لە قەرە نەداوون.

ئەوەی دوای هەرەسی (١٩٧٥) هەموو ئەوانەی کەموزۆر بەرپرسیارێتیمان هەبوو، لەناو روداوەکاندا بوین، چەندمان چاکە کردبێ، چاکمان کردووەو چەندیش خراپەمان کردبێ، ناتوانین خۆمانی لێبدزینەوە. لەپێشەوەدا مام جەلال، ئینجا ئەوانەی جێگری بون. دوای ئەمانیش ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو فەرماندە عەسکەریو سیاسیەکان. پێشمەرگە،

ئەندامی ئاسایی، بەدەگمەن خەتایان هەیە. هەقیش نییە لە گێڕانەوەی رووداوەکانی ئەو مێژووەدا، جیاوازی لەنێوان هاوسەنگەرەکان، هەڤاڵەکان، ئەوانەی خۆشمانویستون‌و خۆشیشمان نەویستون، بکەین.

نوسەر.. یەکێکە لەوکەسانە. من ناتوانم سەراپای مێژووی وەك یەك بپێوم. ئەویش ناتوانێ. من یان ئەو، هەوڵیش بدەین، بشنوسین، ماوەیەکی کورت بۆمان دەچێتەسەر. سەرەنجام راستیەکان دەردەخرێنەوە. ئیتر کاتێتی، دوای ئەو هەموو حەشرەی بە مێژووی یەکێتی کراوە، مێژووەکەی وەکو هەیە بنوسرێتەوە.

کە دەڵێ: تەنها کۆمەڵە یەکێتی دروستکرد. وەکو سەرەتای دروستکردنی شانەکان وابوو. بەڵام هەرزووش کۆمەڵەو بزوتنەوەی سۆسیالیست، لیژنەی هاوبەشی شارەکانمان، لەو شوێنەی بزوتنەوە هەبوو، دروستکرد. لەوانە: سلێمانی‌و هەولێر.

دیسان کە دەڵێ: بەهەوڵ‌و کارو تەقەلاو هیمەتی کۆمیتەی شارەکان‌و کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵە لەپاش مانگی (٢/١٩٧٦) وە دۆست‌و لایەنگری بۆ یەکێتی پەیدابوو.. تاد.

ئەمیش دیقەتی گەرەکە. بۆ؟ لەبەرئەوەی نوسەر مێژووی رووداوەکانی دەستکاری کردووە، هەتا شوێنێك بۆ (کۆمیتەی شارەکان)ی لەمەڕ خۆی دابین بکات.

راستیەکەی ئەوەیە، هەتا کۆمیتەی هەرێمەکان، پەیوەندیان بە مام جەلالەوە نەکردو نەمانزانی، کوت‌ومت ئەوان چی دەکەن‌و بەتەمای چین لەکوردستاندا، لەخۆمانەوە، یەك شانەی یەکێتیشمان دروستنەکرد. کاتێك، دوای مانگی (٥/ی ١٩٧٦)یش، پەیوەندیان بە مام جەلالەوە کردو بەرنامەکەمان زانی، ئەوەی پێی دەگوترا کۆمیتەی شارەکان، نەمابوو.

نوسەریش، خۆیو چەند هاوڕێیەك، لەوانە، شەهید سیروان تاڵەبانیو تالیب رۆستەم (کە بوو بە قوربانی کێشەکانی ئەو سەردەمە) پەیوەندیان بەمنەوە هەبوو. کە بڕیاری دامەزراندنی رێکخستنەکانی یەکێتیش لە کۆمیتەی هەرێمەکاندا درا، بە من سپێردرا سەرپەرشتی بکەم. چونکە، ئەوکاتە شەرەفی ئەوەم هەبوو، سەرپەرشتی زۆربەی رایەڵەکانی رێکخستنەکانی کۆمەڵە بکەم. کۆمیتەکانی: بەغداد، خانەقین، گەرمیان، سلێمانی، هەڵەبجە، پێنجوێن، کەرکوك، رانیە، هەولێر، قەڵادزێو کۆیە، لەماوەی دوو مانگێکدا، هەر لەرێگەی کادرو ئەندامانی کۆمەڵەوە دروستکراو سەرپەرشتیش کران. نوسەریش، لەناو پرۆسەکەدا، ئەرکی پێ دەسپێردراو هەڵیشدەسوڕا.(*)

دوای مانگی (٦/ی ١٩٧٦) لەسەر پێشنیازی مام جەلال، رێکخراوێك بەناوی (یەکێتیی پێشمەرگەی کوردستان) دامەزرێنرا، کاك برایم جەلالمان کردە سەرپەرشتیاری. توانی لەماوەیەکی دیاریکراودا، پەیوەندی بە دەیان فەرماندەو پێشمەرگەوە بکات. بۆئەوکاتە کارێکی باش بوو. بەڵام کۆمەڵە توانای چەكو پارەی نەبوو، ئەگینا خەڵکی زۆرتری هەبون. کە گەیشتینە سەروبەندی

* یەکەمین شانە، وەکو شانەی رەسمی، بەندە وەکو سەرپەرشتیاری پێکهێنانی رێکخستنەکانی یەکێتی، پێکمهێنا، شانەی ژنان بوو، لەم تێکۆشەرانە: ١- روناکی شێخ جەناب.٢- شەهید ناشتی حەمەسەعید. ٣- شوکری (هاوسەری حاکم برایم). ٤- وەصفیە بەنی وەیس. یەکەمین کۆبونەوە لەماڵی کاك جەماڵو کاك جەلال فەقێ نەورەحمان (مامی شەهید ناشتی) ئەنجامدرا. ماڵەکەیان لەتەنیشت ماڵی کاك عومەری مامە سەعەوە بوو (مێردی خاتوو سەبیحە پوری شەهید جەمالە رەش)، سێ مانگ لەو ماڵەدا موختەفی بووموو چاکەی زۆریان بەسەرمەوە هەیە. لەهەمان ماڵدا ماڵی گوزیدە خان هەبوو (دایکی بەختیاری جیهاز) شەهید جەماڵ عەلی باپیریش لەژوورێکی ئەواندا موختەفی بوو. کەسمان بەکەسمان نەدەزانی. لەو یەکەمین کۆبونەوەیەدا، باسی یەکێتیو شۆرشم بۆ کردن. تومەزە روناك کادرێکی هەڵسوڕاوی بەشی ژنانی کۆمەڵە بووە، من نەمزانیبوو. ئەوکاتە سۆرانیم باش نەدەزانی، بەلەهجەکەمدا زانیبوی خانەقینیم. راپۆرتی لێنوسیبوم بۆ کۆمیتەی شاری سلێمانی: کە خانەقینیەك هاتووە، ناوی بەختیارە، دەیانەوێت رێکخستنێك بەناوی یەکێتیەوە دروستبکەن. داواشی کردبوو سۆراغی ئەو رێکخستنە بکرێت، چییەو ئەمە پیلان نەبێت لە کۆمەڵە؟! شەهید نارام راپۆرتەکەی پیشانی خۆم داو دەستی کرد بە پێکەنین، وتی: نا نا هاورێیانی کۆمەڵە زۆر وریان!!

(حوزەیرانی ١٩٧٦) ئیتر بەتەواوەتی خۆمان بۆ شۆڕش ئامادەکردو شەهید ئارامیش (پەیڕەوی ناوخۆی دەستە چەکدارەکان)ی بۆ رزگاری کوردستانو کوردستانیەتی شۆڕشو کۆمەڵەو یەکێتی نوسی، کە دورونزیك باسی عێراقچێتیەکەی نوسەری تیا نییە.

لە (هەڵسەنگاندنی شویات)دا زۆر لەسەر ئەوە دەڕوات کە کۆمیتەی هەرێمەکان باسی ریفۆرمی کشتوکاڵیان کردوەو تەعریبو تەهجیریان وەکو سیاسەتی سەرەکی بەعس بەرامبەر جوتیاران، فەرامۆش کردووە. بزانن لە لاپەڕە (٩٤)دا چۆن راستیەکان هەڵدەگەڕێنێتەوە:

" من دەپرسم، جووتیارێك سەرپشك بکرێ، لە دابەشکردنی زەوی بەسەریدا، بەڵام بە راگوازراویو دەرکراوی لە زێدی باپیرانی خۆیو لە ئاوارەییدا، یان ژیان لەسەر زێدی خۆیو دابەش نەکردنی زەوی بەسەریدا، کامیان هەڵدەبژێرێ؟ دابەشکردنی زەوی بەسەر کام جوتیاردا؟ ئەوانەی بەزۆر راگوێزرانو لە ئوردوگای زۆرەملێدا بەندو تەڵبەندکران؟"

کام زەوی دابەش بکرێ؟ ئەو زەویانەی کە پلانی سوتماك کردنی بەدرێژایی سنوری باشوری کوردستانو بەقوڵایی پتر لە ٢٠ کیلۆمەتر بۆ داڕێژرابوو، بڕیاری بڕیاری کردنی بە ناوچەی قەدەغەکراو بۆ درابوو "

کەچی.. کوتومت پێچەوانەی ئەو قسانەی سەرەوە، شەهید ئارام لە (پەیڕەوی ناوخۆی دەستە چەکدارەکان)دا، دەڵێ:

"هوشیارکردنەوەو راپەڕاندنی جەماهیر وە لە هەنگاوی یەکەمدا مەسەلەی (تعریبو تهجیر) بۆ ئەکەینە منطلق بۆ بزواندنی هەستی نیشتمان پەروەرانەی جەماهیرو مەترسیەکانی ئەو سیاسەتەی دوژمنیان بۆ روون بکرێتەوەو لەمەوە وردەوردە بچن بۆ مەسەلە سەرەکیەکان وەکو هەڵوێستی ئێمە سەبارەت بە

مەسەلەی نەتەوایەتی کورد کە باوەڕی تەواومان بەهەموو مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد هەیەو لەسەرو هەمویەوە مافی بڕیاردانی دواڕۆژو چارەنوسی لەلایەن خۆیەوە لەگەڵ ئەمەدا ئەمە باش روون بکرێتەوە کە خەباتی ناوکۆیی کوردو عەرەبو هەموو نەتەوە بچوکەکانی برامان لەعێراقدا زامنی سەرکەوتنی هەموو گەلی عێراقە بە گەلی کوردمانەوەو هەروەها رون بکرێتەوە کە خەباتی گەلەکەمان بەشێکە لە خەباتی گەلانی جیهانو سەرکەوتنی هەریەکێکیان سەرکەوتنە بۆ هەموو گەلانی جیهان." (*)

لەدرێژەی ئەو بۆچونانەداو لەهەمان بابەتدا، شەهید ئارام کاتێك رێوشوێن بۆ مەفرەزە سەرەتاییەکان دادەڕێژێ، کە چۆن لەناو جوتیاراندا، بەتایبەتی ئەو کوێخاو کەسانەی فریوی دوژمنیان خواردووە، هەڵسوکەوت بکرێ، دیسان دێتە سەر تەهجیرو تەعریبو بەرونی دەنوسێ:

"بەهۆی ئەو زروفەوە کە دوای ئاش بەتاڵ هاتەپێشەوەو پاش گەڕانەوەی دامودەزگاکانی میری بۆ ناوچەکانی کوردستان دوژمن کەوتە ئەوەی کە خەڵکی بەزەبرو ترساندن بکەنە بەعسیو پیاوی خۆیان وە بەتایبەتی زەبری زۆریان لەسەر کوێخای دێو پیاوەکانی تری لادێ بۆئەوەی معلوماتیان بۆ کۆبکەنەوەو دەوری جاسوسیان پێ ببین ئێمە بەرامبەر ئەم کەسانە ئەبێ لەسەرەتاوە هەڵوێستێکی نەرمان هەبێ وە نەبێ یەکسەر مۆری تاوانو خەیانەتکاریان لێبدەینو هەوڵی لەناوبردنیان بدەین بەڵکو بەپێچەوانەوە کاتێك ئەچینە ناویانەوە وایان تێبگەیەنین کە ئەوانە بەپیاوی خەراپ نازانین وە هەوڵ بدەین کە راستی سیاسەتە تاوانکاریەکانی میرییان بۆ روون بکەینەوە بەتایبەتی سیاسەتی

---

(*) کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان – عێراق/ بەشی یەکەم، هەڵبژاردەیەك لە نوسینەکانی شەهید ئارام. (ل ٣١).

تەهجیرو تەعریبو مەترسی بۆ سەر ئەوانیش وە تێیان بگەیەنین کە میری هەمو کوردی بەیەك چاو تەماشا ئەکات وە لەبەینی رەشو سپیدا جیاوازی ناکات بەم جۆرە هەوڵی راکێشانیان بدەین بەلای گەلدا، خۆ ئەگەر لەوانە تیایاندا هەبوو کە بەدڵو بەگیان لەگەڵ دوژمندا بووەو هەر سوریش بوو لەسەر ئەو هەڵوێستەی ئەوا هەوڵ ئەدەین کە لەبەرچاوی خەڵکی دێیەکە قسەی لەگەڵ بکەین بەڵکو بیگێڕینەوە بۆ سەر رێی راست ئەگەر دیسان وازی نەهێنا ئەوا سزای تاوانکاری خۆی وە ئەگەر بۆمان کرا لەبەرچاوی خەڵکی دێیەکە محاکەمە بکرێتو سزا وەرگرێت." (*)

لەسەر هەمان رێبازو بۆ هاندانی پێشمەرگەو جەماوەر دژی سیاسەتی تەعریبو تەهجیر، لە وتاری (باری ئێستای کوردستان) کە مانگێك دوای (پەیڕەوی ناوخۆی دەستە چەکدارەکان) نوسیویەتی، جگەلەوەی شەهید ئارام یەکەمین کەسە لەناو کۆمەڵەو یەکێتیدا، لەم وتارەدا، بەراشکاوی بە بەعس دەڵێ بەعسی فاشی، کوتومت ئاوا دەنوسێ:

"هەرچەندە رژێمەکانی پێشوی عێراق کۆنەپەرست بوون بەڵام هەرگیز ئەم سیاسەتە چەپەڵەی کە ئەمڕۆ رژێمی بەعسی فاشیست بەناوی پێشکەوتنخوازیو دوژمنایەتی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمەوە لەکوردستان جێبەجێی ئەکات هیچ حوکمەتێکی تر پەیڕەوی نەکردوە." (+)

جگە لەو ئەندێشە رۆشنەی شەهید ئارام بەرامبەر ئایدیۆلۆژیەتی بەعس، کە دوای ئەوەش لەناو یەکێتیدا، رێكو رەوان بە بەعس نەوتراوە (فاشی) بەڵکو

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو. (ل ٣٢).

+ هەمان سەرچاوەی پێشوو. (ل ٣٥).

پێی دەگوترا (ڕەفتارفاشی). لەدرێژەی ئەو وتارەدا، لەسەر تەعریبو تەهجیر، لەهەمان لاپەڕەدا، بێ تەمومژ دەنوسێ:

"بێگومان ئەوەشمان لەبیرە کە بەعسیەکان تەنانەت لەکاتێکشدا لەگەڵ (پ.د.ك) و بارزانیدا هاوپەیمان بوون وە لەوماوەی چوار ساڵەدا کە ئەبو حوکمی زاتی لە کوردستاندا جێبەجێ بکەن. کەچی هەر لەوماوەیەدا سیاسەتەکەی بەرامبەر گەلەکەمان بەردەوام بوو. هەموو ئەزانین کە کۆچ پێکردنیو داگیرکردنی زەویو زارو ماڵیان لەناوچەی کەرکوكو خانەقینو شەنگارو زۆر شوێنی تر لەوکاتەشدا کراوە جگە لە دەرکردنو گواستنەوەو دورخستنەوەی سەدان کرێکاری نەوت لە کەرکوك هەروەها دەرکردنو داگیرکردنی سامانو ماڵی هەزاران کوردی فەیلی لەعێراق." (*)

دەتوانین لە وتارەکانی شەهید ئارامدا، چەندین بابەت لەسەر تەعریب، تەهجیر، تەبعیس، تەرحیلو تەسفیری فەیلیەکان بدۆزینەوە، کە هەر هەموی بەڵگەن لەسەر پوچەڵکردنەوەی ئەو تومەتە هەڵبەستراوانەی نوسەر لەم کتێبەیدا، ویستویەتی شەهید ئارام وا بەم نەوەیەو خوێنەر بناسێنێ، کە ئاگای لە جوتیارانو دۆخی دێهات نەبووە.

ئەوە بەشێکی کەمی سەرگوزشتەی چۆنیەتی دامەزراندنی ڕێکخستنەکانی یەکێتین لە کوردستاندا. هەروەها هی هێزی پێشمەرگەش. کە نوسەر مەبەستێتی لەم گێڕانەوەی، خۆی بکاتە شاسواری ئەو سەردەمە، بۆئەوەی ئەمەشی بۆ بچێتەسەر، بەهەڵە، باسێکی کۆمیتەی هەرێمەکانی خستۆتەپاڵ خۆیو نوسینکەی.

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو. (ل ٣٥).

هەر لەمبارەوە، ئەوەی لام سەیرە، ئەوەیە نوسەر لەو ساڵانەدا کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا توێنراوەتەوە، لە یادەکانی یەکێتیدا، قسەیەکی ئەوتۆی بۆ باسکردنی یەکێتی نەکردووە، کەچی دوای ئەو هەموو ساڵە، لەم کتێبەدا، باسەکە زیندوودەکاتەوە.

دوای ئەوەی ساڵی (١٩٩٣) لەگەڵ یەکێتیدا یەکمانگرتەوە، هەموو ساڵێك لەیادی یەکێتیدا، من قسەم کردبێ، یان نوسیبێتم، باسی کۆمەڵەم کردووە. دوای یەکگرتنەوەمان کە یادی یەکێتی کراو لە تەلەفزیۆندا ساڵی (١٩٩٤) چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کردم، گوتم: یەکێتی (٥) ساڵ پێش دامەزراندنی، لەسەر رەگی کۆمەڵەی رەنجدەران رواوە، بۆ ئەو مێژووە بفەوتێ. ساڵی (٢٠١١)یش، لەوەڵامی خیتابەکەی مام جەلالدا، من لە ژمارە (٣٢٦)ی رۆژنامەی چاودێردا، سەروتارەکەم لەسەر رۆڵی کۆمەڵە لەناو یەکێتیو شۆڕشدا، لەبەرامبەر، باسکردنی دەستەی دامەزرێنەرو باسنەکردنی سەرکردایەتی کۆمەڵە لەناو وڵاتدا، نوسی. (*)

---

* بۆ خوێندنەوەی دەقی سەروتاری رۆژنامەی چاودێر (ژ٣٢٦- ٢٠١١/٦/٦) بڕوانە پاشکۆی ئەم کتێبە.

٥

## مەفرەزە ڕچەشکێنەکان

وەکو پەرۆشێك، لەدرێژەی ئەم بەشەی نوسینەکەیدا، بۆ باسکردنی شۆڕش‌و مەفرەزەکان، گفتوگۆیەکی باش دێنێتەگۆڕێ. بەڵام هەڵەی لە مێژووەکاندا کردووە. ڕێك‌و ڕەوانیش دانی پیادا نانێ کە کۆمیتەی هەرێمەکان لە ناردنەدەرەوەی مەفرەزەکان‌و بڵاوکراوەکان‌و ڕێکخستنی یەکێتیدا، چ ڕۆڵێکی هەبووە.

وەکو باسی بەرپرس‌و پێشمەرگەکانی سەرەتای شۆڕش‌و ڕۆڵی کۆمیتەی هەرێمەکان وەکو خۆی ناکات، بەهەڵەش هەندێك زانیاری دەڵێ. وەکو لاپەڕە (١٠٥):

" — لە دۆڵی قەرەداغ شەهید سیروان "فەیسەڵ تاڵەبانی"، گۆران، ئەنوەری مەجید سوڵتان‌و چەندانی تر. "

ئەمەیان وا نییە. شەهید سیروان‌و شەهید ئەنوەری مەجید سوڵتان، مانگی (٩ و١٠)ی ١٩٧٦ چونە ناوچەی بەرزنجەو شارباژێر. پاشان شەهید سیروان (١٩٧٧) گوێزرایەوە قەراغ. (*)

* خۆم هەردوکیانم نارده دەرەوە. شەهید سیروان لەماڵی شێخ ئەشرەف تاڵەبانیەوە ڕەوانەم کرد. شەهید ئەنوەری مەجید سوڵتانیش لەماڵی سوارەی ئەحمەد عارفەوە، بەڕێمکرد.

هەروەها لە لاپەڕە (١٠٥)دا دەڵێ:

" — لە دۆڵی جافەتی فەقێ سمایل، عبدولقادر هەڵەدنی جەمالی عەلی باپیر. "

ئەمەشیان، وا نییە.. کە دەیگێڕێتەوە. مەفرەزەی دۆڵی جافایەتی سالار عەزیز سەرپەرشتی کردو سەرەتا چونە دێی هەڵەدنو لە ئەشکەوتی (مادین) خۆیان پەنا دا. ئازاد سەرگرمەشیان لەگەڵ بوو، بەڵام پاشان چوو بۆ قەراغ. فەقێ سمایلیش، سەرەتا خۆی چووبووە دەرەوە. بەڵام دوای دوو مانگ چووە پاڵ قیادەی موەقەتە.

بۆ چونەدەرەوەی فەقێ سمایل؛ نوسەرو شەهید ئارام سەرگوزشتەیەکی خۆشیان لەنێواندایە، جێی خۆیەتی بیگێڕمەوە.

کە دەستمان کرد بە پەیوەندی پێوەکردنی پێشمەرگەو دانانی بەرنامەو دیاریکردنی شوێنەکان، نوسەر نامەیەکی لەرێگەی کاك دلێری سەید مەجیدەوە بۆ شەهید ئارام نوسیبوو کە فەقێ سمایل پەیوەندی پێوەکردووەو ئامادەیە بەسەدان چەکدارەوە، پەیوەندیان پێوەبکات. کە نامەکەم دەگاتە کاك ئارام، دەڵێ: من باوەڕناکەم لەوناوە ئەوەندە چەکدار هەبێو هەشبێ، هەمووی بەقسەی فەقێ سمایل ناکەن. بەڵام هاوڕێ برایم با بڕوا بزانین چی دەکات؟ نوسەر رۆشتبوو، کە گەڕایەوە، شەهید ئارامی دیبوو، وتبووی (٤١٤) پێشمەرگەم بە فەقێ سمایلیشەوە رێکخستووەو ناوی نهێنیشم بۆ داناوون. شەهید ئارامیش، حازر بەدەم بوو. ئاسان نەبوو قسەی بەسەرداتێپەڕێ، پێی وتبوو:

- هاوڕێ برایم ناوی نهێنیت بۆ هەمویان داناوە؟

وتبوی: - بەڵێ..

- ٤١٤ پێشمەرگەشن؟

وتبوی: - بەڵێ.

شەهید ئارامیش وتبووی بە (١٤) پێشمەرگە رازیمو چوارسەدەکەی تر بۆ خۆت. کاتێك کاك سالار چوبووە ناوچەکە، چوار پێشمەرگەشی دابیننەکردبوو بۆ یەکێتی. بەهەموشیان مەفرەزەیەك دەبنو دەچنە ناو قیادەی موەقەتە!

## ٦

# کۆمەڵەو پێشمەرگەو شۆڕش

لەسەر شۆڕش‌و چۆنیەتی پێکهێنانی مەفرەزەکان، پێشتر قسەوباس هاتەپێشەوە. ئێستا دەیەوێ لەدەرگایەکی ترەوە بێتە ناو روداوەکان‌و کۆمیتەی هەرێمەکان، بەسەرکردایەتیەکی سەرچڵی لە سیاسەت تێنەگەیشتبوو لە شۆڕش نەزان‌و خەیاڵاوی پشانبدات. لەمبارەوە لە لاپەڕە (١٠٨)دا دەنوسێ:

" رایەکیان کە هی شەهید ئارام‌و سالار عەزیز بوو، لەدوایش مەلا بەختیاریش چوە پاڵ ئەو رایە کە پێویستە ئەمجارە شۆڕشی چینی کرێکاران‌و جوتیارانی شۆڕشگێڕ بێ، دەبێ هەوڵ بدرێ بنکەی سوور (البؤرة الثورية). دابمەزرێنرێ‌و لەناوچەی رزگارکراو خەباتی چینایەتی بەرپا بکرێ‌و سەرکردایەتیەکی تریان پەسەند نەدەکرد، جگە لە شەخسی مام جەلال کە کاریان پێی بوو. "

بەڕاستی، ئەم حوکمدانە، لەخەیاڵی نوسەر رسکێندراوە. لەناو کۆمەڵەدا، کوت‌ومت، وەکو دەڵێ، بیرکردنەوەی وا نەبوو. بەڵام کۆمەڵە، رێکخراوێکی ماوستی مارکسستی بوو، بێگومان لە جیهانبینی شۆڕشگێڕانەوە دەیڕوانییە شۆڕشی نوێ. مەسەلەی (البؤرة الثورية) دوورونزیك، لە بیرکردنەوەی ئەوسای کۆمەڵەدا نەبووە. لەهیچ نوسراوێکیشدا، بیری وا مەترەح نەبووە. دوو نوسین لەسەر چۆنیەتی شۆڕشکردن، بەڵگەو بەڵگەنامەی چاپکراوی کۆمیتەی

هەرێمەکانن، بەناوی (لیژنەی سەرکردایەتی دەستە چەکدارەکان — حوزەیرانی ١٩٧٦) ئەوی تریش بەهەمان ناوی (باری ئێستای کوردستان — سەرەتای تەموزی ١٩٧٦) نوسەر بۆئەوەی بۆچونەکانی لەمەڕ (البؤرة الثورية)ی ناو کۆمەڵە، یان باڵێکی کۆمەڵە بسەلمێنێ، دەبوایە، لەو دوو نوسراوە، وەکو بەڵگەنامە ئاماژەی بە دێڕێك، پەرەگرافێك، بۆچونێك بکردایە، هەتا خوێنەر باوەڕی پێ بکات. پێچەوانەی ئەو حوکمدانەی خەیاڵی نوسەر، لەو دوو بەڵگەنامەیەدا، لەسەر شۆڕش‌و یەکێتی، ئاوا هاتووە:

"بۆ ئێستای کوردستان سەبارەت بەوەی کە نوێنەری چین‌و تاقمە نیشتمان پەروەرەکان (حزبەکانیان) پاش هەرەسهێنان بەوشێوەیەی کە ئەبو هەبن ئێستا نین لەبەرئەوە یەکگرتن ئەبێ لەچوارچێوەی (شێوەجەبهە)یەکدا بێت بەشێوەیەکی کاتی تا هەموو مەرجەکانی پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو دێنەدی. وە هەر لێرەوە هەموو ئەو رێکخراو و تەیارە سیاسیە نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێڕانەی هەن یەکگرن لەسەر بەرنامەیەکی سیاسی گونجاو لەگەڵ ئەم پلەیەی ئێستای شۆڕشدا." (*)

لە (١/ی ئەیلولی ١٩٧٦)یش، بەناوی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان- دەستەی دامەزرێنەر- وڵات-)وە، شەهید ئارام بەیاننامەیەك دەردەکات‌و تیایدا، دورونزیك باسی (البؤرة الثورية) ناکات‌و بێ تەمومژ لەسەر یەکێتی‌و پاشەڕۆژی یەکێتی‌و هێزە سیاسیەکانی ئەوسای ناو یەکێتی‌و دەرەوەی یەکێتی دەڵێ:

---

* کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان — عێراق/ بەشی یەکەم، هەڵبژاردەیەك لە نوسینەکانی شەهید ئارام. (ل ٤٢).

"یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان تێئەکۆشێ بۆ کۆکردنەوەو رێکخستنی هێزە شۆڕشگێڕە نیشتمان پەروەرە دیموکرات خوازەکان لەچوارچێوەی شێوە بەرەیەکی نیشتمانی دیموکراتیدا بەجۆرێك کە هەموو هێزو تەییارە پێشکەوتنخوازو نیشتمان پەروەرەکان خەباتیان بەتوندوتۆڵی یەکخەن. واتە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان حیزبێك نیەو جێی حزبی پێشڕەو ناگرێتەوە بەڵکو لەپێناوی یەکگرتنی هێزە نیشتمان پەروەرەکانو لەناوبردنی دەستەگەریو دووبەرەکیدا دروستبوەو ئەو هێزانەی تائێستا لەچوارچێوەکەیدا کۆبونەتەوە لەسەر ئەم بنچینەیە یەکیانگرتوە بۆ خەباتکردن بە رێبازێکی پێشکەوتنخوازانەی دژ بە ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپەرستیدا و شان بەشانی هێزە شۆڕشگێڕەکانی سەرانسەری عێراق لەپێناوی عێراقێکی دیموکراتیدا کە کوردستان لەچوارچێوەیدا بەئۆتۆنۆمی راستەقینە شادبێ. ئەمە ئەو تەنیا رێبازەیە کە لەگەڵ جەوهەری پێشکەوتنخوازانەی بزوتنەوەی گەلەکەماندا ئەگونجێو هەر هێزێك لەم رێبازە لابداتو یەکێتیی ریزەکانی گەل بشکێنێ زیان لە بزوتنەوەکە ئەداتو تاوانبار ئەبێت بەرامبەر بە گەلو بێگومان حوکمی گەلیش زۆر توندوتیژە بەرامبەر بەوانە." (*)

دوای ساڵێکیش لە بەرپابونی شۆڕشی نوێ، دوای ئەوەی ساڵێك تاقیکردنەوەو پێکەوە خەباتکردن لەگەڵ بزوتنەوەدا، تێدەپەڕیو لەوساڵەشدا، لە بادینان، ئاشکرا دەبێ برایم عەزۆ و هاورێکانی شەهید کراوون. (لە وڵاتیش کێشەمان کەم نەبوو لەگەڵیاندا) شەهید ئارام لە بەیاننامەی (شۆڕشی کوردستان سەرکەوتوانە ساڵێك لە تەمەنی تەواو ئەکات) جەخت دەکاتەوە کەوا:

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو. (ل ٤٩).

"لەماوەی ئەم ساڵەدا کە شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان بەسەرکردایەتی (ی.ن.ك) دەستی پێکردەوە سەرەڕای کورتی ماوەی هەڵچونی ئەم بزوتنەوە شۆڕشگێڕانەیەو توندوتیژی دوژمن، شۆڕش گەلێ سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوەو زۆریش تاقیکردنەوەی بەنرخی تازەی دەست گەلەکەمان خستووە." (*)

لە دوانوسراوی چاپکراوی خۆیدا، لەبابەتی (خەباتی ئاڵای شۆڕش) کە وەکو پێشەکییەك بۆ رۆژنامەی ئاڵای شۆڕش نوسیویەتی‌و ئۆرگانی خودی کۆمەڵەش بووە. وەکو نوسەر لەسەرەتاوە نوسیویەتی‌و سور بووە لەسەرئەوەی ناوی ئۆرگانی کۆمەڵە (ئاڵای سور)ەکەی پێشوو بێ، شەهید ئارام وای نەکردووە، ناوی ئۆرگانەکەی، لەبەر هەلومەرجی شۆڕش‌و بەرەنگاری، ناوە (ئاڵای شۆڕش) گەر وەکو نوسەر دەبێژێ، باوەڕی بە (البؤرة الثورية) هەبوایە، هەڵبەتە، ئۆرگانەکەشی ناودەنایەوە (ئاڵای سوور) بەڵام لەبەرئەوەی ئەندێشەی وا، لە کۆمیتەی هەرێمەکاندا نەبوو، بەڵکو ئەندێشەی ماوتسیتۆنگیش لە ئەدەبیاتی کۆمەڵە لابرابوو، بۆیە ناوەکەشی نراوە (ئاڵای شۆڕش) لە ژمارە یەکی (ئاڵای شۆڕش)یشدا یەك جاریش ناوی ماو، نەهاتووە. ئا لەم ئۆرگانەشدا، شەهید ئارام‌و سیاسەتی کۆمیتەی هەرێمەکان بەمشێوەیەی خوارەوە، پێچەوانەی بۆچونەکانی نوسەر، ئاوەها رۆشنە:

" (ئاڵای شۆڕش) لەپێناوی بەهێزکردنی (ی.ن.ك) تێدەکۆشێ‌و هەوڵی بێ سنور ئەدات بۆ چەسپاندنی خەباتی رێکخراوە شۆڕشگێڕە پێشکەوتنخوازەکانی کوردستان‌و دەرخستنی بیری چەوتی تاکە حیزب‌و راهێنانی جەماوەری گەل بەدروستی بەرەی یەکگرتوو وە هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی (ی.ن.ك) بەرەو بەرەی راستەقینەی شۆڕشگێڕ. لەهەمان کاتیشدا دەستنیشانکردنی کەموکوڕیەکانی

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو. (ل ٦٠).

(ی.ن.ك) بەنیازی گەشەپێدانیو زیاتر پتەوکردنی ریزەکانی لەخەباتدا دژی سوڵتەی فاشیستی بەعسو دژی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپەرستی ناوخۆ و دەرەوە." (*)

* هەمان سەرچاوەی پێشوو. (ل ٦٧).

## ٧

# قوڵبونەوەی ناکۆکیەکان

ئێستا، کە ئەو هەموو بەڵگە نوسینانەمان هێنایەوە، باوەڕناکەم قسەیەکی بۆ مابێتەوە بە ئالآهەڵگری (البؤرة الثورية)و دژایەتی یەکخستنی هێزە کوردستانیەکان، تاوانبارمان بکات.

دێمەوە سەر پەیوەندی کۆمەڵە، یەکێتی، بزوتنەوەو کۆمەڵە. من لەم باسەداو پەیوەند بە پەیوەندیەکانی کۆمەڵەو بزوتنەوە، دەتوانم بڵێم: قسەکانی نوسەر کەمتر رقی تیایە. بەڵام لێکدانەوەی تیا نییە.

نوسەر، هاتووە هەندێك لە مشتومڕەکانی ئەوکاتەی (ئەویش هەندێك) کە لە ریزەکانی کۆمەڵەدا هەبون، دوای (٣٥) ساڵ تێپەڕبون بەسەر روداوەکاندا، دەکاتە بنەمای بۆچونەکانی. با کورتە هەوڵێك بدەین‌و دۆخی ئەوکاتەو باوەڕی ئایدیۆلۆژی ناو یەکێتی‌و کۆمەڵەو بزوتنەوە، شەن‌وکەو بکەین، هەتا رۆشنی بکەینەوە بۆچی، نوسەر لێکدانەوەی بۆ ئەو پەیوەندیانە نییە.

کۆمەڵە، رێکخراوێکی مارکسیستی لەژێر کاریگەری چین‌و سەرۆکی چیندا بووە. (٥) ساڵ ئەم رێکخراوە، بەشێوەیەکی گشتی ئەندامانی بەو رێبازە پەروەردەی کردووە. لەو ماوەیەدا، بەزۆری، ئەندێشەی (ماوتسیتۆنگ) کراوەتە بنەمای پەروەردەو سیاسەتەکانی. ئەویش بەشێوەیەك، کۆمەڵە، بەحوکمی خەباتی نهێنی، سەرکردایەتیەکەی نەك چەند خولێکی پەروەردەی کادران‌و ئۆرگانەکانی نەکردبوەوە، بەڵکو خودی سەرکردایەتیەکەش، خولێکی کادرانیان،

لە هیچ وڵاتێکدا نەدیبوو. تەنانەت سەردانی یەك وڵاتی ئەوکاتەی چین‌و پرۆچینیان نەکردبوو (چین، ئەلبانیاو کۆریای باکور).

لەو ماوەیەدا، کۆمەڵە، دوو ژمارە ئۆرگانی دەرکرد بەناوی (ئاڵای سوور) ناوەکەشی لە ناوی گۆڤارێکی چینی وەرگیراوە. ئەو دوو ژمارەیە، هێندە کەم چاپکراوون، ئێستاش نوسخەیەکیان نادۆزرێتەوە. لەوباوەڕەشدام نیوەی ئەندامانی کۆمەڵەی ئەوسا، بەو ژمارە کەمەی دەریشچوو، دوو ژمارەکەیان نەدیووە. کەم کەسیش بابەتەکانی لەبیرماوون.

کاتێك، ڕێکەوتنامەی جەزائیر دەسەپێندرێ، کۆمەڵە، بەو تواناو بەو ئاستەو بەو هەموو کێشە ناوخۆییەی، دەکەوێتە ژێر باری بەرپرسیارێتیەکی نەتەوەیی گەورەوە. ئەمە یەکەمین بارودۆخی بابەتی بوو، کە دەرەتان بۆ کۆمەڵە دەڕەخسێ بڕیاری ئاشکرا بدات. لەوەوبەر، هەموو چالاکیەکانی کۆمەڵە، نهێنی بون.

لە مێژووی تەواوی حیزبەکاندا، چەپ‌و ڕاست، باری بابەتی دەرفەتی مێژوویی لەبەردەم حیزبەکاندا، دەڕەخسێنێ. کە ڕەخساش، تواناى خۆیی حیزبەکە، ئاست‌و ئەزمونی رابەرەکەی‌و سەرکردایەتیەکەی، ئامادەکاریەکانی، پێشبینیەکانی، تواناو پەروەردەی ریزەکانی، چەند بێ، بەوپێیەو بەو توانایە، لەمەحەك دەدرێ.

ئەو بارە بابەتییە، لەدوای ڕێکەوتنامەی جەزائیرەوە (ئازاری ١٩٧٥) پێش بڵاوپێکردنی شۆڕشەکە، لەبەردەم سەرکردایەتی کۆمەڵە، هەر لەناو شۆڕشەکەدا، ڕەخسا. سەرکردایەتی کۆمەڵە نەیقۆزتەوە. ئەمە لەکاتێکدا ئەوکاتە، دەکرا، بەئاسانی، لایەنی کەم دوو تا سێ هەزار (یان کەمتر) پێشمەرگەو فەرماندەی هەڵبژاردە، بۆ بەرەنگاری، ڕێکبخرێن. بەڵام

سەرکردایەتی کۆمەڵە، ئەوکاتە وای لێکدایەوە، هەلەکە زوو لەدەستناچێ‌و دوای گەڕانەوە بۆ شارەکان، لە هەلێکی گونجاودا، بڕیاری شۆڕش دەدات.

کە گەڕانەوە شارەکان، راستە هەلی بابەتی، هێشتا لەبار بوو. کۆمەڵەش دەیتوانی خۆی رێکبخاتەوەو دوای دڵنیابون لە پەیوەندی پێوەکردنی مام جەلال‌و ئامادەکاری ناوخۆ، دەست بە شۆڕش بکات. بەڵام بەداخەوە، نەك ئەمە نەکرا، کە بە دڵ‌و گیان، هاوڕێیانی کۆمەڵە ئامادەی جێبەجێکردنی ئەو ستراتیژە بون، بەڵکو، ئەوکاتەش، ئەو بەعسەی ئاشکرا سیاسەتی بەرەچەڵەك چونە خوارەوەی کوردی هەبوو:

- سەرکردایەتی کۆمەڵە، لەبەر باوەڕیان بە ئایدیۆلۆژیەتی تیۆری سێجیهانی چینی، ئیمپریالیزمیان بە ناکۆکی سەرەکی دەزانی‌و بەعسیان بە ناکۆکی سەرەکی نەدەزانی‌و دەچون بەگژ ریڤیژنیزمی جیهانیدا.
- رەخنەگرتن لە خۆیەکالآنەکردنەوەی لەسەر کوردستانێتی‌و عێراقی.
- رەخنەگرتن لە پاشکۆبونی کۆمەڵە بۆ مام جەلال‌و کۆمەڵە بە جەلالیی زانین.

ئەو بنچینانە، لەناو کۆمەڵەدا رەنگیدایەوەو ناکۆکیەکانی لای هەندێك هاوڕێ گەیاندە بنبەست. لەمەشەوە رێکخراوی (رەنجبەران) دروستبون‌و بڵاوکراوەیەکیان بەناوی رەنجبەران دەرکرد. ئەمەش، کێشەی لەناو کۆمەڵەو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا خولقاند. سەرەنجام، هەندێك لە هاوڕێیانی کۆمەڵە مەیلیان بۆ لای ئەم رێکخراوە پەیداکرد. بەتایبەتی زانکۆی سلێمانی، لە کەرکوك‌و هەڵەبجەش.

لەسەرەتای چونەدەرەوەی مەفرەزەکاندا، برایم خەلیل کە وەك سکرتێری رێکخراوەکە خۆی دەناساند، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی چونە ناوچەی هەڵەبجە.

برایم حەسەن کە وەك جێگری ئەو بوو، لەسەردانێکی برایم خەلیل، لە گەڕانەوەدا لە سەیتەرەی هەڵەبجە گیرا. دەستبەجێ روخاو، زمانی لە هەموو ئەندامانی خۆیان، بەشێکی یەکێتی، کۆمەڵە، پاسۆك‌و (وحدة القاعدة)ش دابو. لەناو گیراوەکان: ١- شێخ کەمال. ٢- عەبدوڵڵا تۆفیق. ٣- مامۆستا عادل. ٤- شەهید ئازادی مەلا. ٥- لەتیفی شێخ عومەر. ٦- شەهید ئازاد محەمەد مستەفا. ٧- فەرهاد عەبدولقادر. ٨- رەفیقی حاجی تۆفیق. ٩- فەرەیدون قادر. ١٠- فەرهاد سابیر. ١١- حەمەی حەمەکەریم خەلیفە. ١٢- سەمەدی مەلا ئەحمەد. ١٣- شاهۆ کەریم. ١٤- عەباس (پورزای برایم حەسەن). ١٥- شازاد کەریم. ١٦- کاوەی حەمەسالح. ١٧- هێرش محەرەم. ١٨- ئەحمەد کاکاو. ١٩- نەژاد. ٢٠- سیروان. ٢١- عادل حسێن. ٢٢- سەرداری خەیات. ٢٣- جەباری خەیات. ٢٤- حەمیدی موزەمید. (٢٥- ستار. ٢٦- عوسمان. ٢٧- ئیسماعیل. ٢٨- سابیر کاکە. ٢٩- جومعە) ئەمانە کەرکوکین. ٣٠- سەلاحە سور. ٣١- سەلاح بالابەرز. ٣٢- ئەحمەد مەولود. ٣٣- سەلاح قادر. ٣٤- عەلی (پورزای برایم حەسەن). (٣٥- عەدالەت. ٣٦- فایەق. ٣٧- ئەحمەد خدر. ٣٨- عەبدوڵڵای حاجی تۆفیق)یش سەرەنجامی خیانەتی برایم حەسەن لەسێدارەدران.

ئەم روداوانە تێکڕا، کاریگەری نالەباریان جێهێشت‌و بەشێکی زۆر لە کادرەکانی سلێمانی‌و شوێنانی تریش، وازیان هێنا. هەروەها، قوڵبونەوەی کێشەکانی ناو سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵەش، کێشەی تیژی سێجیهان‌و ناکۆکی سەرەکی‌و لاوەکی بوو. لە دوا چاوپێکەوتنی کاك (ئاسۆی شێخ نوری)دا، ئاماژەی رۆشنی بەم کێشانە کردووە، گەرچی خۆی لە وردەکاریەکەی بواردووە. کێشەکان بەمشێوەیەی خوارەوە دەگێڕێتەوە:

" ئا لەوکاتانەدا، کێشەیەك روویدا، من وردەکاریی کێشەکە نازانمو ئێستاش بەتەواوی لەبیرم نییە، بەڵام لەئەنجامی دروستبوونی ئەو کێشەیە کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوەندی کۆمەڵە بڕیارێکی دەرکرد کە خۆی هەڵوەشێنێتەوە، کە ئەوکاتە پێکهاتبوو لە شەهید خالە شیهاب، فەرەیدون عەبدولقادر، ئاوات عەبدولغەفور، حەمەی میرزا سەعید، شەهید جەعفەر، دەسەلاتەکانی خۆشی بداتە کۆمیتەی ئەستێرەی سوور، بەو حوکمە کۆمیتەکە بوو بە کۆمیتەی سەرکردایەتی." (*)

لەم کێشمەکێشمەدا، مام جەلال کەوتبووە خۆیو، دیارە گفتوگۆی بێئەنجام لەسەر تێزی سێجیهانو ئایە رژێمی عێراقی شۆڤێنی ناکۆکی سەرەکییە یان لاوەکییە؟ ئایە سۆڤیەت سۆسیال- ئیمپریالیزمە، یان نەء؟ خۆی سەرقاڵ نەکردبوو. مام بەئەزمونو دووربینی خۆی، لەو راستییە باش گەیشتبوو کە ئەو بارودۆخە بابەتیەی بەهۆی نەمانی شۆڕشی ئەیلولەوە رەخساوە، ئەگەر زوو فریای نەکەوێ، بەعس پیلانی هەیە، بارە بابەتیەکەش لەباردەبات، وادیارە، زانیاری باشیشی لەسەر ئایدیاو بۆچونەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵەو مشتومڕەکانیش هەبووە. هەڵبەتە، سەرکردایەتی کۆمەڵە، نزیکی خۆیشی نەبون هەتا بۆیان رۆشنبکاتەوە، کە تێزی سێجیهانو هەڵسەنگاندنەکەیان هەڵەیە، بۆیە، بەدیار تێزی بێپێزی سێجیهانەوە دانەنیشتو بیروبۆچونەکانی ناو وڵاتو کاریگەریەکانی هەلومەرجەکەی لە نامیلکەی (الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟) دا، شیکردەوە. لەسەر ئەو بیروڕایانەی دەگوترا بەعس ناکۆکی سەرەکی نییە، لەو نامیلکەیەدا، مام جەلال دەڵێ:

---

* بڕوانە (ل ١٥) ی رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)- ساڵی بیستەم – ژمارە (٥٦٥٣) ١٥/١٢/٢٠١١.

"بەلأم وردەبۆرژوا —بەشێوەیەکی گشتی— پێناسەی نالەبار جیایدەکاتەوە، وەکو؛ رارایی، هەڵچونی شۆڕشگێڕانە، پاشان دامرکان، پاشەکشەو خەباتی وەرزی..

هەروەها.. ئەمانە توێژەکانیان هەرەشەی سلبیو بۆ دواوە پاشەکشە دەکەنو لەبەر چەندین نەخۆشی وەکو؛ هەلپەرستی، خۆیەتی، تاکرەوایەتی، خۆپەسەندیو چەندین سیفەتی زیانبەخشی تر بە خەبات، واز لە خەباتی سەختی شۆڕشگێڕانە دێنن." (*)

کە مام جەلالیش گەڕایەوە کوردستان، باش باشم بیرە کە چەند جارێك لە کۆبونەوەداو بەتایبەتیش قسەی لەسەر دۆخی هەرەس دەکردو دەیووت: ئامادەبوم بێمەوە، کاکە شیهابو عەلی عەسکەری پەلەیان لە گەڕانەوە کرد. لەسەر ناکۆکی سەرەکیش قسەی دەکردو دەیووت، هەڵەیەکی ستراتیژی گەورە بوو، بەعس بە ناکۆکی سەرەکی نەزانرێ.(+)

لەو بارە بابەتیەی ئەو رۆژگارە، کۆمەڵە لەناو وڵاتدا، وەکو هێزێکی رادیکاڵ، مەخابن لەبەر کێشەکانی نەیدەتوانی رۆڵی خۆیی خۆی بگێڕێو بەرە بەرە، بارە بابەتیو بارە خۆییەکە، بەکردەوە موتوربە بکات. لەوکاتەدا، بەسەرکردایەتی کۆمەڵە، لەبەر بیری جیاوازیان، نەکرا.

---

* الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟. من منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني. ١٩٧٥ ص(٤)

+ لە (٢٠١١/١٢/٢٤)دا، بەئامادەبونی زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، لەوانە (کۆسرەت رەسول، عیماد ئەحمەد، عومەر فەتاح، حاکم قادر، ئازاد جندیانی، د.نەجمەدین، شۆڕش ئیسماعیل) لە مام جەلالم پرسی: ئایە وردەکاریەکانی سیاسەتی کۆمەڵەت، دوای (١٩٧٥) لەسەر ناکۆکی سەرەکیو لاوەکیو تێزی سێجیهان بیستبوو. لەوەلأمدا گوتی: وردەکاریەکان نەخێر. بەلأم کۆمەڵە هەڵەیەکی قورسیان کرد کە رژێمی بەعسیان بە ناکۆکی پلە دوو دەزانی.

کاتێك، مام جەلال رچەی شکاندو لەو چوارچێوە تەسکەی مشتومڕەکاندا، گیری نەخوارد، ئەمەیان بڕیارێکی مێژوویی بوو. بە رای من، لە مێژووی سیاسی مام جەلالدا، دوو جار بەرپرسیارێتی شۆڕش بەرپاکردن هەڵدەگرێ:

یەکەمیان: یەکێك بووە لە کاریگەرەکانی بەرپاکردنی شۆڕشی ئەیلول، کە من پێموایە، سەرەتای شەستەکان، باری بابەتی عێراق، بۆ شۆڕشی ئەیلول، نەخەملیبوو. بەڵام مام جەلال یەکێك بوو لەو کەسانەی پەلەی لە قبولکردنی بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕش، کردبوو .

دووەمیان: پەلەکردنی مام جەلال بوو، لەیەکەمین ساڵڕۆژی یەکێتیدا، شۆڕشی راگەیاند.

پەلەکردنی شۆڕشی ئەیلول، زەرەری زۆر گەیاند. بەتایبەتی زیانی بۆ ژیانی حیزبایەتیو بیری چەپو خەباتی دیموکراسی سەرانسەری عێراق هەبوو.

پەلەکردنی شۆڕشی نوێ، سودی بۆ بەهێزکردنی گیانی حیزبایەتیو ڕێبازی چەپو پەکخستنی پیلانە شۆڤێنیەکان هەبوو.

لە ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو لەناو سروستیشدا، ژیان بە یەك پێوەر ناپیوَرێ. وەکو پەلەکردن. پەلەکردنی وا هەیە زیانی هەیە، پەلەکردنی واش هەیە، سودبەخشە. ئەوە هەلومەرجو ژینگەیە، دەتوانێ لەرووی بابەتیەوە، بڕیار دیاریی بکات. بڕیار ناتوانێ، باری بابەتی دیاری بکات. ئەمە رەنگدانەوەی پەیوەندی ئۆرگانیکی باری بابەتیو دەنگدانەوەی لۆژیکی باری خۆییە. پەلەکردنو نەکردن، توندیو نەرمی، بەشێکی ناو ئەم پرۆسە گشتیو تایبەتییە، کە جاری وا هەیە، بە تێگەیشتنی زانستیانە، بڕیاردەدرێ. جاری واش هەیە، لەچاوتروکانێکدا، دەبێ بڕیار بدرێ. هەر خودی مرۆڤ، پێڵوی چاوی وا

پێکهاتووه، لەچاوتروکاندا، بەرگری لە چاو بکات. ئەگینا، هەرزوو چاو دوچاری جۆرەها زیان دەبێت.

لە سیاسەتو بەتایبەتی ژیانی عەسکەریشدا، هەروایە. پێچەوانەی ژیانی ئاسایی. لەشەڕی وا هەیە، سەرەڕای ئەوەی هێزی کەمیش بن، گەر گەمارۆدرابنو توانای دەربازبونی نەمێنێ، چاوەڕێی هێرشی دوژمن نەکرێ باشە. هێرش بۆ دوژمن ببرێ باشترە.

دوای (١٩٧٥) کوتومت وابوو، دوژمن گەمارۆی گەلەکەمانی دابوو، دەیویست، بەزوترین کات، هێرشی تەفروتوناکردنی بەرێتەسەر. بەڵام بەدامەزراندنی یەکێتی، بەنۆرەی خۆی، زوو شۆڕشی کردو هێرشی بردو گەمارۆکەی، هیچ نەبێ، لەڕووی سیاسیو سایکۆلۆژیەوە، شکاند. ئەو بڕیارە، هەروەکو بزوتنی پێڵوی چاو وا بووە، بۆ پاراستنی چاو، لە میکرۆب.

مام جەلال لەدەرەوەی وڵات، رۆڵی سەرەکی لەم هێرشەدا گێڕا. بێگومان دەستەی دامەزرێنەریش، هەریەکەیان بەپێی تواناو تواناشیان جیاواز بوو، لە راپەڕاندنی ئەرکەکاندا بەشێکیان درێغیان نەکرد. بەڵام ئەرکی هەرە سەنگینو چارەنوسساز، سەرکردایەتی ناو وڵات رایدەپەڕاند. چونکە، لەدەرەوەی وڵاتەوە، هەم هەڵمەتەکەی شەهید برایم عەزۆ بەکارەسات کۆتایی پێهێنرا؛ یەکەمین هەڵمەتیش بەسەرکردایەتی کاك نەوشیروان، سەرنەکەوت. ئەمە جگەلەوەی، جگە لە مام جەلالو کاك نەوشیروان، هەتا روخاندنی شا، یەك دامەزرێنەر ئامادە نەبوو بێتەوە وڵاتو ببێتە پیشمەرگە.

ئەگەر.. سەرکردایەتی ناو وڵاتو پێکەوەنانی مەفرەزەکان نەبونایە، بەرە بەرە شۆڕش لەناو وڵاتدا، پەرەی نەدەسەندو لەدەرەوەی وڵاتیش نائومێد دەبون.

## ٨

# بزوتنەوەو کۆمەڵەو دەرەبەگ

ئەوەی پێشتر لەسەر دامەزراندنو قۆناغەکانی کۆمەڵەو بەسەرهاتەکانی گێڕامانەوە، بێگومان، کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی کۆمیتەی هەرێمەکانیش، بەشێوەیەك لەشێوەکان هەبووە. ناکرێ، رێکخراوێك دوای (٥) ساڵ دامەزراندن، بەئەدەبیاتێکی کەمو پاشکۆیەکی سەرومڕی سیاسەتی چینو بۆ رۆژێکیش هاورێکانی ئازاد نەبوبن، پێکەوە کاریان نەکردبێ، لەبۆتەی خەباتی پراکتیکیدا خۆشەویستیو چارەنوسیان نەتوانبێتەوە، رێکخراوی ئاوا، لەخەباتی ژێرزەمینیدا، ناتوانێ کادرو ئۆرگانو سەرکردایەتی شایستە بۆ خەباتی ململانێی چینایەتیو نەتەوایەتیو حیزبایەتی پەروەردە بکات، نەخوازەڵڵا بۆ شۆڕشی درێژخایەنی چەکداریش.

کۆمەڵە، بەو پەروەردە حیزبیەی، بەو ئاستە گۆشکراوە ئایدیۆلۆژیەی،و بەو ئەدەبیاتە کەمو ئاستە دیاریکراوەی، بەو هەموو کێشەو بێشەیەی رێکخراوەیی، ئایدیۆلۆژی، ململانێی نێوان کادرو سەرکردایەتیەکەی، لەو رۆژگارەدا کە بەر جەزرەبەش کەوت، هەڵبەتە، کاتێك سەرکردایەتیەکەی دەکەوێتە دەستی سەرکردایەتیەکی نوێی ئەو رۆژگارە، دیسان بەهەندێك ململانێیەوە، بە نەبونیو تواناو پشتو پەناوە، بێگومان رێکخراوێکی ئاواو سەرکردایەتیەکەی، ناشێ چاوەڕوانی سەرکەوتنی گەورەی لێ بکرێ. ناشکرێ هەڵەکانی ئەوسای کۆمەڵەو

کۆمیتەی هەرێمەکان، بە زەرەبینی رۆژگاری جیهانگیری قەبە بکرێ. ئەو رۆژگارە ژینگەی سیاسی خۆی هەبووە، ئەم رۆژگارەش فەزای سیاسی خۆی هەیە.

لەو راستیانەی کۆمەڵەوە، بگوازینەوە بۆ جیهانی بزوتنەوە. دیارە، ئەم بزوتنەوەیەش، هەڵسەنگاندنی بابەتی پێویستە. ناکرێ، وەکو نوسەر حوکم لەسەر هەلومەرجی ئەوساو ململانێکانی کۆمەڵەو بزوتنەوە، لەروانگەی ئەمڕۆوە، بدەین. نوسەر لە لاپەڕە (١٠٨)دا دەڵێ، کۆمیتەی هەرێمەکان رایان وابوو:

" کە نابێ هاوکاری لەگەڵ (عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، د.خالید، رەسول مامەندو کەسانی تری ناسراوی شۆڕشی ئەیلولدا بگرن. بڕوایان وابوو، کە دەبێ لەگەڵ گەشەکردنی هێزی پێشمەرگەداو لە بەردەوامی خەباتی چەکداری دەست بەکار بن بۆ لێدانی دەرەبەگایەتیو دابەشکردنی زەویوزار. "

جارێ، سەبارەت بەوەی وتبێتمان نابێ هاوکاریان لەگەڵا بکەین، هەر زۆر دوورە لەراستیەوە. دوریشە لە هەزاران بەڵگەی پێکەوە خەباتکردنی کۆمەڵەو یەکێتی، کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان. بەڵکو پێکەوە شەهیدبەخشین.. شەڕ، هەڵوێستی هاوبەش، هاوسەنگەری، برایەتی، دامەزراندنی سەرکردایەتی ناو وڵات (پێش گەڕانەوەی مام جەلال) دەرکردنی راگەیاندنی هاوبەش، تاڵیو سوێری پێکەوە چەشتن؛ هەتا دەگاتە ئەوەی پلەوپایەکانی یەکێتیش بەسەر هەردوولادا، بەگونجاوی دابەشکران. بەڵام..

ناشکرێ وابزانرێ، بزوتنەوەی سۆسیالیست- دیموکراتی کوردستان، حیزبێکی تۆکمەو خاوەن بەرنامەو ستراتیژی پەسەندکراو بون. خاوەن سەرکردایەتی هەڵبژێردراو بوین. خۆزگە، ئەوانیشو ئێمەش، هەلی سیاسی باشمان هەبوایە،

پێش شۆڕش، کۆنفرانسی حیزبی خۆمان ببەستایەو دۆخی سیاسیمان هەمەلایەنە هەڵسەنگاندایە، پاشان، چۆنیەتی ڕێکخستنی پەیوەندی کۆمەڵەو بزوتنەوە، ئەرکو مافمان لەناو یەکێتیش، بە تێروتەسەل دیاریکردبا. بەڵام لەسایەی ڕژێمێکی فاشیستدا، کوا هەلی سیاسی وا دەبێ! کە واشبێ؛ بزوتنەوەیەکی تازە دامەزراو، یەکسەر ڕوویەڕووی قورسترین ئەرکی مێژوویی شۆڕش بەرپاکردن دەبێتەوە؛ هاوشانیش کۆمەڵە، بەتایبەتمەندێتی خۆیو کێشەکانیشی، بەهەمان شێوە، هەردوولاش، دەبنە ئەندام لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کە یەکێتیش، تازە دادەمەزرێ. بەڵکو بەتایبەتمەندێتیەکی تازەشەوە.

بەمەش:

- کۆمەڵە دوای پێنج ساڵ لە دامەزراندن، هیچ کۆنفرانسێکی نەبەستبوو. بەر جەزرەبە کەوتبوو. کێشەو بێشەی ناوخۆیشی هەبوو. یەك دانیشتنیشی لەگەڵ سەرکردایەتی بزوتنەوە، بەنهێنیش نەکردبوو.
- بزوتنەوەی سۆسیالیست — دیموکراتی کوردستان، تەنها دڵسۆزیو پەرۆشیو متمانە لە (١٩٧٥) کۆی کردونەتەوەو پاشان، لەوپەڕی نهێنیدا، بزوتنەوەیەك رادەگەیەنن.
- یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان؛ هەلومەرجی دژواری چارەنوسساز، بەبێ بەستنی کۆنفرانس، بەبێ کۆبونەوەی فراوان، بەناچاری دادەمەزرێنرێو بەناچاریش، دوای ساڵێك شۆڕش رادەگەیەنێ.

دەی جێی خۆیەتی بپرسین: ئایە دەشێ، دوو ڕێکخراوی ئایدیۆلۆژیەت جیاواز، دوو پێکهاتەی سەرکردایەتی جیاواز، بەڵکو دوو جیهانبینی جیاوازیشمان لەسەر دونیاو ناوچەکەو چۆنیەتی شۆڕشکردن هەبوو، چۆن دەشێ

بێ کێشەو ناکۆکی بین؟ بەتایبەتی، مام جەلالو چەند کەسێکی بەتوانای دەستەی دامەزرێنەریش، کە کاریگەریان لەسەر روداوەکان هەبوو، دەیانتوانی لەگەڵ کۆمەڵەو بزوتنەوە، دڵسۆزانە قسە بکەنو قسەکانیشیان کاریگەر بێ، ئەمانیش، دوای دوو ساڵ لە دامەزراندنی یەکێتیو ساڵێك لە بەرپابونی شۆڕش، گەڕانەوە.

دوورونزیکیش، قسە لەسەر ئەوە نەبووە کۆمەڵە لەگەڵ سەرکردایەتی بزوتنەوەدا هاوکاری نەکات. ئەمەیان وا نییە. گرفتەکە لەوەدا بوو، کە پێش بەرپابونی شۆڕش، کۆمەڵەو بزوتنەوە یەکترمان نەبینی. هەردوولاش دەبوو بدەینە شاخ!

چەند هەڵەیە، یەکەم؛ نوسەر بە زانیاریەکی کەمی وردەکاریەکانی ئەو سەردەمە قسەدەکات. دووەمیش؛ چەند نەشیاوە، بە چاویلکەی ئێستا، ئەو هەلومەرجە دەبینێ. لەوانەش خراپتر، تەواوی قسەکانی، قسەکانی خۆیەتیو بەس. بەڵگەیەکی لەسەر ئەو قسانەی نییە. خۆیشی، بەم هەموو رقەی کتێبەکەی نوسیووە، بێگومان گێڕانەوەکانی ئاوا دەردەچن. بۆ مێژووش دەیڵێم:

پێش ئەوەی بچینە دەرەوە، بۆئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان توخنی شۆڕش نەکەوێ، نەکا لەسەر ژیانی خاڵە شیهابو هاوڕێکانی مەترسیدار بێ، نوسەر، لەو کەسانە بوو، دژی هەموو جۆرە قبولکردنێکی سەرکردایەتی بزوتنەوە بوو (ناوی کەسیان ناهێنم کە چەند رقی لێیانبوو) هەر نوسەریش بوو دەیگوت: ئەوانو مام جەلال، بەسەر کۆمەڵەدا زاڵدەبن. ئەوە شەهید ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکان نەبوو. شەهید ئارام، سەرکردەیەکی وا نەبوو، لە رێکخراوەکەیو کاریگەری خۆیو ئایندەی روداوەکان، بترسێ.

بۆئەوەی ڕاستیەکان وردتریش باسبکەم، بەڵێ، کۆمەڵەو بزوتنەوە لەسەر چۆنیەتی شۆڕشکردن، پێکهاتەی شۆڕشەکە، سیاسەتی شۆڕش بەرامبەر پارتی، حکومەت، لەناو یەکێتی، ناکۆکیمان هەبوو. بەڵام نەگەیشتبووە لێکترازان و پێکەوە خەبات هەڵنەکردن.

کاتێك مام جەلالیش گەڕایەوە، لە یەکەمین کۆبونەوەی دامەزراندنی سەرکردایەتی لە (دەستەی دامەزرێنەرو سەرکردایەتی ناو وڵات — ئەیلولی ١٩٧٧) هەموو کێشەکانمان باسکرد. مشتومڕێکی توندیش لەنێوان کاك نەوشیروان و شەهید عەلی عەسکەری رویدا. بەڵام هەر نەگەیشتە بنبەست. بەڵکو نێوانمان هەتاڕادەیەك، لەدوای تەواوبونی کۆبونەوەکەو لەبەر کاریگەری مام جەلال، باشتریش بوو.

لەو پلە دابەشکردنانەدا، هەڤاڵانی بزوتنەوە، رازیبوون. ئێمەش هەروا. تەنها لە دابەشکردنی چەکەکاندا، کۆمەڵە رەخنەی هەبوو. بەشی زۆری چەکەکان درایە بزوتنەوە. (*) بۆ نموونە:

شەهید سەعدی گچکەو سەید کاکەو من، پێکەوە چوینە پارێزگای هەولێر، هەرسێکیشمان ئەندامی سەرکردایەتی بوین. ئەوان بزوتنەوەو من کۆمەڵە. تێکڕا هەردوکیان (٥٧) چەکیان بەرکەوت. من تەنها (٧) چەك. هەروەها باقی هەڤاڵانی بەرپرسی تریش جیاوازیەکانیان زەق بون. ئەمە نیگەرانی لا دروستکردین. بەڵام نەشبووە مایەی هەڵوێستوەرگرتن. ئەوکاتە، پاساوی مام جەلال ئەوەبوو، کە کۆمەڵە، بۆ یەکێتی دەستەبەرە. بەڵام لەناو بزوتنەوە، کێشەی زۆر هەیە. دوو پێکهاتەی جیاوازن و نابێ وا هەست بکەن، لەنێوان کۆمەڵەو کۆنە جەلالیەکان و.. ئەوانەی مەلایی و لەناو بزوتنەوە بون، من

---

* لەو قۆناغەدا وابوو. کەچی بەداخەوە هەندێك لە برایانی بزوتنەوە، ئێستا بەپێچەوانە، باسی دەکەن.

پشتیوانی ئەوان ناکەم. هەرچی چۆنێك بووە، ئەمەشمان قوت دا. کەوتیشینە ڕاپەڕاندنی ئەرکە هاوبەشەکان. زۆری نەخایاند، ناکۆکی نێوان کۆمەڵەو بزوتنەوە خاو بوەوە، بەڵام ناکۆکی نێوان بزوتنەوە خۆی قوڵ بوو.. بەڵکو گەیشتیشە بنبەست.

ئەم گەیشتنە بنبەستەی ناکۆکیەکان، وەنەبێ بەهۆی ڕوداوێکی گەورەی ناوچەکەوە، یان لەبەر دوو جیهانبینی جیاوازی ناو بزوتنەوە، یاخود، دوای کارەساتی هەکاری، ڕویدابێ، نەخێر. قوڵبونەوەی ناکۆکیەکان، هۆی بابەتی‌و هۆکاری خۆیی هەبوو. کورتیەکەی:

هۆیە بابەتیەکە، بەخوێندنەوەی من، دەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجەکەو چۆنیەتی سەرهەڵدانی بزوتنەوە، وەکو ڕەوتێکی سیاسی سەرهەڵداوی ئەو بارودۆخەی دوای ڕێکەوتنامەی جەزائیر (١٩٧٥). زۆربەی هەرەزۆری کادرە دامەزرێنەرەکانی بزوتنەوە، لەوانە بون، کە لەناو پارتی دیموکراتی کوردستاندا، باڵادەست بون. (شەهید سالح یوسفی، شەهید ڕەسول مامەند، شەهید عەلی هەژار، شەهید کاردۆ گەلاڵی، جەمال خۆشناو، ..تاد) ئەم شەهیدانە، بەدرێژایی تەمەنی سیاسیان، لەسەر ڕێبازی (پارتی — بارزانی) خەباتیان کردووە. بزوتنەوەکەش، ئەمان، بەزۆری دامەزرێنەری بون. هەرچی شەهیدان (عەلی عەسکەری‌و د.خالید)و (عومەر دەبابە)ی خوالێخۆشبووە، ئەمانە پەروەردەی فێرگەی جیابونەوەی پارتی بوون (پارتی- جەلالی). کاتێك ڕێکەوتنامەی جەزائیر سەپێنرا، هەوڵێك لەلایەن ئەم بەڕێزانەوە بۆ بەرەنگاری درا، بەڵام هەرزوو بڵاویان کردەوە کە (بارزانی) هەڕەشەی کردووە گەر هەر کەس‌و لایەك درێژە بە شۆڕش بدات، خۆم دێمە سەریان. ئەم هەڕەشەیە، ئایە وایە یان وا نییە؟ هەتا ئێستا ڕاستی‌و ناڕاستی پروپاگەندەکە، یان هەڕەشەکردنەکە، ساغ نەکراوەتەوە. بەڵام بەهۆی پاساوی ئەم هەڕەشەیەوە، ئەم ڕەوتەش، یان ئەم

بەڕێزانەش، وەکو سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەبێ کۆبونەوەیەکی فراوان، بەبێ لێکدانەوەیەکی هەمەلایەنە، بەبێ پەیوەندیکردن بە مام جەلالو زانینی دوابڕیاری مام جەلال، تەنانەت کۆبونەوەیەکی ئەوتۆ لەنێوان سەرکردایەتی کۆمەڵەو سەرکردایەتی ئەم رەوتە، نەکراوەو دۆخەکە لێکنەدراوەتەوە، هەرلایەك بەپاساوێك بەرەنگاریان نەکرد.

بەش بەحاڵی خۆم، هۆی هەرە بنەڕەتی بەرەنگارینەکردنی ئەم رەوتە، بۆ ئەزمونی سیاسیو کاریگەری سایکۆلۆژی جودای سەرکردە جیاوازەکانی ئەم رەوتە دەگێڕمەوە.

هەرچی، ئەو سەرکردانەیە ‌کە قاڵو قوڵبوی سیاسەتو کولتوری سیاسی (پارتی- بارزانی) بون، روداوی هەرەسو کاریگەریە سیاسیو عەسکەریو نەتەوەییەکانی، بەو رادەیە راینەچڵەکاندبون، لەمێژووی سیاسیو مەرجەعیەتی بارزانی هەڵگەڕێنەوە. گەر هەوڵێکیشیان دابێ، هەوڵەکەیان لەچوارچێوەی ئەو مەرجەعیەتە نەترازاوە. بۆیە، کاتێك زانیویانە، بارزانی درێژەپێدانی شۆڕشی قبوڵ نییە، هەڕەشەشی نەکردبێ، سڵەمیونەتەوەو بڕیارو بیروبۆچونەکانیان بۆ بارودۆخێکی دیکە، دواخستووە.

ئەو سەرکردانەی لەناو (پارتی- جەلالی)یش، لەدەوری ئەو رەوتەدا، بون. ئەمانیش، بەحوکمی ئەوەی لەناو شۆڕشی ئەیلولدا، پلەوپایەیەکی عەسکەریو سیاسی ئەوتۆیان نەبوو، دۆخەکەش وایلێهات لەناو ئێراندا بکەونە را و تەگبیر، بۆیە، ئەمانیش، نە لەڕووی سیاسیەوە لێبڕابون دوابڕیاری بەرەنگاری بدەن، نە لەڕووی سایکۆلۆژیشەوە، بەشێکیان، لە ئاسەواری شکستی سەردەمی (جەلالی) رزگاریان بوبوو، لەبەرئەوە، ئەمانیش پێش ئەوەی جاڕی بەرەنگاری، یان هەوڵی راستەقینەی بۆ بدەن، وایان پێ بەرژەوەند بووە، گەر شتێکیان پێمابێ بۆ هەلێکی دیکەی هەڵبگرن. پاشان، لەم شۆڕشەدا دەرکەوت، هەردوو ئەم دوو

باڵەی ناو بزوتنەوە، چ کە ویستوییانە شێوەیەکی بەرەنگاری بکەن، پێیان وابووە دەتوانن دروشمی (انقاذ ما یمکن انقاذە) بەدیبێنن. واتا (ئەوەی دەکرێ رزگار بکرێ). نامیلکەی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟) بەراشکاوی ئاماژەی بە هەڵگرانی ئەم دروشمە بەمشێوەیەی خوارەوە داوە:

"رەوتێکی چاکسازیخواز، داوای ژیانەوەی "پارتی" بە رەزامەندی حکومەتی دیکتاتۆری عێراقی بۆرژوازی بیروکراتی لەچوارچێوەی بەرەی نیشتمانی عێراقدا، دەکات کە پرۆژەی ئۆتۆنۆمی شێواوی عێراق قبوڵ بکرێو هەوڵبدرێ "ئەوەی دەکرێ رزگار بکرێ" ئەم رەوتە سەدانی (العائدون)ی بۆ عێراق تیایە." (*)

کاتێك شۆڕشی نوێش بەرپاکرا، هەمان ئەم بیروبۆچونە لەناو بزوتنەوەدا، پەیرەودەکراو دەگوترا: خۆپیشاندانی چەکدارانە، لە خێڵو هۆزو هەموو جۆرە چەکدارێك لە شارو لادێ، ئەنجام بدرێ، هەتا رژێم ناچاری گفتوگۆ بکرێ بۆ جۆرێك لە چارەسەری سیاسی. ئەمەش لە دوو ساڵی یەکەمی بەرپابونی شۆڕشدا، هۆیەکی ناکۆکی سیاسیو پێشمەرگایەتی کۆمەڵەو بزوتنەوە بوو. بەڵام پاشان، ئاراستەکان گۆڕان. ناکۆکیەکان لەناو بزوتنەوەدا، لەسەر دۆخی کوردستان، سیاسەتی ناوخۆی بزوتنەوەو رابەرایەتیکردنی. پێگەی ئەو سەرکردانەی بزوتنەوە کە لەناو شاردا بون شەهیدان (ساڵح یوسفی، عەلی هەژارو کاردۆ گەلاڵی) ئەمانەی ناو شار، هەتارادەیەك کاریگەریان لەسەر شەهید رەسوڵ مامەندو بەشێکی سەرکردەو کادرەکان هەبوو. هەرچەندیش هەوڵیان دەدا، نەدەهاتنە دەرەوە، ئاسانیش نەبوو بۆ سەرکردەیەکی وەکو شەهید (ساڵح یوسفی) لەناو شارداو لەو هەموو بارە ئەمنیە نالەبارەدا، تەنانەت بتوانێ

* الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟. من منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني. ١٩٧٥. ص(٤)

بەنامەشەوە پەیوەندی بەردەوام بکات. شەهید عەلی هەژارو کاردۆ گەلاڵی باشتر بون. تێگەیشتنیش لە شۆڕش، کە تازە بەرپابوبوو، ئەو هەموو کێشەو کێشمەکێشەیەشی هەبوو، لەناو شارەوە، قورس بوو.

لەکۆتاییشدا، جێی خۆیەتی بۆ مێژوو رونیبکەمەوە کە: نوسەر لەتەواوی نوسینەکەیدا، دەیەوێ وای پشابدات، شەهید شاسوارو کۆمیتەی هەرێمەکان، لە سیاسەتماندا، توندڕەو بوین‌و باوەڕمان بە بنکەی سوورو شۆڕشی سور هەبووە، بۆیە، لەگەڵ بزوتنەوەی سۆسیالیست‌و دەرەبەگ‌و ئەوانەی بەدڵمان نەبوو، تێکچوین. با ئەم قسانە، لەم فلتەرەی خوارەوە بدەین، بزانین پاك دەردەچێ؟!

کۆمەڵە لەگەڵ بزوتنەوە، هەتا پێش گەڕانەوەی مام جەلال‌و دامەزراندنی سەرکردایەتی یەکێتی‌و هەڵوەشانەوەی دەستەی دامەزرێنەر. وەکو رونمانکردۆتەوە، گیروگرفت‌و ناکۆکیمان هەبوو. هەردوولاشمان، کەم‌وزۆر هەڵەمان دەکردو توڕەش دەبوین. تەنانەت سروشتی کەسایەتیەکانی هەردوولامان‌و چۆنیەتی بیرکردنەوەو پەروەردەی سیاسیشمان، کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانمان، هەتارادەیەك هەبوو. لەمبارەیەوە، کەسایەتیەکانی هەردوولامان، هەڵەمان دەکرد. بەڵام یەك بەیاننامەشمان لەسەر یەك دەرنەکردووە. هەرچی روویدەدا، لەناو کۆبونەوەو یەکتربینینەکاندا باسدەکران، بەشێکی چارەسەردەکران‌و بەشێکیشی دەمانەوە. بەڵام دوای کۆبونەوەی سەرکردایەتی‌و گەڕانەوەی مام جەلال‌و خەڵکی تریش، ئایە:

- ناکۆکیەکان تەنها لەناو کۆمەڵەو بزوتنەوەدا مایەوە؟
- ئایە.. مام جەلال‌و کاك نەوشیروان توانییان کێشەکان چارەسەر بکەن؟
- ئایە.. کێشەکان، قوڵترو فراوانتریش نەبون؟
- ئایە.. بزوتنەوە، هاوهەڵوێست مانەوە؟

بۆئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە ڕۆشن بدرێتەوە، پێویستە بڵێم: لەکۆبونەوەکانی سەرکردایەتی ناو وڵاتو دوای گەڕانەوەی مام جەلالو تەواوی سەرکردەکانی ناو وڵات، بۆ یەکجاریش کۆمەڵە، تەنانەت لە یەك کۆبونەوەی سیاسیو عەسکەریدا، باسی بنکەی سورو شۆڕشی سوری نەهێناوەتەئاراوە. لە قەراغیشدا، شەهید ئارامو ئێمەومانانیش، هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان باسی بنکەی سورمان نەکردووە. باوەڕیشمان پێی نەبووە. نوسەر ناتوانێ تاقە بەڵگەیەك لەسەر بنکەی سوری کۆمیتەی هەرێمەکان بدۆزێتەوە. بەڵکو تاقە کەسێکی زیندوش پەیدا ناکات، لەسەر پێکهێنانی بنکەی سور، نە لە قەراغو نە لە شوێنی دیکەش، شایەتی بۆ بدات.

سەبارەت بە پرسیارەکانی سەرەوەش دەربارەی دۆخی بزوتنەوەو کۆمەڵە، بزوتنەوەو یەکێتی، بزوتنەوە دوای گەڕانەوەی مام جەلالیش، پێموایە ڕوداوەکان شایەتن کە لە هەموو ئاستو ئاراستەکاندا، ناکۆکیەکان قوڵتربونو گەیشتنە تەقینەوەش. هەرگیزیش قوڵبونەوەی تەواوی ناکۆکیەکان پەیوەندیان بەوە نەبووە کۆمەڵە بنکەی سوری هەیە یان نییە. بەڵکو کێشەکان لەسەر کێشەی تر بون:

- لەناو بزوتنەوە، ناکۆکیەکان لەسەر بزوتنەوەو سیاسەتی بزوتنەوەو ڕابەرایەتی بزوتنەوە، گەیشتنە بنبەستو جیابونەوەش.
- لەناو یەکێتیشدا، جیابونەوەی زۆربەی سەرکردایەتیو پێشمەرگەو ئەندامانی بزوتنەوە، پەیوەندی بە قۆناغی دوای کارەساتی هەکاریو سیاسەتی بزوتنەوەو پێگەی بزوتنەوە لەناو یەکێتی. لەمەیاندا زۆرترین ڕەخنەی بزوتنەوە لەسەر مام جەلال بوو، نەك کۆمەڵە. گەر ڕەخنەشیان لە کۆمەڵە بوبێ، لەسەرئەوە بووە کە زۆر بەرگریان لە یەکێتیو مام جەلال دەکرد. ئەمە لەکاتێکدا، لە پلەوپایە بزوتنەوە کەمتری نەبووە لە کۆمەڵە

لەناو یەکێتیدا. لە چەکو تەقەمەنیش بزوتنەوە سەرەتا زیاتری لە کۆمەڵە بەرکەوت. تەنها لە دوا وەجبەدا، بزوتنەوە لەسەر لێواری جیابونەوە بوو، مام دەستی لێگرتنو کەمی دانێ. بەڵام لەبەرئەوەی بۆچونو ناکۆکیەکان قوڵ کران، گەیشتە جیابونەوەو دوای جیابونەوەش، بەداخەوە، پێکدادانی چەکدارانەش قەوما.

بۆئەوەی خوێنەر دڵنیابێ لەو رونکردنەوەو بۆچونانە، دەڵێم: جیابونەوەی بزوتنەوە، دوای کارەساتی هەکاری نالەبارترین روداو بوو دوچاری هەموولایەکمان هات. لەژیانی سیاسی خۆمدا، یەکێك لەو روداوانەی هەمیشە بیری لێدەکەمەوەو ئازارم دەدات، جیابونەوەی بزوتنەوە بوو لە یەکێتی. کە ئەوساو ئێستاش پێموایە، دەکرا ئەم جیابونەوەو دەرەنجامەکانیشی رونەدات. بەڵام کە روشیدا، کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا تەواو باڵادەستیش بوو. هێشتا هاوڕێیانی زیندان نەشهاتبونەدەرەوە. بەڵکو مام جەلالو کاك نەوشیروانیش، ئەو ناوچانەی کۆمەڵەیان تیا باڵادەست بوو، لەم شۆڕشەدا، نەدیبوو (قەراغ، شارەزوورو دەوروبەری هەڵەبجە، گەرمیان) ئینجا، کۆمەڵە بنکەی سوری دانەمەزراندو باسی بنکەی سوریشی هەر نەدەکرد.

با ئەم باسە بەوە قفڵ بدەین کە لەم تەرحەش بۆ دژایەتیکردنی کۆمیتەی هەرێمەکان.. بەداتاشینی تۆمەتی بنکەی سور، شکستی هێنا. جێی خۆیەتی بشپرسین:

نوسەر، هێندەی باسی بنکەی سوری شۆڕشی نوێی کردووە (کە راستیش نییە) ئایە، بەئاستەمیش لە دوو دێردا رەخنەی لە سیاسەتی (شۆڕشی رۆشنبیریو تیژی سێجیهان) گرتووە کە کاتی خۆی سەرکردایەتی کۆمەڵە، پەیڕەویان لێدەکردو بەم هۆیەشەوە، رژێمی بەعسیان کردە ناکۆکی لاوەکی؟

ئەگەر کۆمیتەی هەرێمەکانیش پەیڕەوی لە شۆڕشی رۆشنبیری و تیزی سێجیهانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لەناو شۆڕشدا کردبا، هەنگینێ دەبوو نەك بنکەی سوور، بەڵکو قەسابخانەی سوریش بۆ (بورجوازی- راستڕەوی- دوژمنی سۆسیالیست) دابنێین. چونکە شۆڕشی رۆشنبیری ئەوە دروشمی بووە.

لێرەدا، دەبێ هێندەش بڵێم: راستە کە گوتراوە، نوسینی مێژوو، تەنها شارەزایانی بێلایەنی مێژوو دەتوانن بابەتیانە بینوسن، نەك دەسەڵات، یان ئەوانەی کارەکتەری ناو روداوەکان بون. جا وەرە کارەکتەرەکانیش رقاوی و کینەلەدڵ بن!!

## ٩

# ئارامو دێ، مەلا بەختیارو شار

بچوکترین بواری نەهێشتۆتەوە خۆی پیانەکاتو کۆمیتەی هەرێمەکان نەداتە بەر نەشتەرە کولەکەی بەتایبەتی شەهید ئارامو مەلا بەختیار. نەشتەرە کولەکەی، هیچی لە راستیەکان نەبڕیوە. بێباک لە ئەمانەتی مێژوو، لە لاپەڕە (١٠٩)دا دەنوسێ:

" ئەم کێشانەی ناو خۆمان بەوجۆرە رۆیشتو پاش هاتنە دەرەوەی کاک عەلی عەسکەریو کاک عومەر دەبابە و د.خالیدو سەعدی گچکە. ئیتر کاک سالار رووەو شاربازێرو مەلا بەختیار، پێیەکی لە شارو پێیەکی لە شاخو کاک ئارام لە دۆڵی قەرەداغ دەست بەکار بوون، کاک ئارام هەر لە یەکەم رۆژی چوونەدەرەوەی لە شارەوە، چووە دۆڵی قەرەداغو خۆی لە سنوری ٨-٩ دێ یەکداقەتیس کردو کەوتە سەرپەرشتیکردنی مەفرەزەکانی ئەو ناوچەیە، کە فەرماندەی مەفرەزەکان شەهید فەیسەڵ تاڵەبانی، ئاوات قارەمانی، شەهید گۆران، رۆستەم بوون. "

لەم پەرەگرافەدا زەقو رەق هەستی پێدەکرێ، بێویژدانی دەگەیەنێتە ئاستێك، ئیتر مرۆ ناچار دەبێ بیری سەیرو سەمەرە بەسەریا بێتو لەخۆی بپرسێ: ئایە لەکوردەواریدا، مرۆڤی واش هەیە؟ لەم جۆرە مرۆڤانەشەوە، بۆمان هەیە بەقوڵی لە کەسایەتیە کارەسات خوڵقێنەرەکان، لەسەر دەسەڵات تێبگەین؛ لەخۆڕا

نەبووە، دەسەڵاتدارە خوێنڕێژەکان، کەوتونەتە وێزەی کۆمەڵو نەیارو گەلان. ئەو دەسەڵاتدارانە، کە کارەساتی گەورەیان دوچاری مرۆڤایەتی کردووە وەکو (هیتلەر، ستالین، مۆسۆلۆنی، بینوشێو فرانکۆو سەدام.. تاد) ئەمانەش، وەکو کەسانی ئاسایی، لەدایکبون، پەروەردەکراوون، بونەتە خاوەن تێگەیشتنی تایبەتیو لەناو ژینگەیەکدا، پێگەییون. مێژووی نەتەوەکانیانو ململانێکانیان لەروانگەی ئایدیۆلۆژی خۆیانەوە خوێندۆتەوە، حیزبایەتیان کردوەو بەکودەتا، یان هەڵبژاردن هاتونەتە سەر کارو ئینجا کاریان لە کار ترازاندووە. خۆ ئەو دڕندانە، لە زگماکەوە، فاشیو نازی نەبون. لەکۆشی دایکشیاندا، بەو ئایدیۆلۆژیەتە گۆش نەکراوون. ئەمانیش، لەناو رۆژگارو کێشمەکێشمەکاندا، پێگەییونو تێگەیوون.

کەسێکی وەکو هیتلەر، ئەگەر تەنها لەسەربازیدا، پلەی ئاسایی سەربازی ببڕیایە، لە عەریفیەوە ئەوپەڕەکەی دەگەیشتە ئەفسەری یەك یان دوو ئەستێرە. بەپێی کێشەکانو پایەی سەربازیو جەنگی ناوخۆ نەبوایە، فرانکۆ، هەتا سەرەمەرگ حوکمی نەدەکرد. گەر بینوشێ کودەتاکەی بەسەر (سیلڤادۆر ئیللەندی)دا سەرینەگرتایە، وەکو خائینێك دادگایی دەکرا. سەدام، ئەگەر بەعس بەهۆی ئایدیۆلۆژیەتی شۆڤێنی ناسیۆنالیزمی عەرەبیەوە، نەبوایە، هەلومەرجیش هاوکاریان نەکردایە، قەت نەدەبووە سەدامی سەرۆکی مەزنخواز.

لەباری پەروەردەو سایکۆلۆژیەوە، کاتێك مرۆڤ ئەو فاشیستو نازیانە هەڵدەسەنگێنێ، بەئاسانی دەسەلمێ کەوا، سروشتو پەروەردەی کۆمەڵایەتیو پێگەیشتنی سیاسی ئەو دڕندانە، وردە وردە لەناخیاندا هەبووەو لەگەڵیاندا تەشەنەی سەندووە، هەتا گەیشتۆتە هەلومەرجێکی سیاسی هاندەرو یارمەتیدەر، دەسەڵاتیان گرتۆتەدەستو دەستیان داوەتە تاوان دوای تاوان.

خۆم لەویاوەڕەدام، بەم مۆراڵو بیرکردنەوەیە، بەم ڕێبازو پەروەردەیە، بەم ئایدیۆلۆژیەتو رقەبەرایەتییە، نوسەر دەسەلاّتی یەکەمی لەشۆڕشدا، یان لەناو حکومەتێکدا، بەدەستەوە باَ، گومانم نییە، یەکێك دەبوو لە دەسەلاّتدارە ستەمکارەکانی مێژوو.

کەسێك، دەسەلاّتی تەنها بەسەر قەڵەمو کاغەزدا بشکێو هیچ لەمپەرێکی چاودێری بەسەرەوە نەبێ، سانسۆری ویژدانی خۆی نەبێ، بەشێکی مێژوویەك ئاوا بنوسێتەوە کە سەدان کەس زیندونو شایەتی روداوەکانی مێژووەکەن، ئاخۆ هەمان کەس، قەڵەمڕەو بوایە، لەشکرو زیندانو بانکی بەدەستەوە با، ئاخۆ، کەسێکی ئاوەها، نەدەبووە پۆل پۆتی کوردستان؟! گومانم نییە کە دەبوو. خۆ پۆل پۆتو ستالین، لە نوسەر تێکۆشەرترو بەلافلێدانیش، زۆر شۆڕشگێر بون، کەچی شەرمەزاریان کردین.

بەو پەرەگرافانە بێ کە نوسیویەتی، کەوابێ: هەرکە کاك عەلیو هەڤاڵەکانی هاتونەتە دەرەوە، کۆمیتەی هەرێمەکان هەریەکەیان بەبیانویەك مەیدانەکەیان بۆ بزوتنەوە چۆڵ کردووە.

جارێ، ئەم قسەیەی پێچەوانەی ئەو قسانەیەتی کە چەند جارێك باسی ئەوەی کردووە گوایە، کۆمیتەی هەرێمەکان، ویستبێتمان بنکەی سور دروستبکەینو لەگەڵ سەرکردایەتی بزوتنەوە، لەسەر ئەم بنکانە تێکچوبین. ئەمەیان لەولاوە بوەستێ. وەکو تریش، قەد ئەو قسانە راست نین.

سەبارەت بە کاك سالار، لەناوچەی شارباژێر، جافایەتی، بەرکێو، بەرزنجە، شلێرو مەرگە، بەزۆری ئەرکەکانی رادەپەڕاند. گەیشتە ناوچەی حاجی قەلاّو ناوچەی سەرگەڵو، مەرگەو سورقەلاّوشان، تەنانەت چووە قەرەداغو بازیانیش، هەتا تەموزی ١٩٧٧ هاتە دۆڵی (گۆستێ- برادۆست) و بۆ ساڵێك سەفەری دەرەوەی کرد.

سەبارەت بە شەهید ئارامیش، چەند جارێك لەم نوسینانەدا، نوسەر باسی ئەوە دەکات کە لەسنوری (٨-٩) دێدا قەتیس ماوە. بەمەش دەیەوێ بەخوێنەر بڵێ: شەهید ئارام لەشۆڕشدا، کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبووە. لەوەڵامدا دەڵێین:

جارێ، لەکاتی لێدانی کۆمەڵەدا، مادام شەهید ئارام خۆی راگرتو کوردستانی جێنەهێشت، سەرەڕای ئەوەی دەشیتوانی بەئاسانی خۆی بگەیەنێتە سوریا، ئەمە خۆی لەخۆیدا، هەڵوێستێکی جوامێرانەیە. پاشان، کاریگەریەکانی، لەوەدا چڕناکرێتەوە چەند دێیەك گەڕاوە، یان نەگەڕاوە. پێش گەڕانەوەی مام جەلالو پێش بینینو هاتنەدەرەوەی شەهید عەلی عەسکەریو هەڤاڵەکانی، بە ئەندازیاری چۆنیەتی بەرپابونی شۆڕشو داڕشتنی بناغەی رێکخستنی مەفرەزە سەرەتاییەکان دەژمێردرێ. ئەمە جگەلەوەی رۆڵێکی گەورە لە گرتنەوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵەدا هەبووە. هەروەها، با بێینو ئەدەبیاتی کۆمەڵە لە دوو ساڵی رابەرایەتی شەهید ئارام دا، بە ئەدەبیاتی کۆمەڵە، لە شەش ساڵی پێشتری مێژووی کۆمەڵە بەراورد بکەین، با بزانین، لەم دوو ساڵەدا زۆرترو بابەتیانەتر ئەدەبیاتی کۆمەڵە بەرهەمهاتووە؟ یان لەو شەش ساڵەدا. ئەمە لەکاتێکدا، پێنج ساڵی پێشتر (١٩٧٠-١٩٧٥) کۆمەڵە، رێکخراوێکی نهێنی بوو. کەسی نەگیرابوو. دەتوانرا (گەر توانای تیۆریو فەلسەفیو سیاسی باشتر هەبوایە) کۆمەڵە بکرێتە خاوەن ئەدەبیاتێکی باش. (١٩٧٥) گلەیی لە سەرکردایەتی کۆمەڵە کە چونەتە ناو شۆڕش ناکرێ، بەڵام یەك ساڵی رەبەق، کۆمیتەی (ئەستێرەی سور)ی ناو شارەکان، یەك دوو بڵاوکراوەی ناوخۆ نەبێ، شتێکی ئەوتۆیان نەنوسیووە.

## ١٠

## سەردانەکانی " ئارام " یش نابینی؟!

شەهید ئارام، بڕیاری گرتنی دەرچووە. بەهەزار ناڵی عەلی، تایپ‌و ڕۆنیۆیەکی شکاومان دەستکەوتووە. ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، بەر شاڵاوی گرتن‌و ڕاوەدوونان کەوتون، ئینجا، ئەرکی خۆئامادەکردن، پێکەوەنانی مەفرەزەکان، چەك پەیداکردن.. تاد. سەرەڕای ئەو ئەرکانەو هی تریش، شەهید ئارام توانی بە لێوەشاوەیی خۆی‌و سەرکەوتویی کۆمیتەی هەرێمەکان لە ڕاپەڕاندنی سەرجەم ئەرکەکاندا، ئەو هەموو ئەدەبیاتە سیاسی‌و فکری‌و عەسکەریەش بنوسێ. زۆربەشی چاپ بکات. تەنانەت ژمارەیەکی (ئاڵای شۆڕش) بە تیرۆك‌و شێوەی چاپی سەدەکانی ناوەڕاست چاپ‌و پەخش کردبوو.

جگە لەو ڕاستیانە، کەسایەتی شەهید ئارام، خۆشەویستیەکەی، کاریگەریەکانی، پەیوەندی ڕاستگۆیانەی لەگەڵ هاوڕێیاندا، گیانی لێبوردەیی‌و ڕێزگرتنی دەوروبەری، دوری لە ڕق‌و کینە، پاکێتی لە نەخۆشی خۆبەزلزانین، لەو سێ ساڵەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا، تاقە کەسێکی لەخۆی زویرنەکردو زوڵمی لە یەك کەسیش نەکرد. ڕێزی پێشمەرگەی زۆر دەگرت. کەسێکی خاکی‌و نمونەی پاکی بوو. ئەم شەهیدە، لەم پێودانگانەوە دەبێ هەڵبسەنگێندرێ نەك گەڕان‌و نەگەڕانی لە چەند دێیەکدا. بۆئەوەش کە نوسەر دەڵێ "خۆی لە سنوری (٨-٩) دێیەکدا قەتیس کردو کەوتە سەرپەرشتیکردنی مەفرەزەکانی ئەو ناوچانە.." تاد.

نوسەر، بەم شەشبارەکردنەوەیەی ئەم رستەیە، لەدووتوێی (چەپکەکەی)دا، جگە لە دەرخستنی رقی ئەستوری بەرامبەر کاك ئارام، رقەکەی وایلێکردووە، راستیەکانیش وەکو هەن، نەبینێ. ئەوەی پێشمەرگەو کادرو ئەندامی کۆمەڵەو یەکێتی لەسەرەتای ئەم شۆڕشەدا بوبێ، باش باش دەزانێ کاکە ئارام، دەیان ناوچە (نەك ٨-٩ دێ) گەڕاوە. وەکو:

- یەکەم؛ جارێ لە (١١/١٠ ی١٠-١٩٧٦) لەگەڵ شەهید ئازاد هەورامی کە لە (دۆڵە روتە)وە چونە دەرەوە، دێهاتی دۆڵە روتی دیووەو جارێکی تریش هاتۆتەوە دۆڵەڕووت. ئەمە یەكو یەکەم چونەدەرەوە.
- دووەم؛ زۆربەی هەرەزۆری دێهاتەکانی جافایەتی گەڕاوە: (چۆخماخ، مێولاکە، سنگر، یاخسەمەر، مالومە، هەڵەدن، چالاوا، گوێزیلە، گەرەزیل، گاپیلۆن، خورخورە، یاخیان، گەورەدێ) لە گەورەدێشدا، کە دێیەکی گەورەو دورەدەستو پەنا بووە، شەهید ئارام یەکەمین خولی پەروەردەی کادرانی کۆمەڵەی بۆ (٨) کادر کردۆتەوە.
- سێهەم؛ چۆتە ناوچەی شینکایەتیو دێهاتی: (قامیش، دڕی، سەفرەوزەرون، شینکی، باساوێو گەلاڵە) گەڕاوە.
- چوارەم؛ بەرێگەی (خەمزەو قولەهەرمێ) دا، چۆتە شارباژێری تەختو سەری لە دێهاتی: (چنگیان، سیتەك، گەرەدێ، نۆدێ، شوکێ، باراو، بزەینان، عازەبان، گورگەیەر) داوە.
- پێنجەم؛ بەرێگەی (زەلان)دا، خۆی گەیاندۆتە شارباژێری سەختو دێهاتی (پارەزان، رەزلە، چنارە، دۆڵپەمو).
- شەشەم؛ بۆ ناوچەی بەرکێو: (ئاروزەر، قەلاتێ، بایانە، سورەبان، مەمەندئاوا، شێخەڵمارێن، گوێزەڕەش). پاشان.
- حەوتەم؛ بەرزنجەو گوندەکانی: (حاجی مامەند، خانووە قورەکان).

- هەشتەم؛ (ناوچەی شلێر: ڕەنگینە، هەردوو کانی میران، شەیان، دارۆخان (مەجید خان) گۆڵێ (مەحمود بەگی گۆڵێ) چوێسە (شێخ عەبدولقادری چوێسە) زەنگیەر، دەڵەڕۆ، هتا دەگاتە میشیاو) بۆ ماڵی حەمەسدیق خانی خوالێخۆشبوو.
- نۆیەم؛ (شارستێن و دۆڵەبی) لەوێشەوە بۆ (مەرگەو ئاوەژێ) هەر لێرەوە بەرەو..
- دەیەم؛ بەسەر زێدا، دێهاتی هەڵشۆ هەتا شێنێ،(*) لەوێشەوە لەگەڵ شەهید ڕەسول مامەندو تالیب ڕۆستەم لە ناوچەی مەنگوڕایەتیو بناری قەندیلدا گەڕاون. (بێدەلان، ڕەزگە، مارەدو، ئاڵیەرەش، بەستێ). لەم گەشتەیدا، شەوێکیان لەکوێستانی عەلی ئاغای مەنگوڕ دەبن، کە ئەوکاتە، خۆیو هۆزەکەی هاتبونە ریزی شۆڕشەوەو پاشان ڕژێم بە پیلانێك شەهیدی کرد، شەو کە لەوێ دەبن، هەواڵ لە قەلادزێوە دێت کە بۆ بەیانیەکەی هێرشێکی بەربلاویان دەکرێتەسەر، عەلی ئاغای مەنگوڕیش، کە پیاوی مەجلیسو قسەخۆش بووە، شەهیدان (ئارامو ڕەسول مامەند)یش میوانی بوون، نایەڵێت هیچیان قسە بکەن، وەلامی کابرا دەداتەوەو دەڵێت:
- با بێن، باسکەکانیان لێدەگرین، لە هەڵەتیدا دەیانخەینە بۆسەوە، دایەیان دەگێین.

* لە گوندی شێنێ، شەهیدان (ئارام، عەلی عەسکەری، ڕەسول مامەند د.خالید، مەحمود سەیدا)و عەزیز بەگ، مەلا قادری بێتواتە، کوێخا ڕەسولی بێتواتە، سلێمان بیرێژی، جەمال خۆشناو، بایزی عەباس ئاغا لەگەڵ نوێنەرانی پارتی: (کەمال کەرکوکی، فازیل جەلال (عادل کەرکوکی)، عەبدولمەلیك، فەقێ سمایلی یاخیانی، کۆبونەوەو قسەوباسیان لەسەر ڕاگرتنی هێمنیی پەیوەندی یەکێتیو پارتی کردبوو. سەرەڕای ئەوەی لە بادینان برایم عەزۆو هەڤاڵەکانی شەهیدکرابون. چەند پێشمەرگەیەکی پارتی لە دێی (باوزێ) چەککرابوون، شەهید عەلی عەسکەری چەکەکانیشی دابونەوە. سێ ڕۆژ شەهید ئارام لەماڵی کاك محەمەد وەتماندا دەمێنێتەوە.

بۆ بەیانی زوو، عەلی ئاغا شەهید ئارام بێدار دەکاتو پێی دەڵێت:

- مامۆستا ئارام، تەگبیر..؟

شەهید ئارامیش کە دەستوبرد قسەی بۆدەهات، پێی دەڵێت:

- تەگبیر تەگبیری شەوە!

عەلی ئاغاش دەڵێت:

- کورە بۆ خاتری خوا هەڵسە با راکەین. ئەوە هەر ویستم لەبەرچاوی جوتیارەکان خۆم نەشکێنمو هەرەشە بکەمو ئازایەتی پێشمەرگە دەرخەم. هەڵسە بەزاتی خوا دەرەقەتی ئەو هێرشە نایەین.

لە مەنگورایەتی کە گەڕاوەتەوە، دیسان بەناوچەی شارستێن، دۆڵی جافایەتی، چۆتەوە شارباژێر، هاتۆتەوە دۆڵی جافایەتی.. دۆڵەڕوت، دێهاتی بناری پیرەمەگرونو لە دێی (باخی سەرو) وە بۆ (چەرمەگا) پەڕیوەتوە هەشتەمین ناوچە کە بازیانە (دێلێژە، گورباز، خاوێ، باڕویی، سەرزەل، قازان قایە، تەنگی سەر، کونەکۆتر، قارەمان، دەرەمیانە، دۆڵان، هالدەرە، مێولی، فیکەیەر، تیمار، چەولك، مریەم بەگ، سۆڵە، ...) نۆهەمین ناوچەش قەراغە، کە بەم دێهاتانە گەڕاوە (تەکیە، سێوسێنان، دەلوجە، ...).

کۆتایی ویستگەی سەردانەکانی، دیوی گەرمیانو بناری شاخی زەردەیە. کە بە دێهاتی ((ژاڵەی رەوات، گەڕەچیا، رەوات، هەزارکانی، داربەڕو (دێی شێخ عەبدولعەزیز) بانی مۆرد، دەرواری شاسوار، تەپەگەڕوس، قەڵای تەپەگەڕوس، زەردەلیکاو)) لەرێی ئەسپەڕێوە گەڕاوەتەوە بۆ دێهاتی (قەرەداغو بازیان) لە دێی (زەردەلیکاو) زەماوەند بووە. کەس نەیناسیوە. گۆرانیبێژێك دێتەلایو پێی دەڵێ: بەم عەینەکەتەوە، لەوە ئەچێ گۆرانی باش بزانی. ئا وەرە چەند بەیتێکمان بۆ بێژە. شەهید ئارامیش، ئەم جۆرە رێکەوتانەی پێناخۆش نابێ.

لەوەلآمدا دەڵێ: بەخوا ئەمشەو گۆرانی زۆریان پێوتم، قورگم گیراوە. کابراش وازی لێناهێنێو دەیەوێ بەپاڵ بیباتە ناو شاییەکە، هەتا پێشمەرگە کابرا دووردەخەنەوەو پاشان دەزانن ئەوە کاك ئارامە.. دێنو داوای لێبوردنی لێدەکەن. ئەویش بەپێکەنینەوە دەڵێ: کورە خۆزگە دەنگم خۆشبوایە یەك دوو بەیتم بۆ بوتنایە.

نوسەر، پێموانییە، لەو ناوچانەو لەو دەیان دێهاتە، هەندێکی هەر نەزانیبێ. بەلآم رقە کوێرانەکەی وایلێکردووە، چەند جارێك بیڵێو بیڵێتەوە کە ئارام لە (٨-٩) دێدا خۆی قەتیس کردووە. ئەمە لەکاتێکدا، گەر زانیاری گەرانەکانی شەهید ئارامیشی هەر نەبوبێ، خۆ ئەو راستییە باش دەزانێ کەوا:

سەرکردەی هەڵکەوتوو، بە گەرانو دێهات بینین نییە. بەڵکو بە وشیاریو ئەزمونو تێگەیشتنی ستراتیژیو دووربینییە:

- شەهید شیهاب؛ نە لە سەردەمی شۆرشی ئەیلولدا، نە لەسەردەمی جەلالیەکاندا، نە لە شۆرشی نوێدا، پێشمەرگایەتی بەمانای پێشمەرگایەتی شەر و شەرگە نەکردبوو، بەلآم بە مێژوویەکی چاكو دامەزراندنی کۆمەڵەو (کەم بژیو کەڵ بژی) بوو بە یەکێك لە رابەرە گەورەکانی نیوسەدەی رابوردوومان. بەبێ ئەوەی ئەدەبیاتیشی بەناوی خۆیەوە، لێ بەجێمابێ.
- مەهدی بن بەرەکەی رابەری چەپەکانی مەغریب، لەژیانیا، چەکی هەڵنەگرتبوو، هەتا نەیانفراندو شەهیدیشیان نەکرد، ناوبانگیشی نەبوو، کەچی دوای گرتنو ئەشکەنجەدانو شەهیدکردنی، یەکێکە لە رەمزە شۆرشگێرەکانی رۆژئاوای عەرەبیو عەرەبو رۆژهەلآت. بەبێ ئەوەی باسێکی تیۆریو نوسراوی سیاسیشی تا ئێستاش چاپکرابێ.

- جۆرج حەبەش، نایف حەواتمە، غەسان کەنفانی، کەمال ناسرو ئەبو جیهاد، ئەمانە لە منالیدا نەبێ، شارو دێیەکی فەلەستینی داگیرکراویان نەدیبوو، کەچی بون بە سەرکردەو نوسەری هەلکەوتوش.
- لینین، زۆربەی ژیانی بە خەباتی ژێرزەمینیو لە تاراوگەدا بردەسەر، بەڵام کە شۆڕشی بۆرژوازی (شوباتی ١٩١٧- ئۆکتۆبەری ١٩١٧) بەسالێك بارتەقای دەیان ساڵ، وەکو رابەرێکی گەورەی جیهانیش دەرکەوت.
- فەهدی رابەری حیزبی شیوعی عێراق، هەر خەباتی ژێرزەمینیو نوسراوەکانی، هاوکات شەهیدکردنی، کردییە رابەرێکی گەورە.

دەتوانین دەیان نمونەی تریش بهێنینەوە کە سەرکردەی هەلکەوتوو، سەرکردەی لێوەشاوە، ئەوەندەی ئەقلّو تێگەیشتنی، هەلۆێستو* سوربونی لەسەر رێبازەکەی، خزمەتکردنی حیزبو گەلەکەی، گرنگە، ئەوەندە گرنگ نییە، چەند گەڕاوەو لەکوێش گیرساوە.

سەبارەت بە خۆشم؛ وەکو نەزانێ من چ ئەرکێکم لەسەرشان بووە، چ لە شارو چ لە شاخ، پێمدەلێ: مەلا بەختیار پێیەکی لە شاخو پێیەکی لە شار بووە.

(١٩٧٧) دوو جار و دوای شەهیدبوونی کاك ئارام جارێكو هاوینی (١٩٧٨)یش دوای کارەساتی هەکاریش جارێك، چومەتە شار.. ئەمەش بەحوکمی ئەوەی من بەرپرسیاری رێکخستنەکانی کۆمەڵە بوم.

بەلێ، من، لەو ماوەیەی نوسەر دەلێ، ئەم سەفەرانەی ناو شارم، بەم ئیشانەو دوای ئەم روداوانە کردووە:

یەکەم: بەهاری (١٩٧٧) شەهید ئازادی مەلاو هەندێك لە هاوڕێیانی رێکخستنی سلێمانیو شوێنانی دیکەش گیرابون، لەگەڵ شەهید ئارامو کاك سالار، لە (چۆخماخ- یاخسەمەر — مێولاکە) یەکمان بینیو دەمێك بوو کۆمیتەی هەرێمەکان کۆنەبوبوینەوە. کاك ملازم عەمەریشمان بانگ کردە

کۆبونەوەکەو دۆخی ئەوساو پەیوەندی بزوتنەوەو کۆمەڵە، ڕێکخستنەکانی شارەکان، نەبونی هاوکاری پێشمەرگە، گرتنی کەسوکاری پێشمەرگەو چۆنیەتی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانمان کرد. شەهید ئارام دەردەدڵی خۆی بەتەنهاش بۆ ڕشتم (کە ئێستا کاتی باسکردنیان نییە) بەهەندێك بڕیارو بەرنامەی خۆیدا بۆ ناو شۆڕش چوبوەوەو، بۆ ناو کۆمەڵەو ناو پێشمەرگە دانی بە چەند هەڵەیەکیش نا. لەوێدا، جەختکرایەوە کە ڕێکخستنەکانی ناو شارو پێشمەرگەی شار، بۆ کۆمەڵە زۆر زۆر گرنگن، بۆیە، بەتەنها ڕایسپاردم کە بۆ مانگ — دوو مانگێك بچمەوە شارو شیرازەی ڕێکخستنەکان بگرمەوەو لەسەرانسەری کوردستانیشدا، پێکەوەیان گرێبدەم. ئەم هاتنەوەیەم، وەکو ئەرك بوو.

دووەم: جەمالە ڕەش‌و شەهید عەلی ئامەخان هاتبونە ناو شار، نامەیەکی شەهید ئارامیان هێنابوو، کە لە قەراغ سەردانی بکەم. خۆم گەیاندە لای‌و قاتێ جلی کوردی‌و جوتێك پێڵاویشم بۆ برد. زۆری پێخۆشبوو، چونکە جلەکانی کۆن بوبوو. لەوێ، شەهیدان: (عەلی ساڵح، ڕێباز، فاروق، عەلی‌و ئاسۆی ئاومالٚ)و چەند هاوڕێیەکی کۆمەڵەی ناوچەی هەولێرو شەهید شەماڵی باخیشم بینی. چەند ڕۆژێك پێکەوەبوین لە (گورباز، دێلێژە، کونەکۆتر، قازان قایە، خاوێ، تەنگی سەر، هەڵەرە، ..) شەو و ڕۆژ پێکەوە، قسەوباسێکی زۆرمان کرد، زیاتر لەو ماوەیەی لە دۆڵی جافایەتی، کە لەبەهاردا پێکەوەبوین، ناخی خۆی بۆ باسکردم. قسەکانیم بەوردی لەبیرو لەبەرە. قسەوباسی لەسەر:

یەکێتی، بزوتنەوە، پارتی، حیزبی شیوعی، وحدە القاعدەی قیادەی مەرکەزی، هەروەها؛ مام جەلال، شەهید عەلی عەسکەری، شەهید دکتۆر خالید، شەهید ڕەسول مامەند، هێڵی گشتی، کاك سالار، پێکهاتەی شۆڕشەکەو ئاییندەی ڕوداوەکان.. تاد.

کاتی نییە وردودرشتی قسەکانی باسبکەم. بەڵام هێندە دەڵێم: شەهید ئارام لە: پەیوەندی کۆمەڵەو یەکێتی؛ ڕابەرایەتی مام جەلال؛ پاشگەزنەبوبوو، بەڵام

لەسەر پاراستنی کۆمەڵەو، رۆڵی کۆمەڵەو، پەرەپێدانی کۆمەڵە، سورتر بوو. گللەیشی لە دابەشکردنی ئەو چەکانەی لەسوریاوە هێنرابون، کە زۆریەیان بەر بزوتنەوە کەوتبوون، هەبوو.

بۆ ناو کۆمەڵەو کۆمیتەی هەرێمەکانیش، بیروڕای تازەی هەبوو. دەیویست لە هەلێکدا، کۆبونەوەیەکی نیمچە فراوان بکرێت‌و سەرکردایەتیەکی تازە بۆ کۆمەڵە هەڵبژێردرێت. هەروەها بیرۆکەی دانانی بارەگای سەرکردایەتی کۆمەڵە لەهەمان شوێنی سەرکردایەتی یەکێتی. دەرکردنی رۆژنامەی (ئاڵای شۆڕش) بەشێوەی مانگانە، یان دوو مانگ جارێك. لەهەلێکیشدا، بەستنی پلینیۆم، یان کۆنفرانس. زۆریش تاقیبی دەکرد کە ئاخۆ، رێکخراوە چەپەکانی سەرانسەری کوردستان، عێراق، ئێران‌و تورکیا، لەناو فەلەستینیەکان‌و ناوچەکەدا، چۆن بیردەکەنەوە. دەیگوت: دوورنییە کوردستانی عێراق‌و کۆمەڵە، لە گۆڕانکاریەکدا، ببێتە ناوەندی خەباتی شۆڕشگێڕانە. هەر لەسەر ئەم بنەمایە، رێزی لە حیزبی شیوعی، قیادة المركزية (وحدة القاعدة) دەگرت. بەڵام دوایی، لەسەر حیزبی سەرانسەری عێراقی‌و یەك حیزبی سەرانسەری کرێکاران، هەروەها سوتاندنی کتێبیە عەرەبیەکانی تەعریبکردنی خوێندن لەکوردستاندا، لەلایەن پێشمەرگەوە، ئەمە جگە لەو دژایەتییە توندەی شورەوی‌و پاشکۆیەتی چین‌و تیژی سێجیهان، شەهید ئارام بەرە بەرە لەگەڵ (وحدة القاعدة) ناکۆکیەکانی بەقوڵی دەبینی. سەرەنجام، شەهید فازیل مەلا مەحمود بەیاننامەیەکی لەسەر کۆمەڵەو یەکێتی دەرکردو کوردستانی جێهێشت. من دوای شەهیدبونی، کە چومە قەراغ بۆ لێکۆڵینەوە، رەشنوسی دەستنوسی کاك ئارامم بینیووە، کە وەڵامی زانستیانەی بەیانەکەی دابونەوە، بردیشمە سەرکردایەتی‌و تەسلیمی کاك نەوشیروانم کرد، بەداخەوە فەوتا.

## ١١

# ناكۆكی لەسەر سەركردایەتیو سكرتێر

لە درێژەی ئەم باسانەدا، كە خۆی لەدەرەوە نەبووەو زۆربەی بیستووە، خەیاڵی تۆڵەسەندنەوەی بەرداوەو دەیەوێ ناكۆكی نێوان بزوتنەوەو كۆمەڵە، وا پشانبدات كە ناكۆكی بووە لەسەر پلەوپایە. بۆیە، لە لاپەڕە (١٠٩)دا ئاوای دەهۆنێتەوە:

" كاتێ كە بڕیاری پێكهێنانی سەركردایەتی یەكێتیی ناوخۆ دەرچوو، نە شەهید عەلی عەسكەری بەوە قایل بوو، كە ئارام ڕۆڵی شكرتێری بگێڕێو نە ئارامیش بە عەلی عەسكەری، بۆیە لەسەر ئەوە پێكهاتن كە لە هەر ناوچەیەك دوو لێپرسراو دابنرێ (یەكێك لە كۆمەڵە) (یەكێكیش لە بزووتنەوە)، بۆیە بڕیاردرا كە ئارامو ڕەسول مامەند لێپرسراوی سیاسی بنو عەلی عەسكەری — سالار عەزیز، تالیب ڕۆستەم، د.خالید، ملازم عومەر عەبدوڵلا، ملازم تایەر عەلی والی لێپرسراوی عەسكەری ناوچەكان بن."

جارێ ناوی سەركردایەتی ناوخۆ نەبوو، سەركردایەتی وڵات بوو. دوورونزیكیش ناكۆكی لەسەر سكرتێری یەكێتی نەبووە. چونكە كۆمەڵەو بزوتنەوە، بێ دوودڵی مام جەلالیان بە سكرتێری یەكێتی قبوڵ بوو. كاتێكیش مام جەلال گەڕایەوەو دەستەی دامەزرێنەرو سەركردایەتی ناو وڵات یەكخرانەوە، تەنانەت یەك كەسیش دژی هەڵبژاردنی مام جەلال بۆ سكرتێری نەبوو. بەڵكو

شەهید عەلی عەسکەری چەند جارێك مام جەلالی کردە شایەت کە کاتی خۆی، لەناو پارتی شۆڕشگێڕی کوردستانیشدا، عەلی عەسکەری لەگەڵ باڵی چەپدا بووە. بیری خستەوە کە نامیلکەیەکی ئەنوەر خواجەشی وەرگێڕاوە. لەبەرئەوە، هەڵبەستنی کێشە لەنێوان شەهیدان عەلی عەسکەری‌و ئارامدا، لەسەر سکرتێرێتی یەکێتی، لای کەس قابیلی قبوڵ نییە. تەنها نوسەر خۆی نەبێ.

دەربارەی ئەوەی لەسەر پلەی عەسکەری‌و سیاسی ناکۆك بوین. بەڵێ ناکۆك بوین. ئەی چۆن دەبێ، دوو ڕێکخراوی ئایدیۆلۆژیەت جیاواز، لەسەر دەسەڵات، پلەوپایە، تێڕوانینیان بۆ ئایندەی سیاسی‌و خەباتی شۆڕشگێڕانە، ناکۆك نەبن. گەر وانەبا، ئاسان بوو ببینە یەك حیزب.

پاشان، ئاگای لەخۆی نییە. لە پەرەگرافی پێشتر دەڵێ؛ "برادەرانی بزوتنەوە هاتن‌و بەهۆی پایەو ناوبانگیان، لەناو شۆڕشەکەدا زاڵبون‌و ئارام چۆتە چەند دێیەکی قەراغ. مەلا بەختیار پێیەکی لە شارو پێیەکی لە شاخ بووە. سالاریش خۆی گەیاندۆتە شارباژێر.." بەو پەرەگرافەی سەرەوە بێ، کە لەچەند لاپەڕەیەکی پێشوودا هەڵمانسەنگاند، کۆمەڵە سەرکردایەتیەکەی کەوتونەتە پەراوێزەوە. کەچی، لە پەرەگرافێکی تردا، پەرەگرافەکەی پێشووی لەخەیاڵ نەماوەو دەنوسێ؛ "لەسەر سکرتێری‌و بەرپرسیارێتی سیاسی‌و عەسکەری، کۆمەڵەو بزوتنەوە، ڕێکنەکەوتون. بۆیە، چونیەك لەناو خۆیاندا، دابەشیان کردووە".

دەپرسین: ڕێکخراوێکی پەراوێزخراوی سەرکردایەتی پەرش‌وبڵاوی وەکو کۆمەڵە، چۆن توانیویەتی، لەناو سەرکردایەتی ولأتدا، پۆستە هەرە باڵاکانی یەکێتی‌و شۆڕش، چونیەك لەناو کۆمەڵەو بزوتنەوەدا، یەکبخاو ڕێکبخاو سەریش بخا؟ ئەو دو بۆچونەی نوسەر، چەندی بەچەند؟

راسته، شەهید عەلی عەسکەری‌و کاك سالار بون بە بەرپرسیاری عەسکەری، بەڵام هی سەرانسەری کوردستان، نەك هی ناوچەیەك. د.خالید، ملازم عومەر، تالیب رۆستەم، ملازم تایەری عەلی والی.. تاد، بون بە سەرپەرشتیاری عەسکەری ناوچەکان.

ئەو قسانەی نوسەریش راست نین کە لە لاپەڕە (١١٠)دا دەڵێ؛ سەرکردایەتی کۆمەڵە:

"نەك هەر ئیلتیزامیان بە بڕیاری کاری هاوبەشی‌و بەرەیی نەدەکرد، بەڵکو دانیان بە رابەری سەرکردایەتی نوێنەرانی بزوتنەوەدا (عەلی عەسکەری- د.خالید سەعید – رەسول مامەند – تایەر عەلی والی – سەعدی گچکە) نەدەنا."

وەکو وتم؛ بەڵێ ناکۆکی لەنێوانماندا هەبووە. بەڵام لە راپەڕاندنی ئەرکە هاوبەشەکانماندا، لە چالاکی‌و جوڵاندا، لە شەڕەکاندا، لە داڕشتنی سیاسەتی یەکێتیدا، سیاسەتی هاوبەشمان هەبوو. بەردەوامیش پێکەوە بوین. هەر خۆم ماوەیەك لەگەڵ شەهید عەلی عەسکەری لە ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی، قەندیل‌و برادۆست بوم. وەکو یەکێك لە سەرکردە گەورەکانی شۆڕش رێزم دەگرت. کە کراشم بە ئامر هەرێمی یەك لە (١٩٧٨) فەرمانەکەم لەلایەن شەهید عەلی عەسکەریەوە دەرچوو. سالار عەزیزو ملازم عومەر، ماوەیەکی زۆر لەگەڵ شەهید عەلیدا، پێکەوە بون. بەڵکو نێوان رەسول مامەندو شەهید د.خالیدو شەهید ئارام، جێگەی ئومێد بوو. تەنانەت شەهید رەسول مامەند، هاوسەرەکەی لە زینداندا کوڕێکی دەبێ، لە خۆشەویستی کاك ئارام ناوی ناوە (ئارام).

ئەو راستیانە، بەشێکی نوسەر لێی بێئاگایە، بەشێکیشی دادەتاشێ هەتا ئەوەی مەبەستێتی، بکاتە راستی. هیچ نەبێ لای ئەو خوێنەرانەی کە لە روداوەکان کە کەمئاگان.

لە درێژەی ئەو لاپەڕەیەو تێپەڕاندنی مەرامەکانیدا، بێئاگا لە چۆنیەتی پێکهێنانی سەرکردایەتی ناو وڵات. بێئاگا لەوەی ئەم سەرکردایەتییە چەند کۆبونەوەی کردووە. لەکوێ کردویەتی. چ بەرنامەو بڕیارێکی پەسەند کردووە. بێئاگا لەو هەموو وردەکارییە، حوکمی دژایەتی شەهید ئارام، لە کێشەیەکەوە دەگوازێتەوە بۆ کێشەی دیکە. لە هیچیشیاندا بەڵگەی پێ نیە. وەکو لە لاپەڕە (١١٠)دا

" تەنانەت تا شەهیدبوونی ئارام لە قەرەداغ بەشداری یەك کۆبونەوەی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتیی نەکرد."

کە هەموو پەرەگرافێك لەم بابەتە داتاشراوانە دەخوێنمەوە، لای خۆم بیری لێدەکەمەوەو لەبەرخۆمەوە دەڵێم: تۆ بڵێی نوسەر وا تێگەیشتبێ، شایەتی روداوەکان نەخوێنەوارن. مردون. یان تاقەتی خوێندنەوەیان نەماوە. خۆ ئاشکرێ وای بیرکردبێتەوە، شایەتەکان لێی دەترسن و کەس ناوێرێ وەڵامیشی بداتەوە. دڵنیام وای بیرنەکردۆتەوە. چونکە هەموو کەسێك کەسایەتی نوسەر دەناسێ راستە ترسنۆکە، وەلێ ترسێنەر نییە!! بۆ راستکردنەوەی زانیاریەکەی دەڵێم:

کۆمیتەی سەرکردایەتی ناو وڵات، یەك جارو ئەو جارەش تەنها لە "گەورەدێ" کۆبونەتەوە. لەو کۆبونەوەیەشدا، شەهید ئارام ئامادەبووەو پلەو بەرپرسیاریەتیەکانیش لەناو کۆمەڵەو بزوتنەوە لەو کۆبونەوەیەدا، دیاریکران. ئیتر نازانین نوسەر کۆبونەوەکانی تری لەکوێ هێناوەو چۆن چۆنیش زانیویەتی، ئارام هەتا شەهیدکراوە، (بەشداری یەك کۆبونەوەی سەرکردایەتی نەکردووە؟).

بەو زانیاری هەڵبەستنانە ناوەستێ و سەرەنجام، دەیەوێ دوای ئەوەی بەحسابی خۆی زانیاریەکانی لەمێشکی خوێنەردا چەسپاندووە، ئینجا دێتە سەر هەڵسەنگاندنی روداو، بڕیارو زیانەکان. دیقەت بدەن چۆن لە لاپەڕە (١١٠)دا ئەم (٥) خاڵە ریزدەکات:

" ١- پەیڕەونەکردنی کاری بەکۆمەڵی و سەرهەڵدانی سەرەتای تاکڕەوی و توندڕەویش.

٢- نەبوونی یەکێتیی و ئیش و کارو بڕیارو جێبەجێکردن. بەپێچەوانەوە پاشاگەردانی و خۆنەبەستنەوەی ئەم لا بە بڕیاری ئەولاو هەروەها بەپێچەوانەوە.

٣- فرە ناوەندێتی لە بڕیاردان و دەسەڵاتداو هەروەها فرە سەرکردایەتی لە رابەریکردن و هەڵسوڕانی شۆڕشدا.

٤- نەهێشتنی متمانە بە یەکتری لەناو کۆمەڵەو بزوتنەوە و بگرە بە چاوی گومانەوە سەیری یەکتر کردن و تەنانەت دژایەتی کردنی یەکتریش لە زۆر شوێن و ناوچەو لەنێوان زۆر پێشمەرگەو کادری هەردوولادا.

٥- پەیڕەونەکردنی سەرەتای باشی چەندایەتی لە پێکهێنانی مەفرەزەو کەرت و هەرێم و هێزی پێشمەرگەدا، ئەوەش بۆ راستکردنەوەی تای تەرازووی هێزی هەردوولا بەرامبەر یەکتری، تا کار گەیشتە ئەوەی کە بزوتنەوە کەوتە کۆکردنەوەی عەشایەرو ئاغاو کوێخاو هەمەجۆرە، لەولاشەوە کۆمەڵەش کەوتنە هەمان هەڵەوە، بە کۆکردنەوەی کەسانی ناشایسکەی نێو شارەکان لە کۆنە پێشمەرگە یا دەسوەشێنەکانی ناو شارەکان."

کورد دەڵێ: رەمەزانی تەواو کردووە، نۆرەی شەشەلانێتی. زانیاریەکانی نوسەر زۆر تەواون، هەتا هەڵسەنگاندنەکانیشی تەواوکەریان بن.

- سەبارەت بە خاڵی یەکەم؛ ئایە لەسەرەتای شۆڕشدا، لەناو دوو ڕێکخراو و لەچوارچێوەی نیمچە بەرەیەکی تازە دامەزراودا، پەیڕەوکردنی کاری بەکۆمەڵ، لە نەبونی سەرکردایەتیو نیزگەو تەنانەت یەك ئامێری پەیوەندیکردنیش، ئایە کاری بەکۆمەڵ، ئاسانە. بەتایبەتی شۆڕشەکەو لایەنەکانی توشی شەڕی ناوخۆش هاتبن.
- بۆ خاڵی دووەمیش؛ هەمان وەڵامی خاڵی یەکەم دەیگرێتەوە.
- بۆ خاڵی سێهەم؛ دیسان وەڵامی خاڵی یەکەم بەسیەتی.
- بۆ خاڵی چوارەم؛ ئەمیش، لەپێشەوەدا، رونمکردۆتەوە کە ناکرێ لە دۆخێکی وەکو ئەو رۆژگارەدا، هیچ کێشەیەك لەنێوانماندا نەبێ. بەڵکو جاری واش هەبووە، رەخنەشمان لەیەك هەبووە. هەڵشمان بەرامبەر یەکتر کردووە.
- بۆ خاڵی پێنجەم؛ ئیتر لێرە نوسەر، بەرپرسیارێتیەکە دەخاتە ئەستۆی بزوتنەوەو کۆمەڵە پێکەوە، سەبارەت بە کۆکردنەوەی (عەشایەرو ئاغاو کوێخاو هەمەجۆرە) بەقسەی نوسەر، هەردوولا ئەم سیاسەتەیان هەبووە.

ئەوەی چاکە، نوسەر زوو زوو دەیسەلمێنێ، قسەکانی پەیوەندیەکی ئەوتۆیان پێکەوە نییەو حوکمدانەکانی ئارەزومەندانەیە. هەتا ئێرە، روداوەکانی پێش گەڕانەوەی مام جەلال دەگێڕێتەوە. پێشتر، نوسەر خۆی پەیتا پەیتا بەتوندڕەوی دروستکەری (بنکەی سور)و (البؤرة الثورية) تاوانبارمان دەکات. ئێستا بایداوەتەوەو کۆمەڵەش بە کۆکەرەوەی (عەشایرو ئاغاو کوێخا) تاوانبارە. ئاخر ئەم دوو تۆمەتە کامیان راستە؟

گەر کۆمەڵە، سوربوبێ لەسەر بنکەی سورو لەگەڵ بزوتنەوەدا، لەسەر دوو دیدی جیاوازی شۆڕش، ناکۆك بوبین (وەکو پێشتر وای باسدەکات) ئیتر چۆن چۆنی کۆمەڵە ئەم ستراتیژەی بنکەی سوری گۆڕیوە بە بنکەی (عەشایری

سور)؟ دەبوایە بۆ خوێنەر، ئەم دوو ستراتیژە سەربازییە ناکۆکە، ساغبکاتەوە. بنکەی سوری کرێکاران و جوتیاران و خوێنەواری شۆڕشگێڕ لەکوێ و عەشایەرو ئاغاو کوێخا کۆکردنەوە لەکوێ؟

ڕاستیەکەشی ئەوەیە، ڕاستە، دوو دیدی جیاوازمان لەسەر چۆنایەتی و چەندایەتی شۆڕش هەبوو. هۆیەکەشی ئەوە نەبوو کە شەهید عەلی عەسکەری و د.خالیدو بەشێکی سەرکردایەتی بزوتنەوە، لایەنگری ئاغاو دەرەبەگ بوبن دژی جوتیاران. یان هەولیان دابێ پێچەوانەی ئەو ڕادە ڕیفۆرمەی کشتوکاڵ، ئەرز لە جوتیار وەربگرنەوەو بیدەنەوە ئاغاکان. یان لەگەڵ ئاغاو کوێخادا ڕێك کەوتبن، دوای سەرکەوتنی شۆڕش ئەرزەکانیان بۆ بگێڕنەوە، لەڕاستیا، ئەم مەسەلانە لەئارادا نەبون؛ لەسەر ئەم پرنسیپ و بنچینانەش، لەگەڵ بزوتنەوەدا، ناکۆکیمان نەبووە. بەڵکو هەندێك لە سەرکردەو فەرماندەو ڕابەری سیاسی بزوتنەوە هەبون، لەگەڵ جوتیاراندا، لە هەندێك فەرماندەو پێشمەرگەو ڕابەری سیاسی کۆمەڵە، نەرمتر نەبوبن، قەت ڕەقتر نەبوون.

کێشەی ئێمە لەگەڵ بزوتنەوەدا، کێشەی دوو ڕوانگەی جیاواز بوو بۆ ئامانجی شۆڕشەکە. کۆمەڵە، لەناو خۆشیداو لەگەڵ سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵەشدا، لەسەر ناکۆکی سەرەکی و سروشتی ڕژێم و بەعس، ناکۆکی هەبوو. لەگەڵ بزووتنەوەش، لەناو شۆڕشدا، بەشێوەی جیاوازتر لەوەی ناو کۆمەڵە، ناکۆکیمان هەبوو.

کۆمەڵە.. پێی وابوو، بەعس، ڕژێمێکی شۆڤێنی — فاشی ترسناکە، پێویستە بە شۆڕشی درێژخایەن، بەرە بەرە خەبات بکەین بۆ قوڵکردنی خەباتی شاخ و شار، قوڵکردنەوەی خەباتی گەلی کوردستان و خەڵکی عێراق لەنێوان کرێکاران، ڕەنجدەران، هێزە شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازەکان تێکرا، بۆ ئەم مەبەستەش سەرەڕای ناکۆکی ئایدیۆلۆژیمان لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراق،

سیاسەتمان نەرم بوو بەرامبەریان. بەڵکو پەیامیشمان لەسەر ئەم سیاسەتە پێدەگەیاندن.

بزوتنەوەش، هێشتا لەژێرکاریگەریەکانی رۆژگاری هەرەس‌و دوای هەرەس، شەهید ساڵح یوسفی‌و زۆریان، هەوڵیان دا هەرچی چۆنێك بووە، ماوەیەکی تر لە شاخ پێشمەرگە بهێڵنەوەو فشار بخەنە سەر رژێم، بەڵکو نیمچە گفتوگۆیەك قبوڵ بکات‌و چارەسەری نیوەچڵی بدۆزرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە، شەهید یوسفی، لەدوای رێکەوتنامەی ئازار، بروسکەیەکی بۆ رژێم بەناوی مەکتەبی سیاسی پارتیەوە کردو رژێمیش، بەرەسمی، لە ئیزگەدا، بەناوی (الی ما یسما بالمکتب السیاسي للحزب الدیمقراطی الکردستاني) وەڵامی دانەوە، کە گفتوگۆ لەگەڵ خۆفرۆشان نییە، لێتاندەبورین بگەرێنەوە (الصف الوطني).

ورد نەناسینی شوناسی بەعس، فەلسەفەی سیاسی بەعس، ئایدیۆلۆژیەتی بەعس‌و حوکمڕانی بەعس، لەو کێشانە بوو، هەتا روخانی رژێمی بەعس، لەناو کۆمەڵەو بزوتنەوەو یەکێتیدا، تەنانەت لەناو خودی کۆمەڵەشدا، هەروەها، دوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان لەناو یەکێتی، ماکی ئەو دوو روانگە جیاوازە لەسەر روخاندن‌و نەڕوخاندنی بەعس، لەدوای ئەنفالەکانیش، بەڵکو لەدوای راپەڕینیش، هەر مابوو.

لەداوی ئەنفالەکان، باڵێکی ناو یەکێتی پێی وابوو، جگە لە دۆزینەوەی رێگەیەکی گونجاوی گفتوگۆ، بۆ چارەسەرێکی شیاوی نیوەچڵ، هەلومەرجەکە، بۆ شۆڕشێکی ئەنفال بەسەردا سەپێنراوی پاشەکشەکردوو بۆ سنورەکان، هیچی دیکەی تیا بەستە نابێ. ئەم باڵە کاك نەوشیروان رێدارێژی بوو. باڵەکەی دیکەی ناو یەکێتی، بەتایبەتی دوای داگیرکردنی کوەیت، پێی وا بوو، دەبێ هێزە سیاسیەکان خۆیان رابگرن، چونکە گۆڕانکاری گەورە بەرێوەیە. ئەم باڵە (مام جەلال) نوێنەرایەتی دەکرد.

خۆم، ئەو نامەیەم دیووە کە مام جەلال بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی ناردبووی. (*) داوای لێکردبون شەش مانگی لەسەر بوەستن، ئەگەر روداوی گەورە روینەدا، لە بڕیاردان بۆ مفاوەزات سەرپشك بن. خۆیشی وای نوسیبوو: یان لەگەڵتان دەبم، یان لەدەرەوە دەمێنمەوە.

بۆ مێژووش دەیڵێم: ئەو باڵەی گفتوگۆی لەگەڵ رژێمدا پێ باش بوو؛ لەرێگەی نامەگۆڕینەوە، کەوتبونە گفتوگۆ. رژێم بە زارەکی وەڵامیشی دابونەوە. چەندین نامەیان بۆ کاربەدەستانی رژێم، هەتا دەگاتە سەدام، ناردبوو، بەڵام کە بۆیان دەرکەوتبوو رژێم دەستی بەدەستییان پێدەکات‌و ئامادەی دەستپێشخەریەکی سیاسی شیاو نییە، ئەم باڵەش، لەوە زیاتریان نەرمی نەنواندبوو. ئامادەش نەبون بۆ داخوازی شەخسی، بچنە ژێر فشاری رژێم، یان بکەونە داوی رژێم. بەش بەحاڵی خۆم، هەندێکم لەو نامانەی بۆ رژێم نێردراوون، دیووە. بۆیە ئەم راستیەم بۆ زانینی باشتری راستیەکان، درکاند.

کەوابێ.. روانگەی جیاواز لەسەر رژێم‌و سروشتی فەلسەفی‌و سیاسی رژێم، هاوزای لەدایکبونی یەکێتی، لەناو کۆمەڵە پێش بزوتنەوە، لەناو بزوتنەوە، دوای کۆمەڵە، لەناو یەکێتیش، دوای تواندنەوەی باڵەکانی یەکێتی لەناو بۆتەی یەکێتیدا، هەر هەبووەو درێژەیشی کێشاوە. ئیتر پرۆسەیەکی ئاسایی بووە، ئەم دوو روانگە جیاوازە، لە هەلومەرجی جیاوازدا، ناوبەناو زەق بوبێ‌و تەنانەت قوڵیش کاریگەری هەبوبێ. بەڵام نوسەر بۆئەوەی ئەو مەرامەی هەیەتی، گوایە کۆمیتەی هەرێمەکان کەمئەزمون‌و نەناسراو بون، بۆیە، لەگەڵ بزوتنەوەدا کێشەیان هەبووەو پێکەوە هەڵیاننەکردووە، لەبەر ئەم مەرامە کە گیاکەڵەی

---

* من ئەوکاتە تازە لە زیندانی یەکێتی ئازاد کرابوم‌و ماڵم لە (ورمێ) دا بوو.

رواوی سەر بنجی ڤینەکانێتی، بەردەوام هەوڵدەدات مێش لە کۆمیتەی هەرێمەکان بکاتە گامێش. تەنانەت دەمەقالێ و گرفتی بچوکیش، زەق دەکات و دەیکاتە هۆیەکی جیابونەوە. کە پاشان ئەمە جوانتر دەسەلمێنین.

# بەشە وەڵامی چوارەم

## دوای ٤١ ساڵ ئەزموون، خوێندنەوەیەکی چەقبەستوو!!

١. دۆگماتیزم لە بەرگی نوێدا
٢. سازشی سەدامو هەڵگەڕانەوەی ئەمریکا
٣. جیهانگیری‌و ئاماری بێ سەرچاوە!
٤. فەلسەفەی سیاسی‌و سیاسەتی بێ فەلسەفە
٥. باری بابەتی‌و خۆیی سواو
٦. ئەقڵیەتی پاشڕەو، فەیسبوکی پێشڕەو
٧. مام و نەوشیروان، کێشەی هێزەکان
٨. سەرەتای درزی نێوان نەوشیروان مەلا بەختیار

## ١

# دۆگماتیزم لە بەرگی نوێدا

لە بەشی چوارەمی نوسینەکەیدا کە لە لاپەڕە (١٣٥)وە بۆ لاپەڕە (١٩٣) رێك (٥٨) لاپەڕە دەگرێتەوە، ئەم لاپەڕانەی تێکڕا، لەسەر رووداوەکان پڕکردۆتەوەو هەڵوێستەی لەسەر چەندین ویستگەی گرنگ کردووە، بەحسابی خۆی ویستویەتی دیدێکی نوێچەشن پێشکەش بکات. بەڵام راستیەکەی نوسەر، وەکو کەسێکی دۆگم، رووداوەکانی سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی، دامەزراندنی پارتی (القیادة المؤقتة) هەڵوێستەکانی ئەو هەلومەرجە، چۆنیەتی بەرپابونی شۆڕش، کێشمەکێشەکان.. تاد، بەشێوەیەکی نەشیاوی ئەوتۆ دارشتووە، هەر دەڵێی، تۆزقاڵێك گۆڕانکاری بەسەر بیرکردنەوەی نەهاتووەو هیچ تاقیکردنەوەیەکی نەدیووە.

کەسێك، دوای (٤١) ساڵ ئەزمونی لایەنێکی سیاسی، دوای (٤٠) ساڵیش لە بەرپابونی شۆڕشی گەلەکەی، بەقۆناغی چەشناوچەشنا تێپەڕیونو پڕن لە دەرسو پەندی گەوهەردار، پڕن لە سیاسەتو هەڵوێستی گۆڕدراو، پڕن لە سەرکەوتنو شکست، پڕن لە ریزبەندی سیاسیو حیزبی، تەنانەت پڕن لە گۆڕینی ئایدیۆلۆژیەت، فەلسەفە، گۆڕانکاری لە ئامانجی سیاسی لەسەر ئاستی جیهان، ناوچەکە، عێراقو کوردستان، تەنانەت رێکخراوەکەی خۆیشی کە (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ە (٢٣) ساڵە نەماوە. کەسێك لەناو بەشێکی بەرچاوی ئەو رووداوانە بوبێو بیەوێ ئێستا، لەڕوانگەی گۆڕانکاریەکانەوە، ئەو مێژووە پڕ

لە هەورازو نشێوە، پڕ لە گۆڕانو گۆڕانکاریە، بابەتیانە بنوسێ، چۆن دەبێ وەکو سەلەفیەکی چەقبەستوو، لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژگارە هەڵبداتەوە؟ چۆن دەبێ هەروەکو هیچ لە سیاسەتی حیزبەکەیو سیاسەتی حیزبەکان، نەگۆڕابێ، ڕوداوەکان کوتومت وەکو خۆیان بگوازێتەوە، بەبێ ئەوەی سەرنج بداتە گۆڕانکاریو هەڵەو هەڵوێستە جیاوازەکان.. تاد.

دڵنیام، بەم کورتە وەڵامەی بەندە، بۆ بەشی چوارەم لەسەر ئەو دیاردەو دەرکەوتانە، تەنها دەتوانم مەڵۆیەك لە خەرمانی ئەو ڕۆژگارە هەڵبگرمو بیکەمە نمونەی ئەم وەڵامە بۆ ئەو خوێنەرانەی، باسی بابەتیو لێکدانەوەی زانستییان لا گرنگە. نەك لەژێر پەردەی دڵسۆزیدا، وەکو دۆگماتیستێك پەرەگرافی ئەم کتێبو ئەو نوسەر بکەمە گوڵە ژاکاوەکانی چەپکە سیسەکەی ئەم جۆرە نوسینەی گوایە مێژووی کۆمەڵەی پێ نوسراوەتەوە.

ئەم بەشەی بەناونیشانی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کۆمەڵە) نوسیووە. تایتڵێکی لاوەکیشی بەناوی (شۆڕشی نوێو بارودۆخی ئەوسای عێراق) بۆ کردۆتە سەرەتای باسکردنەکەی لەسەر ئەو دۆخە.

خوێنەر، کە ئەو ناونیشانو تایتڵە دەخوێنێتەوە، وای بەبیردا دێ، دوای (٤١) ساڵ تاقیکردنەوە، دوای ئەو هەموو گۆڕانکاریانەو زانینی ڕاستیەکان، گۆڕینی سیاسەتی جیهانیو ئاڵوگۆڕەکانی تری ناوچەکەو عێراق، خوێنەر وا چاوەڕوانە نوسەر لەم کاتەدا کە ئەم کتێبەی نوسیووە، بە میتۆدێکی نوێو دەیان بەڵگەنامەو لێکدانەوەی بابەتی، ئەنجامی ئەوتۆ دەداتە خوێنەر، پێشتر نوسەری دیکە توخنێ نەکەوتبێ. کە بەداخەوە وای نەکردووە. لە هەموو ئەو لاپەڕانەی نوسیونی، بۆ جارێکیش بۆچونێکی نوێچەشنی دەرنەبڕیووە کە خوێنەر سودی لێوەربگرێ. ئەمە، لەسەردەمی جیهانگیریدا، کە سەردەمێکە، دەمێکە، قسە لەسەر تیۆری نوێو فەلسەفەی نوێی نوسینی مێژووی تیا دەکرێ. هەتا

هاتوشه، ئەم مشتومڕانە لەسەر مێژوو، تەنانەت لەسەر (کۆتایی مێژوو)ش قوڵتر کراوون. لە هەفتاکانەوە گوتراوە:

گیانی سەردەم ئاماژەگەلێکی لە دەربڕیندا بۆ خۆپارێزی لە خودی خۆی نیشاندەدات؛ وەکو نمونە ئاماژە بکرێ؛ بۆ کۆمەڵی دوای نوێگەری، دوای پیشەسازی، یان دوای شۆڕش.

هەروەها دەگوترێ: لێرەولەوێ ژمارەیەکی زۆری گوتارو تێبینی توێژینەوە دەکرێو رایدەگەیەنن کە مێژوو کۆتایی هات. (*)

لەدوای هەرەسی رۆژهەڵاتی ئۆروپا، جارێکی دیکە، لەلایەن بیرمەندی ئەمریکیەوە (فۆکۆیاما) باسی کۆتایی مێژوو بەماناو چەمکی قفڵدانی مێژوو لەلایەن فەلسەفەی لیبرالیزمەوە هێنرایەوە ئاراو جەنجاڵییەکی تیۆریو سیاسی بێڕادەشی وروژاند. گەرچی ئەم تێزە، سەرنەکەوت، بەڵام نوسینو خوێندنەوەی مێژوو، لە پێوەرە کلاسیکیەکەی رزگارکراوەو ئێستا، رووداوەکانی مێژوو، وەکو رووداوی دابڕاو لە رووداو، ناخوێنرێتەوە. بەڵکو رووداوەکان، لەناو پرۆسەیەکی کارلێکی (تفاعل) بەردەوام دەخوێنرێنەوەو هەوڵدەدرێ رەگەزە هاوبەشەکانی رووداوەکان، لەهەموو بارێکەوە، زۆر بن یان کەم، ئابوری بن یان کۆمەڵایەتی، یاخود کولتوری، یا ئاینیو مەزهەبی، جوگرافی، تەنانەت شەخسیو سایکۆلۆژیش، کاریگەری کەموزۆریان دەدۆزرێتەوەو دەخوێنرێتەوەو پەیوەندیەکانیان دیاری دەکرێ.

ئەو راستیانە، یان خوێندنەوەی رووداوەکانی مێژوو، هەزاران نمونەی لەقوڵایی مێژوودا هەیە، کە کارلێك دەکەنو رەگەزەکانیان، لەبنەوە لێکدەئاڵێن.

---

* مابعد التأريخ هل انتهى التأريخ؟ - دار المدى للثقافة والنشر / لوتز نيتهامر/ ترجمة: فاضل جتكر/ الطبعة الاولى ١٩٩٥. ص(٧).

لەمێژووی نەتەوەکەیشماندا، بەرۆشنی ئەمە دەخوێنرێتەوە. هیچ راپەڕینێکی سەدەکانی هەژدەو نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمیش، لە ژینگەو رەهەندە سیاسیەکانی پتر لە دوو سەدەی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دانبڕێن. کە ئیمپراتۆرەکەش روخا، لەهەموو بەشێکی کوردستاندا، هەمان ئەو رەگەزە نەتەوەیی‌و سیاسیەکانی نەتەوەکەمان بون، لە زەمان‌و زەمینەی تردا، بە گەوهەرو رەنگی جیاوازەوە، سەریانهەڵدایەوە. تا ئێستاش بەردەوامن.

لەجیهانیشدا سەدان روداوی گەورەی جیهانهەژێن هەن، داینەمۆ ئابوریەکان خولڤاندویانەو سەپاندویانەو درێژەشیان داوەتێ. لەمەشەوە دەتوانین بڵێین: رایەڵەی بینراو و نەبینراوی پێکەوەبەستنی روداوەکانی مێژوو، زۆر گرنگە، چ لەسەر ئاستی جیهان‌و چ لەسەر ئاستی ناوچەو ناوخۆدا، ببینرێنەوەو بخوێنرێنەوەو دەرس‌و پەندەکانیشی دیاری بکرێن. نەك روداوەکانی مێژوو، بلۆکبەندی بکرێ‌و بەبێ دەستکاری، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر بگوازرێتەوە.

نوسەری (چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە) روداوەکانی کوردستانی لەشێوە بلۆکی جیاوازدا بینیوەو هەوڵیداوە، بۆ نەوەی ئێستایان بگوازێتەوە. بەبێ دۆزینەوەی رەگەزی نوێ‌و خوێندنەوەی نوێ‌و بەرەنجامی بابەتیی نوێ.

کاتێك باسی سیاسەتی رژێم دوای رێکەوتننامەی ئازاری (١٩٧٥) دەکات، هەروەکو بەعس، لەم جیهانەو لەم رۆژهەڵاتەدا، بەئارەزوو حوکمی کردبێ‌و بەشێك نەبوبێ، لەم دونیایە. لە لاپەڕە (١٣٥)دا ئاوا باسی رژێمی بەعس، لەبارودۆخی ئەوسای عێراقدا دەکات:

" حکومەتی عێراقی لەوپەڕی وورەبەرزی‌و لوت بەرزی مەستی سەرکەوتنەکەی بەسەر شۆڕشی ئەیلول‌و خەباتی چەکداری گەلی کورد دا بوو، سەبارەت بەو لەبەر داهێنانەی (تنازل)یە، بەرامبەر شای ئێران لە رێکەوتنەکەی

جەزائیردا لەپێناو هەڵتەکاندنی شۆڕشی کورد، لەهەنگاونان‌دا بوو، بۆ پتر خۆ بەهێزکردن‌و پڕچەك کردن بەوهیوایەی، کە لەئاینده لەو پەیمانەش پاشگەزبێتەوەو ئەو ناوچانەی لە ڕێکەوتنەکەدا دابووی بە ئێران داگیری کاتەوە."

ئەمە تەنها گێڕانەوەی ڕوداوەکانە، وەکو وایە بە ئاگر بڵێی ئاگری گەرم. نوسەر هاتووە باسی سیاسەتی بەعس دەکات. بەڵام ئەم سیاسەتە، لەو بارودۆخە، نابەستێتەوە بەو ئاڵوگۆڕە جیهانیەی هەبووە. کاریگەری ئەو ئاڵوگۆڕەشی لەسەر سیاسەتی بەعس باس ناکات.

ڕژێم، دوای ئەوەی زانی بە هێرشی عەسکەری بەسەر شۆڕشی ئەیلولدا سەرناکەوێ، بارودۆخەکەی دوا چارەکە سەدەی جەنگی ساردی بەوردی لێکدابوەوەو لەنێوان دوو جەمسەرەکەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتی جیهاندا (ئەمریکاو سۆڤیەت) باش گەمەی سیاسی دەکرد. لەناو دەوڵەتانی عەرەبیشدا، بەناوی بەرگری لە عەرەب‌و عروبە، خەریکی تەراتێن بوو. لەلایەکەوە، لەرێگەی پەیمانی دۆستایەتی عێراقی — شورەویدا، پەیوەندیەکی ستراتیژی لەگەڵ شورەوی مۆرکردبوو. بەمەش پەیمانی وارشۆیشی دابینکردبوو. لەرێگەی فەرەنساو ئەڵمانیاو بریتانیاشەوە، هەتاڕادەیەك دۆستایەتی ڕۆژئاوایشی دابینکردبوو. مابوەوە ئەمریکاو دۆستەکانی. ئەوکاتە، پەیوەندیەکی باش لەنێوان عێراق‌و دەوڵەتانی عەرەبی لە کەنداودا (سعودیە، کوەیت، بەحرەین، ئیمارات.. تاد) هەبوو. بەڵام هەم ئەم دەوڵەتانە لە سەدام‌و بەعس دەترسان، چونکە سەدام‌و حیزبەکەی، خۆیان بە میراتگری بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی‌و دوارۆژی یەکێتی عەرەب دەزانی. هەم ئەمریکاش، مەترسیەکی گەورەی لەسەر سیاسەتی ناسیۆنالیزمی بەعسی دوای ڕێکەوتنامەی کامپ دیڤید لەسەر

ئیسرائیلو ئێران هەبوو. بەتایبەتی بەعسی سورییش، کێشەی گەورەیان لەگەڵ ئەمریکاو ئیسرائیلدا هەبوو. هەروەها لەتەك دەوڵەتانی عەرەبی لە کەنداودا. هاوکێشەی سیاسیو عەسکەریو ئەمنیەکەش، دوای سێ جەنگی گەورەی نێوان ئیسرائیلو عەرەب (١٩٤٨) و (١٩٦٧) و (١٩٧٣)، هەتاڕادەیەکی باش، لەبەرژەوەندی ئیسرائیل شکابووەوە.

- جەنگی (١٩٤٨) بە جەنگی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەلایەن جولەکەوە دەناسرێ کە سەرەنجامی (٦٣٠٠) کوژراو، دەوڵەتی ئیسرائیلیان ڕاگەیاندو ئەمریکا، سەرەڕای ئەوەی دوای تەنها (١٤) دەقیقە دانی بە دەوڵەتی ڕاگەیەندراودا نا، بەڵام ئامادەنەبوو بچوکترین هاوکاری جولەکە بکات. چونکە لەبەرامبەر شورەویدا، دەترسا، وڵاتانی عەرەبی لەدەستبچێ.
- جەنگی (حوزەیرانی ١٩٦٧) کە لە سێ سەعاتی یەکەمدا هێزی ئاسمانی میسریان تێکوپێك دا. دوای شەش ڕۆژیش، بەسەر (میسر، ئوردنو سوریا)دا سەرکەوتن؛ بیابانی سیناو کەرتی غەزەیان لە میسر، ڕۆخی ڕۆژئاوایان لە ئوردن؛ بەرزاییەکانی جولانیان لە سوریا داگیرکرد. بەم سەرکەوتنەش، نەتەوەی عەرەبیان ئابڵەق کرد.
- جەنگی (تشرینی — ١٩٧٣) لە پیرۆزترین ڕۆژی جولەکەدا کە پێی دەڵێن (ڕۆژی کیبور= جەژنی لێبوردن) ئیسرائیل لەناکاودا، دوچاری هێرشێکی عەسکەری ستراتیژی چاوەڕوانەکراو هاتو تەواوی حساباتی عەسکەری ئیسرائیلی هەڵگێڕایەوە. چونکە، جولەکە پێیانوابووە، دوای سەرکەوتنی جەنگی حوزەیرانی (١٩٦٧) عەرەب ڕێگای سەرکەوتنی عەسکەریان لەبەردەمدا، نەما. گەر هێرشیش بکەن، ئیسرائیلیەکان وایاندەزانی

دەستبەجێ دەتوانن بەرپەرچی بدەنەوەو سەریش بکەونەوە. ئەم باوەڕە مایەپوچ دەرچوو. تیایدا ئیسرائیل (٣ هەزار) کوژراوی دا.

بەرنامەشیان هەبوو، بەرە بەرە، وڵاتە میانڕەوەکان، یان خۆپارێزەکانی عەرەبو ئیسرائیل ئاشتبکەنەوە. زۆرتریش لەسەر میسر کاریان دەکرد. چونکە دوای جەنگی تشرینی (١٩٧٣) و سەرکەوتنی میسر بەسەر هێڵی (بارلیف)دا شارەزا عەسکەریەکان، چۆن دوای سەرکەوتنی ئیسرائیل لە جەنگی (١٩٦٧)دا پێیانوابوو، ئیسرائیل لەوەزیاتر ناتوانێ پەلاماری عەرەب بدات. چونکە چەکی نەوت هاتبۆوە ئاراوە. دوای جەنگی (١٩٧٣)یش، لەوباوەڕەدا بون، کە ئەو سەرکەوتنە، دوا سەرکەوتنی ستراتیژی میسرو عەرەبە بەسەر بەشێکی شەڕگەکانی ئیسرائیل. لەوەبەدواوە، هێڵی سورە. واتا: دەگاتە بەکارهێنانی چەکی کوشندەی قەدەغەکراو، کە ئیسرائیل ئەوساو ئێستاش، بۆ دوابەرگری لەخۆی ئامادەیە بەکاری بێنێ. بەمەش، لێکۆڵەران پێیانوابوو، ئەمریکاو رۆژئاوا تێکڕا، ناتوانن رێگە بە ئیسرائیل بدەن کاردانەوەی عەرەب بگەیەننە رادەیەك هەناردەی نەوت رابگرن. عەرەبیش ناتوانێ لەوەزیاتر بونو ئاسایشی ئیسرائیل بخاتە مەترسیەوە. هەربۆیە، دانوستاندن لەنێوان عەرەبو ئیسرائیل هاتەئاراوە، میسر رچەی شکاندو لەگەڵ دوژمنە دێرینەکەی عەرەب رێککەوت. فەلەستینیەکانیش هەروا. سوریاش کەوتە گفتوگۆ. ئوردنیش پەیمانی لەگەڵ ئیسرائیل بەست.

## ٢

## سازشی سەدامو هەڵگەڕانەوەی ئەمریکا

بەعسو سەدام، لەو بارودۆخەدا، بەوردی رووداوەکانیان خوێندبووەوەو دەیانزانی وڵاتانی عەرەبی جارێکی دیکە، توخنی جەنگی گەورە ناکەوون. چونکە هێڵە ئاگراویەکان بۆ ئیسرائیل، میسر، سوریا، فەلەستینیەکانو ئوردن، کێشرابونو هیچ لایەکیان نەیاندەتوانی، چیکە خۆیان لەناو ئەو هێڵانەدا بسوتێنن. بەتایبەتی عێراق وڵاتێکی گرنگی کۆمکاری عەرەبیو کاراش بوو لە کۆبونەوەکانی لوتکەی سەرۆکەکانی عەرەبدا. سەدام دەیزانی کۆبونەوەکانی لوتکە بەشێنەیی، خزاونەتە بنبەستی سیاسی – عەسکەری. دەشیزانی کە گفتوگۆی ئەمریکاو میسر، بەسەرپەرشتی کیسنجەر، چۆتەپێشەوەو ئاکام:

عەسکەرییە میسریو ئیسرائیلیەکان دوای جەنگ کەوتنە گفتوگۆ. گفتوگۆکانیش زنجیرەیەك رێکەوتنی بۆ لێك دورخستنەوەی لێکەوتەوە. دوو رێکەوتن لەنێوان میسرو ئیسرائیل ساڵانی (١٩٧٤ – ١٩٧٥) کیسنجەر ناوبژیکەر بوو، گەیشتە کشانەوەی ئیسرائیل (نیوەی بیابانی سینا). هەروەها بۆ لێك دورخستنەوەی سەربازی ئیسرائیلو سوریاش کیسنجەر کەوتەکار. کە

ئەنجامەکەی وا کەوتەوە ئیسرائیل بۆ مەودای (٢٥ کم) لە پایتەختی سوریا دوربکەوێتەوە.[*]

میسر، دوای جەنگی (١٩٧٣) کەوتە پاشەکشە لە بڕیارە هاوبەشەکانی کۆنگرەکانی سەرۆکەکانی عەرەب. لە شەشەمین کۆنگرەی جەزائیرەوە (ئۆکتۆبەری ١٩٧٣) هەروەها حەوتەمین کۆنگرەی (ئۆکتۆبەری ١٩٧٤). هەتا دەگاتە ئەوەی میسر ڕێکەوتنی دووەمی لێکدابڕینی هێزەکانی لە (سینا) ساڵی (١٩٧٥) مۆرکرد.[+]

پەیوەند بە پێشینەی ئەو بارودۆخە، کە ئیتر ئەمریکا لەسەرەتای جەنگی ساردەوە، پێگەی بریتانیاو فەرەنسا لێژ دەکات، هەژمونگەری خۆی بەسەر ڕۆژهەڵاتو کەنداودا دەسەپێنێتو دەبێتە زلهێزێکی بێهاوتای جیهان، بۆ بینینی ئەم پانۆراما جیهانییە نوێیەش، با دیقەت لەم راستیەی خوارەوە بدەینو بزانین رەگەزی ئەم زلهێزیەی ئەمریکا، بۆ کەی شۆڕبۆتەوە:

سەرۆکی ئەمریکا (ترومان) دوو هەفتە دوای راگەیاندنی سەرەنجامی سەرۆکایەتی ئەمریکا کە تیایدا ساڵی (١٩٥٢) (ئایزنهاوەر)ی کاندیدی پارتی کۆماری لە ((ئەدلای ستیفنسون)) ی کاندیدی دیموکراتەکانی بردەوە، ترومان ئایزنهاوەر لەکۆشکی سپی دەبینیو لە یاداشتەکەیدا، دەنوسێ:

"ئیك ئایزنهاوەرم بۆ کۆشکی سپی بانگێشت کرد. ویستم حاڵەتی گشتیو ئاراستە سیاسیەکانی خۆمانی لەجیهاندا بۆ رونبکەمەوە، ئەو نهێنیانەی بۆئەوەی کاتێك دێتە ناو کۆشکی سپی بۆ دەسەڵاتدارێتی پێویست بون بیخەمە بەردەستی.

---

* السلام المفقود – خفايا الصراع حول سلام شرق الاوسط / تأليف: دنيس روس/ ترجمة عمر الايوبي – سامي كعكي. دار الكتاب العربي – بيروت – لبنان- ٢٠٠٥. ص(٥٣)

+ اوسلو والسلام الاخر المتوازن – نايف حواتمة – الاهالي للطباعة والنشر والتوزيع الفلسطينية – الطبعة الاولى. ١٩٩٨. ص(١٣)

ویستیشم بیرۆکەی لەسەر تایبەتمەندیەکانو بەرپرسیاریەتیەکان وەکو سەرۆك پێ بدەم.

(ئیك) زۆر لەو راستیەگەلەی مەسەلەکانی دەزانیو هەوڵمدا بەئەمانەتەوە هەموو شتێکی پێ بڵێم، هەرچی رودەداو، بیرورِای من لەسەریانو ئامۆژگاریەکانم گەر ویستی رەچاویان بکات.

(ئیك) گوێی لێگرتمو واش هاتەبەرچاوم سەرنجم راکێشاوە، سەرەنجام ئاخاوتو گوتی: جەنابی سەرۆك مەسەلەکان بەمشێوەیە نەدەهاتنەبەرچاوم؟

نەمدەزانی سەرۆکی ئەمریکا، ئەم هەموو هێزەی کە پێشتر لە مێژوودا روینەداوە، هەیە.

پێدەچێ دەسەلاتی لەدەسەلاتی ئەسکەندەری گەورە، قەیسەر، جەنگیزخان، ناپلیۆنو لویسی چوارەم لەهەمویان زیاتر بێ." (*)

سەدام، بارودۆخی ئەوسای خوێندبوەوە. دەشیزانی ئەو بارودۆخە چی لە رۆژهەلات دەکاتو چۆن چۆنیش ئەمریکاو رۆژئاوا لە ناوچەکە بالادەست دەبن. دڵنیاش بوو شورەویو چینو رۆژهەلاتی ئۆروپا زیاتریان بۆ عەرەب پێناکرێ. لەسەر فەلەستینو عەرەبیش جەنگی گەورە بەرپاناکەن، بەتایبەتی ئەزمونی کوبای لەبەرچاو بوو، کە سۆڤیەت بەرامبەر بە ئەمریکا لەسەر کێشەی موشەکە ئەتۆمیەکان، پاشەکشەی کرد. بۆیە، لەو بارودۆخەدا، کە تەرازووی هێزەکان، لەبەرژەوەندی عەرەبدا نەبونو پاشاکانی کەنداویش بۆ کێشەی فەلەستینو ململانێکانی عەرەب، خواخوای چارەسەری نیوەچڵیان بوو. لەبەر رۆشنایی ئەم راستیانە، بریاری دا، سازشێکی گەورە بکات هەتا سەرەنجام رژێمەکەی

---

* محمد حسنين هيكل / سنوات الغليان — الجزء الاول — الطبعة الاولى — مركز الاهرام للترجمة والنشر. ١٩٨٨ - ص(١٦٣).

لەدواناکامدا زەرەرمەندی گەورە نەبێت. بەتایبەتی ئەگەر عەرەب لەگەڵ ئەمریکادا بەتەواوەتی رێك بکەوتنایەو ناکۆکیان لەتەك ئیسرائیل چارەسەری بۆ بدۆزرایەتەوە، ئیتر عەرەب‌و ئەمریکاو ئیسرائیل، بەجۆرێکی دیکە بیریان لە گۆڕینی هاوکێشەکان دەکردەوە. لەحاڵەتی واشدا، رژێمی بەعس دەبێ دەستپێشخەریەکی بۆ دەربازبون لە دۆخێکی وای چاوەڕواننەکراو، کردبا. بەتایبەتی هەنگینێ، ئەمریکاو ئیسرائیل‌و ئێران، دژی شۆڕشی کوردستان نەبون. بەڵکو عێراق دەیزانی، چ چەشنە پەیوەندیەکیش، لەنێوان شۆڕشی کوردستان‌و بارزانی‌و ئەو وڵاتانەدا هەیە.

لەبەر رۆشنایی هەڵسەنگاندنی ئەو بارودۆخەدا، سەدام، هەم بۆئەوەی لە رووبەڕووبونەوەی راستەوخۆی (ئەمریکا — ئیسرائیل — ئێران) بەشێوەیەك لەشێوەکان، لەو هەلومەرجەدا، لە هاوکێشە سیاسیە مەترسیدارەکانی جیهان‌و ناوچەکە سنەبارەت بە رژێمەکەی‌و عێراق رزگاری بێ؛ لەم گەمە سیاسیەشەوە، بەڵکو کۆتایی بە شەڕی داسەپێنراوی کوردستانیش بێنێ. بەزۆری ئەو دۆخە سیاسی‌و گەمەکانی بەرژەوەندیخوازی بوو، وایان لێکرد (١٨٠ پلە) لایداو بایدا. رێکەوتنامەی جەزائیری مۆرکردو بە سازشێکی سەدامیانە، کە هەر لەخۆی دەوەشایەوە! شای ئێرانی رازی کردو شای ئێران‌و ئەمریکاو ئیسرائیلیش، هەروەکو نە با یان دیبێ‌و نە باران، تەواوی بەڵێنەکانی خۆیان ژێرپێ خست‌و فشاریان خستە سەر سەرکردایەتی پارتی‌و بارزانی، کۆتایی بە شۆڕشەکە بهێنن. دوای دوو ساڵ، لەم غەدرکردنە، کیسنجەر، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی سەردەمی نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکا، لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ (محمد حسنین

هیکل)دا، دانی پیادەنێ کەوا، سیاسەتێکی بێرەوشتانەیان بەرامبەر کورد هەبووە. کە دەستبەرداری بون.[*]

لێرەدا، ئۆبالّی بنچینەیی‌و یەکەم، لە هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول، زیاتر لە ئیسرائیل‌و ئێران، دەکەوێتە ئەستۆی ئەمریکا. چونکە ئەمریکا ویستبای، چۆن چۆنی لەدوای سێ جەنگی گەورەو داگیرکردنی فەلەستین، جولان‌و بیابانی سیناو دەوروبەری، هەوڵی دەدا کێشەی تەواوی وڵاتانی عەرەبی‌و فەلەستین‌و ئیسرائیل، چارەسەر بکات بەهەوڵێکی کەمتریش، دەیتوانی، شێوە چارەسەرێك بۆ کێشەی کوردیش، بە چارەسەری نیوەناچڵی لەوکاتەدا بدۆزێتەوە. ئەوکاتەش، چەند بۆ فەلەستینیەکان‌و میسرو سوریا عەیب بوو، کێشەکانیان چارەسەر دەکرد. هەر هێندەش بۆ بارزانی‌و سەرکردایەتی پارتی دەبوو بە عەیبە!!

دورونزیك، توخنی ئەم راستیانە کە بۆ ئەو هەلومەرجە، زۆر گرنگ بون، نەکەوتووە. هاتووە، بەدابڕاوی لە هاوکێشە نێودەوڵەتی‌و ناوچەیی‌و ناوخۆییەکە، بەرۆکی بارزانی‌و پارتی دەگرێ‌و دایاندەکوتێ. لە نوسەر وایە، خۆی یەکەمین کەسە، ئەم قسەوباسانە دەکات. لەکاتێکدا مێژووی هەردوولایەن (یەکێتی‌و پارتی) هەتا رێکەوتنامەی واشینتۆن (١٩٨٧) لێوانلێوە لەو چەشنە هێرشانە، بەڵکو زیاتریش.

---

* محمد حسنین هیکل / الحل والحرب. شرکة مطبوعات للتوزیع والنشر. بیروت- لبنان. الطبعة الاولی ١٩٧٧. ص(١٣٨-١٣٩).

## ٣

# جیهانگیریو ئاماری بێ سەرچاوە!

لەدرێژەی نوسینەکەیدا، نوسەر هەوڵدەدات بەلای باسی زانستی دایشکێنیو توانای چەكو بەرزبونەوەی داهاتی ئەو دۆخەی دوای هەرەس، باسدەکات. برێك ئامارو داهاتی نەوتی عێراق، چەکی قورسو ژمارەی سەربازو بودجەی سەربازی دەنوسێ. بەڵام بەهەڵە ئەم هەوڵە تێدەپەڕێنێ. لەبەرئەوەی کاری سەرەکی نوسینەکەی پەلاماردانی کۆمیتەی هەرێمەکانو داتاشینی سەدان بوختانو هۆنینەوەیە، بۆیە، کە دێتە سەر باسی زانستی، رەچاوی بنچینەکانی ئەم جۆرە باسە ناکات. لە دوو شوێندا، لە لاپەڕە (١٣٦)دا بەم شێوە هەڕەمەکییە باسی ئاماری سوپای عێراق دەکات:

" لەگەڵ بوونی یەك فەیلەق سەربازی پێکهاتوو لە (١٠) فرقە سەرباز لە پارێزگاکانی دهۆكو هەولێرو سلێمانیو کەرکوكو دابەشبونیان بەسەر ناوچە جیاجیاکاندا، هێشتا رژێمی عێراقی بۆ پڕکردنی سوپایەکەی لە کوردستانو حکومکردنی هێزە چەکدارەکەی، ژمارەکەی دەگەیشتە ١١٠ هەزار سەرباز. جگە لە چەکدارەکانی پۆلیسو ئەمنو مخابەرات، لەمانگی٣/١٩٧٣دا، ئیسماعیل تایەر ئەلنعێمی، دەکرێ بە سەرۆکی ئەو فەیلەقە."

ئەوە یەکەم ئاماژەپێدانی ئاماری سوپای عێراقە، ساڵی (١٩٧٣). ئەم ئامارەی لەکوێ هێناوە؟ چۆن بە ژمارە دەڵێ (١٠) فرقەی سەربازی لە

پارێزگاكانی كوردستان دانراوون؟ چۆن زانیویەتی ژمارەیان (١١٠ هەزار) سەرباز بووە؟ ئەمانە هەموو لەكاتی باسی زانستیدا، پرسیارنو پێویستیان بەوەیە بەدیقەت نوسەر، ئاماژە بە سەرچاوە بكات. سەرچاوەش، تەنها ناوی نوسەرو كتێب نییە، بەڵكو ساڵی چاپ، كام چاپ، چ چاپخانەیەكو لەكوێ چاپكراوە، ئەمانە دەبێ هەموو بنوسرێن. بەڵام نوسەر گوێی نەداوەتێو هاتووە دوو ژمارەی نوسیوەو لێیگەڕاوە بۆ خوێنەر بەدوای سەرچاوەكاندا بگەڕێن. لەمەیان لێیدەبورین، پاساویشی بۆ دێنینەوە كە با بڵێین: لەبەرئەوەی تەنها دوو ئامارو ئاماژەیە، بۆیە نوسەر خۆیو خوێنەری بە سەرچاوەوە خەریك نەكردووە. لە لاپەڕە (١٣٧)دا ئەم ئامارانەی خوارەوە چی لێبكەین؟:

" رژێمی عێراقی لە رووی سوپاییەوە، خاوەن سوپایەكی یەجگار زۆر رووپۆشتە و تەیار بە چەكو تەقەمەنیو خاوەن ئەزموونی چەند ساڵەی شەڕی كورد بوو.

خاوەنی پتر لە ٢٠٠ كۆپتەرو ٤٥٠ فڕۆكەی جەنگی بوو، خاوەنی پتر لە ٢٠٠٠ تانك ١٠٠٠ تۆپی جۆراوجۆر بوو. خاوەنی پتر لە ٢٥٠٠ لۆری نەفەربەر بوو."

لەم سەردەمەی جیهانگیریەدا، كە هەرچی ئامارو ئەژمار هەیە، نەك بە كتێب بەڵكو بە كۆمپیوتەرو لەرێگەی ئینتەرنێتەوە، لەكەمترین كاتدا، دێتە بەردەست. نوسەر، گوایە سێ ساڵ خەریكی ئەم كتێبە بووە، كەچی (٣٠ دەقیقە) خۆی بە دۆزینەوەی سەرچاوەكانی ئامار لەناو ئینتەرنێتدا خەریك نەكردووە. ئەو ئامارو ئەژمارەی ئاماژەی پێكردون، تەنها مەزەنەی خۆیەتی. لە هیچ سەرچاوەیەك وەرینەگرتون. یان گەر لە سەرچاوەیەكیش وەریگرتبن، ئاماژەی بە كتێبو نوسەرو لاپەڕەكەی نەكردووە. راستیەكەی، سوپای عێراق، لەو ئامارە پۆشتەو پەرداختر بوو. بەرنامەیان هەبوو، دوای ئەوەش، سوپا زیاتر

پەرە پێبدەن. تێکڕا، ئاماری چەكو بودجەی تەرخانکراوی سوپا، بەمشێوەیەی خوارەوە بوو:

" نیشانەکانی مەسروفاتی عەسکەری

| شمەك | پێوانگ | ٩٧٣ | ٩٧٤ | ٩٧٥ | ٩٧٩ | ٩٨٠ | ڕێژەی ساڵانە ٧٥-٨٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مەسرەفی ساڵانەی عەسکەری | ١ دۆلار * | ١٢١٢ | ١٥٦٦ | ١٦١٤ | ٢٧٧٥ | ٢٠٠٠ | ٨٥,٩ |
| هاوردەی ساڵانەی عەسکەری | ١ دۆلار * | ٦٢٥ | ٦٢٥ | ٦٧٥ | ٢١٠٠ | ٢٢٧٠ | ٢٣٦,٣ |
| ژمارەی هێزە چەکدارەکان | هەزار پیاو | ١٠٥ | ١٠٥ | ١١٠ | ١٥٥ | ٣٨٤ | ٢٤٩,١ |
| پشکی ناوەنجی عەسکەریەك | دینار | ٣٨٠٠ | ٥٠٠٠ | ٤٩٠٠ | ٦٠٠٠ | ٢٦٠٠ | |
| پشکی ناوەنجی هاوڵاتی لە داهاتی نەتەوە | دینار | ١٣٠ | ٢٧٠ | ٣٢٠ | ٨٣٠ | ١١٦٠ | |

بەپێی ئەو خشتەیە، لەساڵی ١٩٧٣ وە کە ئیتر نێوان ڕژێمو شۆڕش دەئاڵۆزاو دیاردەکانی شەڕ بوونەوە دەردەکەوتن، مەسروفاتی ساڵانەی عەسکەری دوو ملیاردو حەوت سەدو هەشت هەزار دۆلار بووەو هاوردەی عەسکەریش ملیاردێكو سێسەدوپەنجا هەزار دۆلار بووە، هەر لەو دوو ساڵەدا، ساڵی ١٩٧٣ پشکی ناوەنجی عەسکەری ساڵانە سێ هەزارو شەش سەدو حەفتا دینار زۆرتر بووە لە هاووڵاتی مەدەنی. ساڵی ١٩٧٤یش چوار هەزارو حەوت سەدو سی دینار زیاتر بووە. (+)

ئەو بودجە عەسکەرییە ئەگەر لەسەر چۆنیەتی زیادکردنی چەکی عێراق بیخەینە ڕێژەی ئەژمارەوە، توانای چەکی هەمەچەشنەی عێراق وای لێدێ کەوا

---

* ١ ملیۆن دۆلار.

+ ١- ڕاپۆرتی ئەنسیتۆی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ساڵی ١٩٨٠ (لندن) ل:٥٦ — ژ:٨.

٢- دەزگای ناوەندی سەرژمێری (حساباتی نەتەوەیی) نامیلکەی سەرژمێری باخەڵ. ١٩٨٢، ل: ٤٥.

تەرازووی هێزی عەسکەری نێوان شۆڕش‌و رژێمدا بەجارێك لاسەنگ‌و لار ببێ. بۆ نموونە، ساڵی ١٩٧٤ — ١٩٧٥، عێراق (٥٤٦) فڕۆکە، (١١١) کۆپتەر، (١٦٠٠) تانك، (٩٠٠) تۆپی قورس، (١٥٠٠) نەفەریەی هەبووە.

ئەو نابەرامبەرییەی نێوان ساڵی کۆتایی شۆڕشی ئەیلوول‌و رژێمدا لەڕووی عەسکەری، بەشەری، پێوەندی جیهانی‌و دیپلۆماسی‌و توانای داهات‌و داراییەوە گەلێك ترسناك بووە‌و دەبوو ساڵانی ١٩٧٠ — ١٩٧٤ سەرکردایەتی شۆڕش حسابی هەمەلایەنەی بە ئەژمار بۆ هەموو جیاوازییەکان بکردایە، لێکیان بدەنەوە‌و لەگەڵ توانای شۆڕش‌و پارتی‌و گەلەکەماندا لەهەموو بارێکەوە بەراوردی بابەتیانەی بکەن ئینجا بڕیاری بەرەنگاری چەکدارانە بدەنەوە." (+)

لەم ئاماژە پێکردنەی ئامارەکاندا، ئیتر نوسەر ناتوانێت، رووداوەکان هەڵگێڕیتەوە‌و بەئارەزووی خۆی تۆمەت هەڵبەستێ. کاتێك کە لێکدانەوە هاتە سەر ئامارو ئەژمار، ئیتر ژمارەو سەرچاوە، حوکم دەدات، نەك نوسەرو تەنانەت نوسەری مێژوویش. کەسێکیش بوێرێ بەئارەزی خۆی ئامار بنوسێ، ئیتر کەسێکی ئاوا دەردەکەوێ چۆنچۆنیش مێژوو دەخوێنێتەوە! حوکمەکانیشی لەسەر ئەو مێژووە چۆن دەشکێتەوە!

ئەمانەتی مێژوویی حوکمی خۆی هەیەو دەشبێ بچینە ناو وردەکارییەکانەوە. هەم بۆ مێژوو، هەم بۆئەوەی خوێنەر بزانێ، نوسەر چی بەناوی کتێبەوە نوسیووەو چۆن چۆنیش بۆ تێپەڕاندنی ئەم باسانە، خوێنەر بە ساویلکە دەزانێ. بۆئەوەی هەمەلایەنەش باسی بکەین، چەند لایەنێکی سیاسەتی بەعس رۆشن دەکەینەوە.

---

+ شۆڕشی کوردستان‌و گۆڕانکاریەکانی سەردەم (خەباتی شاخەکان یان راپەڕینی شارەکان؟) ، مەلا بەختیار ، سوید ، ١٩٩٣ ، لاپەڕە (٢٢٣ — ٢٢٤).

## ٤

# فەلسەفەی سیاسیو سیاسەتی بۆ فەلسەفە

ئاشکرایە کە فەلسەفەی سیاسی هەموو حکومەتێك، بەپێی فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیەتی دەسەڵات، یان دەستووری وڵاتان دادەڕێژرێ. لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا، دەستور بنەمای فەلسەفەی حوکمڕانییە. بەڵکو فەلسەفەی خیتابی سیاسیشە. بەڵام لە وڵاتە دواکەوتووەکان، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتو لەناو دەوڵەتانی عەرەبیدا، حیزبو حاکمەکان، دەستور دەسەپێننو فەلسەفەی حوکمڕانی هەڵدەبژێرن.

بەعس، بە کودەتای ڕەشی (٨/شوباتی ١٩٦٣) هاتنە سەر حوکم. هەر بە گرتنەدەستی حوکم، دەستبەجێ کەوتنە سەپاندنی حکومەتێکی فاشی دواکەوتووانە. بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە، کە سیستەمی فاشیش پێویستی بە سوپایەکی فاشی، دادوەزگای فاشی، دەستوری فاشی، ڕاگەیاندنی فاشی، دەزگاکانو ئابوریەکی فاشیش هەیە. لەو سەردەمەدا، بەعس تەنها لایەنە شۆڤێنیو فاشیەتەکەیان ڕەچاوکردوو بەهۆی دەسەڵاتیشەوە، دەیانویست سیاسەتیان بسەپێننو بچەسپێنن. ئەمەشیان بۆ نەچووەسەر، بۆیە، دوای ساڵێك، بەهۆی هەمان سوپاوە کە کودەتا ڕەشەکەیان کرد، کودەتایان کرایە سەرو سەرنگون کران.

لەم تاقیکردنەوە شکستخواردووە، ئەزمونیان وەرگرتو خۆیان بۆ کودەتایەکی سیستەماکتر سازدەدا. تێگەیشتبون، فاشیەکانی ئیتالیا،

نازیەکانی ئەڵمانیا، ڤلانژستەکانی ئیسپانیا، تەنها بە سەرکوتکردن، ئەو هەموو ساڵە حوکمیان نەکردووە، هەتا نەشبونە خاوەن سیستەمێکی فاشی‌و نازی تەواو، نەیانتوانی پەلاماری دەرەوەی سنورەکانیان بدەن. چونکە پەلاماردانی نیشتمانی گەلان‌و سنوری وڵاتانی تر، خەسڵەتێکی هاوبەشی فاشی‌و نازیەکان بووە.

ساڵی (١٩٦٨) کە هاتنەوە سەر حوکم، هەم ناوچەکەو هەم عێراق، بە کێشەی جۆراوجۆرەوە، ئاوسابوون. کێشەی عێراق‌و ئێرانی زەمانی شا قوڵبوو؛ شۆڕشی فەلەستینی تازە دەستیپێکردبوو (١٩٦٥) کارەساتی حوزەیرانی (١٩٦٧) سەراپا وڵاتانی عرەبی داتەپاندبوو. یەکێتی نەتەوەیی عەرەب هەڵوەشابوەوە. هەژاریەکی زۆرو بێکاریەکی زۆرتر. ئاستی خوێنەواری نزم‌و رێژەی نەخوێنەواری زۆر بەرز. ئەوە دۆخی وڵاتانی عەرەبی بوو.

لەعێراقدا، دۆخی سیاسی خراپ بوو. شەڕی کوردستان بەردەوام بوو، بەبێ ئەوەی لە ئاسۆی سیاسیدا، شێوەی چارەسەر دەرکەوتبێ. بزوتنەوەی کورد بوبووە دوو بەشەوەو شەڕی نەخوازراو لەنێوان هەردوو باڵەکە (جەلالی- مەلایی) هەبوو. تەواوی حیزبە سیاسیەکان قەدەغە بوون. سەندیکاو رێکخراوی دیموکراسی قەدەغە بون. ئازادی رۆژنامەو بیرورا بڤە بوو. داهاتی ساڵانەی هاوڵاتی ساڵی (١٩٦٨) (٩١,١) دینار بووە. بەرە بەرە ساڵی (١٩٧٤) بەرزکراوەتەوە بۆ (٢٦٩,٤) دینار. سەرەنجام بەهۆی بەرزبونەوەی داهاتی نەوتەوە ساڵی (١٩٨١) داهاتی تێکڕایی هاوڵاتی گەیشتۆتە (١٥١٧) دینار.(*) واتا: زیاتر لە (١٥) بەرامبەر. بەعس، پشتئەستور بە داهاتی نەوت‌و هەڵکشانی بەهای نەوت‌و کاریگەریەکانی نەوت لەناوچەکەو جیهاندا، دەیزانی

* بڕوانە: التقرير المركزي للمؤتمر القطري التاسع. حزيران ١٩٨٢. ص(٩٤).

عێراق، وەکو دووەمین وڵاتی خاوەن زۆرترین نەوتی پاشەکەوت (دوای سعودیە) دەتوانێ ببێتە وڵاتێکی بەهێز. بۆیە، ستراتیژێکی حوکمڕانیو سەربازی نوێی دارِشتو کەوتە جێبەجێکردنیشی.

بۆئەوەی ساڵنامەی داهاتی نەوتی عێراق، وردتر، بەپێی نوێترین ئامار بخەینە بەر دیدی خوێنەران. وا چاکە، لەزەمانی پاشایەتیەوە، ئامارەکان بنوسین، هەتا بزانرێ، هەندێك لە جەنگە سەپێنراوەکانی سەر کوردستان، لە قۆناغە جیاوازەکاندا، چ توانایەکی ئابوری لەدواوە بووە؟ چۆنچۆنیش داهاتی عێراق بۆ بودجەی سەربازی تەرخانکراوە؟ هەروەها بۆ جەنگەکانی ناوچەکەش.

لەساڵانی یەکەمی هەڵپەی دۆزینەوەو هەڵگۆزینی نەوتەوە، کە دەکاتە ۱۹۲٥/۳/۱٤ تا دەگاتە ۱٤/ تشرینی دووەمی ۱۹۲۷ کە یەکەمین بیری نەوت لە کەرکوك بە ڕێژەی (٥۰ هەتا ۱۰۰ هەزار بەرمیل) هەڵقوڵا. هەروەها دووەمین چاڵگەی نەوت کە لە خانەقین ۱۹۲٥ بەناوی کۆمپانیای نەوتی خانەقین، دامەزراو نەوتی لێدەرهێنرا، پاشان لە بەسرە لە ۲۲/تەموزی ۱۹۳۸ گرێبەستی پشکنینی نەوت کرا. ساڵی ۱۹٥۰ نەوت لە چاڵگەی زوبێر هەڵگۆزرا. هەتا ئێستاشی لەگەڵ بێت، عێراق یەکێکە لە وڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکانی نەوت، بەڵام بەداخەوە، کەمترینی ئەم داهاتە بۆ ئاوەدانی وڵاتو خۆشگوزەرانی خەڵکەکەی تەرخانکراوە، زۆرترینی ئەم داهاتەش بۆ بودجەی سوپاو جەنگو وێرانکاری کوردستانو ناوچەکە بەکارهێنراوە. بۆئەوەی ئەم راستیەش، وەکو ساڵنامەی گۆڕانکاریەکانی بواری ڕێژەی نەوتو فرۆشتنو بەکارهێنانی، لە مێژووی عێراقدا، بەدیقەت پیشانی خوێنەری بدەین، ئەمەی خوارەوە بەشێکی ئەو ساڵنامەی نەوتی عێراقە:

- سەردەمی پاشایەتیی (١٩٣٠- ١٩٥٠)

(٥٠,٠٠٠ بەرمیل نەوت) هەڵگۆزراوەو لەرێگای کۆمپانیاکانی بریتانیاوە بەنرخی ٢$ بۆ بەرمیلێك (کە دەکاتە ٢٠$ بە بەهای ئەمڕۆ). ئەم ڕێژەیە ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٤) بۆ (١٠٠,٠٠٠ بەرمیل) لە ڕۆژێکدا هەڵکشاوە. پاشان ساڵی (١٩٥٨) بۆ (نیو ملیۆن بەرمیل) لە ڕۆژێکدا. داهاتی کەمی ئەوکاتەی نەوت، سەرەنجامی سیاسەتی چاوچنۆکانەی کۆمپانیاکانی کۆلۆنیالیزم، تەنها بەشی (٩٠٪) خەڵکی دەکرد. (٨١٪) خەڵك دەبوو پشت بە ئابوری خۆبژێوی‌و بەرخۆری (استهلاکی) ببەستن. ئەمە گەلانی عێراقی دوچاری برسێتی‌و کێشەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی قوڵ کردبوو.

- سەردەمی قاسمیی (١٩٥٨- ١٩٦٣)

هەناردەی نەوتی عێراق لەسەردەمی حوکمڕانێتی عەبدولکەریم قاسمدا، بۆ (٧٦٠,٠٠٠ بەرمیل) لەڕۆژێکدا، پەرەی پێدرا. بەنرخی ٢,٩٢$ بۆ بەرمیلێك (کە دەکاتە ٢١,٥٨$ بە بەهای ئەمڕۆ) ئەو ڕێژە نەوتە فرۆشراوەش ساڵانە (٨١٠,٠٠٠,٠٠٠ $) (کە دەکاتە ٥,٩ ملیار$ بەبەهای ئەمڕۆ)، داهاتی بۆ عێراق هەبووە. سەرژمێری دانیشتوانی عێراق گەیشتبووە (٧,٠٠٠,٠٠٠) دانیشتووان. گەر ئەم داهاتە هەموی بۆ گوزەرانی خەڵك تەرخانکرابا، (٢٢,٨٪) دانیشتوانی عێراق سودمەند دەبوون، بەڵام وا نەدەکرا. (٣٠٪) خەڵك لەژێر هێڵی هەژاریەوە بووە. (٤٠٪) داهاتەکە بۆ گوزەرانی خێزانی عێراق تەرخانکراوە. (٧٠٪) بۆ هێزی کڕینی خێزانە عێراقیەکان‌و پرۆژەی بیناسازی‌و بودجەی پڕچەککردنی سوپا، تەرخاندەکرا.

لەسەردەمی عەبدولسەلام‌و عەبدولرەحمان عارفدا، ڕێژەی هەناردەی نەوتی عێراق گەیشتە (١,٥ ملیۆن بەرمیل) لە ڕۆژێکدا، بەڵام ئاماری دانیشتوان

زیادیکرد. توانای خۆبەڕێوەبردنی خەڵك بەهۆی پێشکەوتنی پیشەسازیی جیهانییەوە، بەپێی بەرزبونەوەی نرخی نەوت، لە بازاڕی عێراقدا دابەزی. لەبەر ئەم هۆیانە، دۆخی ئابوریو گوزەرانی خەڵك بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی قاسمیی، خراپتر بوو.

- سەردەمی ئەحمەد حەسەن بەکر (١٩٦٨- ١٩٧٣)

لەم سەردەمەدا، ڕێژەی هەناردەی تێکڕایی (معدل) نەوتی عێراق (١,٥ ملیۆن بەرمیل) لەڕۆژێکدا، بەنرخی ٣,٦٤$ (کە دەکاتە (٢٠,٠١$ بە بەهای ئەمڕۆ) ئەمەش ساڵانە ٢,٠١ ملیار$ داهاتی بۆ عێراق هەبووە (کە دەکاتە ١١,١٦ ملیار $ بە بەهای ئەمڕۆ). سەرژمێری دانیشوانی عێراقیش گەیشتنە (١٠ ملیۆن) کەس. هاوزەمان بەرهەمی خۆبەڕێوەبردنی بازاڕی عێراقی داشکا. ئەمە لەکاتێکدا، حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکر، نیوەی داهاتی نەوتی بۆ (پرۆژەی زیادکردنی توانای بەرهەمی نەوتو کشتوکاڵو پیشەسازی بچوكو تواناسازی کادری هونەریو تەکنیکیو فێرخوازی) تەرخانکردبوو. سەرەڕای ئەمەش (٢٥٪) خەڵکی عێراق لەژێر هێڵی هەژاریدا دەژیان. تێچوی پرۆژەکانی بیناسازی، ئاوەدانی، فێرخوازیو چەکدارکردن (٢٨ ملیار$ بە بەهای ئەمڕۆ) لەو پێنج ساڵەدا تەرخانکراوە.

- دیسان؛ سەردەمی بەکر (١٩٧٣- ١٩٧٩)

ڕێژەی هەناردەی نەوتی عێراق، گەیەندرایە (٢,١٢ ملیۆن بەرمیل) لە ڕۆژێکدا، ئەمە لەکاتێکدا، بەهای نرخی نەوت بەخێراییەکی فراوان بەرزبوەوە بۆ ١٢,٨$ (کە دەکاتە ٤٨,٥٣$ بە بەهای ئەمڕۆ) هاوکات دانیشتوانی عێراق گەیشتنە (١٢ ملیۆن) کەس. بەرهەمی بازاڕی عێراقیش (٥٠٪) دابەزیوە.

ئەمەش بەهۆی پێویستیەکانی خەڵك بۆ کاڵای هاوردەی دەرەوە. بودجەی دەوڵەتی عێراق گەیشتە (١٠,٠٨ ملیار$) (کە دەکاتە ٣٧,٨ ملیار$ بە بەهای ئەمڕۆ). گەر وەکو گریمان هەموو داهاتی نەوت بۆ خەڵك سەرف بکرایە، (٦٥٪) پێویستیەکانی خەڵکی عێراقی دابیندەکرد. بەڵام لەبەرئەوەی بەرهەمی بازاڕی عێراق (٥٠٪) داشکا، هەر لەو ساڵانەدا، ڕێژەی هەژاری (١٠٪) خەڵکی گرتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت نیوەی داهاتی نەوتی عێراق بۆ چەکدارکردنی سوپاو بیناسازیو وەبەرهێنان تەرخانکراوە. واتا: ٣٠ملیار$ لەو ساڵانەدا (کە دەکاتە ١١١ ملیار$ بە بەهای ئەمڕۆ). لەبەرئەوەی لەو ساڵانەدا (٣٠٪)ی لە داهاتی نەوتی بۆ پرچەککردنی سوپای عێراق تەرخاندەکرد (کە دەکاتە ٣ ملیار$ ساڵانە). کەوابێ تەنها (٢ملیار$) بۆ بیناسازیو ئاوەدانی تەرخانکراوە.

- **سەردەمی سەدام (١٩٧٩- ١٩٨٠)**

بێگومان ئەم سەردەمە بە سەردەمێکی ڕەش لە مێژووی عێراقدا لە لێدانی ئۆپۆزسیۆنو شەڕی ڕاگواستنی دێهاتی کوردستانو سەرکوتکردنی ئۆپۆزسیۆنی شیعەو ڕاوەدونانی حیزی شیوعی عێراق ناسراوە. بەڵام بە سەردەمی زێڕینی ئابوری عێراق، بەهۆی بەرزبونەوەی ڕێژەی نەوتو داهاتیەوە دەناسرێت. کە هەناردەی (٣,٢ ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا)ی تێپەڕاند. تێکڕایی نرخی بەرمیلێك ٣١,٢٦$ بوو (کە دەکاتە ٨٦,٨٥$ بە بەهای ئەمڕۆ). ئاستی داهاتی ساڵانەی عێراق گەیشتە ٣٦,٥١$ (کە دەکاتە ١٠٠,٥$ بە بەهای ئەمڕۆ). بە بەراورد لەگەڵ (سەردەمی مالکی لە چەند ساڵی ڕابردوودا) بە ڕەچاوکردنی زیادبونی دانیشتوانی عێراق، داهاتی نەوت، حەوت بەرامبەر زیادی کردووە. دە بەرامبەریش بە بەراورد بە سەردەمی عەللاوی (٢٠٠٤-

٢٠٠٥) زیادی کردووه. هەر لەو ماوەیەدا لە سەردەمی سەدام، سەرەڕای دابەزینی بەرهەمهێنانی بازاڕی عێراق، ئەگەر (٢٠٪) داهاتی نەوت، بۆ خەڵك تەرخانکرابا، بەتەواوەتی هەژاری لەعێراقدا بنەبڕ دەکرد و پشکی خێزانی عێراقی دەگەیاندە ئاستی گوزەرانی خێزانی سوید، هۆڵەندا، نەرویج و دانمارك. دەیشانتوانی ٦٠ ملیار$ ساڵانە (بە نرخی ئەمڕۆ) زێدەیان بۆ بودجەی مەسرەفی دەوڵەت و پڕچەککردنی سوپاو ئاوەدانی و دزیش تەرخانکردبا.

- **دیسان؛ سەردەمی سەدام (١٩٨٠- ١٩٩٠)**

لەم قۆناغەدا، بەهۆی جەنگی (عێراق – ئێران)ەوە، ڕێژەی هەناردەی نەوت بۆ (١,٦٦ ملیۆن بەرمیل) ڕۆژانە، دابەزی. ئەمەش بەهۆی کەمیی بوارەکانی هەناردەی نەوتەوە. هێڵی کەرکوك – تورکیا (٨٠٠,٠٠٠ بەرمیل) دەنێردرا. بەهۆی تەنکەرەوە (٢٠٠,٠٠٠ بەرمیل) ڕۆژانە لەڕێی ئوردنەوە دەنێردرا. لەناوەڕاستی هەشتاکانیش هێڵی سعودیە زیادکراوە ڕۆژانە (٦٠٠,٠٠٠ بەرمیل) دەنێردرا. نرخی بەرمیلی نەوت (٢٣,٣$) بووە (کە دەکاتە ٥٤,٣٠$ بەهای ئێستا). بەهۆی جەنگیشەوە بەرهەمی خۆبەڕێوەبردنی بازاڕی عێراق، زۆر دابەزی، چونکە زۆرینەی دەستی کارو خەڵك سەرقاڵی جەنگ و لەناو کارگەکانی تەکنەلۆژیای جەنگ کاریان دەکرد.

شارزایان پێیانوایە لەساڵانی (١٩٨٠-١٩٩٠)دا عێراق پێویستی بە (٥٦١ملیار$) هەبووە، کە دەکاتە ساڵانە (٥٢ ملیار $). بەڵام داهاتی گشتی نەوتی عێراق لەو ساڵانەدا (١٤٥ ملیار $) بووە. ساڵانە (١٤,٥ ملیار $) دەکات. (٤٠ ملیار $)ی پاشەکەوتی پێش ئەو ساڵانەش هەبووە. بەمەش دەردەکەوێت، ئەوکاتە عێراق (٣٧٦ ملیار $) کەموکەسری لە بودجەدا هەبووە. لەوانە (١٢٠ ملیار $) قەرزی عێراق بووە لە هەشتاکاندا. ئەمەش

کاریگەری کردۆتە سەر گوزەرانی خەڵك، کە توانای بەرخۆری خێزانی عێراقی لە (٣٣٦ ملیار $)وە هەر لەو ساڵانەدا بۆ (٨٠ ملیار $) دابەزیوە. واتا، ساڵانە (٨ ملیار $) لە مەسرەفی خەڵك کەمی کردووە. ئەمەش هەڵاوسانی تێکڕایی ساڵانەي (٢٠٪) بۆ دراوی عێراقی زیادکردوە. ئەمە جگەلەوەی ساڵی ١٩٨٠ دینارێکی عێراقی بەهای (٣,٥$)ی هەبوو. ساڵی ١٩٩٠ دابەزی بۆ (٠,٢$). ئەمەش وایکرد، ساڵی ١٩٨٠ پشکی خێزانی عێراقی ساڵانە لە (٢٩ هەزار $ بە بەهای ئەمڕۆ) ، ساڵی ١٩٩٠ بۆ (١٠٠٠ $) دابەزی.

**- دیسان؛ سەردەمی سەدام (١٩٩١- ٢٠٠٣)**

لەم دوانزە ساڵەدا، تێکڕای هەناردەی نەوتی عێراق، ڕۆژانە لە (ملیۆنێك بەرمیل) کەمتر بوو (٠,٩٨ ملیۆن بەرمیل)، چونکە عێراق ساڵی (١٩٩١- ١٩٩٧) تەنها لەرێگەي ئوردنەوە ئەم نەوتەی دەفرۆشت. بەگشتی نرخی بەرمیلێك نەوت (١٩,٢$) بووە (٢٦$ بە بەهای ئەمڕۆ).

کۆی ئەم هەناردەیە، داهاتی ساڵانەی عێراقی دەگەیاندە (٧,٢٩ ملیار$). لە ساڵانی ئابڵۆقەی ئابوری عێراقدا، داهاتی نەوتی فرۆشراوی عێراق، تێکڕا (١١٠ ملیار$) بووە. لەم داهاتە، قەرەبوی جەنگ‌و خەرجیەکانی سەدامی لێدادەشکێ، عێراق (٤٠ ملیار$)یشی قەرز کردبوو. ئەمە کاریگەریەکی زۆری لەسەر پشکی هاوڵاتی هەبوو و گەیاندییە نزمترین ئاستی بژێوی ژیان، کە دەکاتە (١٠٠$) ساڵانە. سەرەنجام ڕێژەی هەژاری گەیشتە (٩٠٪) خەڵك. (*)

---

* بڕوانە:

١- حسن جمعة الأسدي، رئيس الأتحاد نقابات النفط في العراق (دراسة تحليلية في واقع سياسة النفطية في العراق)، ص(١).

٢- د.نزار احمد. دراسة اقتصادية حول اموال النفط العراقي مابين (١٩٣٠-٢٠١٠). ص(١ -٣).

گەر کەسێك، خوێندنەوەو بەرەنجام ساغکردنەوەی لەو داهاتو ڕێژەو ئامارانە هەبێ، بۆی دەردەکەوێ ڕژێمی بەعسی عێراق، بۆچی جەنگی لەکوردستاندا، لەدژی ئێرانو کوێیت، بەرپاکردووە. هەر بەداهاتی نەوتیش، دەزانێ، ئەم ڕژێمەو ئەو سوپا زەبەلاحەی بە داهاتی بەرزی نەوت پێکیهێنا، چۆن سەرەنجامی جەنگەکانو دابەزینی داهاتی نەوتەوە، سیستەمی بەعسو سوپاکەی داتەپین. سەرەنجام روخاشن. بەتایبەتی عێراق (هەروا وڵاتانی وەکو عێراق) سەرچاوەی سەرەکی خۆبەڕێوەبردنیان، ئێستاش نەوتە. ئەمەش لەسەردەمی جیهانگیریو شۆڕشی زانیاریو تەکنیکیدا، زۆر زیاتر لە سەردەمەکانی تر، کاریگەری خراپی لەسەر ژیانو پێشکەوتنو چارەسەرکردنی کێشە ئابوریو کۆمەڵایەتیەکان هەیە. زانیاریو توێژینەوەی زانستیو ئاستی بەرزی تەکنیك، سەراپا سیستەمو ژیانو کۆمەڵ دەگۆڕێ. وەکو کۆریای باشورو تایوانو ژاپۆن، کە جۆرێك نەوتیان نییە، بەڵام دەیان هەزار ئەقڵی گەورەیان پەروەردە کردووە، کە ئەقڵی ئەوتۆیان تیایە، بەقەد چاڵەنەوتێك، بەرهەمو داهاتی بۆ وڵاتەکەی هەیە. ئێستا خاوەن کۆمپانیاکانی (مایکرۆسۆفت)و (ئەپڵ) زۆر لە خاوەن کۆمپانیا زەبەلاحەکانی نەوتی جیهان دەوڵەمەندترن. ئەوانەی فەیسبوكو یوتوبیان داهێناوە، دەوڵەمەندیەکانیان خەیاڵییە. بۆیە، وڵاتانی لەمەڕ خۆمان، بەکوردستانیشەوە، هەتا پشت بە داهاتی نەوت، بەبێ نەخشەی ستراتیژی زانستی ببەستن، هەرگیز ناگەنە ئاستی باڵای پێشکەوتن. تەنگوچەڵەمەکانیشیان پێ چارەسەرناکرێ.

## ٥

# باری بابەتیو خۆیی سواو

نوسەر، بەئارەزووی خۆی، هەموو جارێك ڕوداوەکان دەگێڕێتەوە. لە(بەشی چوارەم)دا کە لە لاپەڕە (١٣٥) وە بۆ لاپەڕە (٢٠٩) دەگرێتەوە، خۆی خستۆتە ناو بابەتگەلێکی هەمەجۆر، هەر لە هەڵسەنگاندنی دۆخەکەوە، هەتا هێزە سیاسیەکان، ناکۆکیەکان، ڕوداوەکان.. تاد. هەڵدانەوەی سەرجەم ئەو لاپەڕانەش، بەزمانێکی وشك، بە لێکدانەوەی سیاسی سەردەمی خۆیانو هەوڵی هەڵدانەوەی قەتماغەکان، لاپەڕەکانی ڕەشکردۆتەوە. باسکردنەکانی، نە مێژوونوسینەو نە وەکو نوسەرێکی سیاسی خوێندنەوەیەکی زانستی ڕوداوەکانە. خۆی چۆنی مەبەست بووە، ئاوا دایڕشتووە. بەشی زۆری بۆچونەکانیشی، دوبارەو چەند بارە کردنەوەی هەمان بابەتەکانێتی، کە لەسەرەتای ئەم بەناو کتێبەوە دەستیداوەتێ. بۆ نمونە:

نوسەر هەوڵیداوە (بارودۆخی کوردستان لە دەستپێکردنی شۆڕشی نوێ)دا شیبکاتەوە. ئەمە کارێکی چاکە، بەمەرجێ بە چاکی لێکبدرێتەوە. نەك ئەمیش، بشێوێندرێ. لەو بارودۆخەدا باسی (باری خۆیی)و (باری بابەتی) دەکات.

لەبواری (باری خۆیی)دا:

- یەکەم: باسی (ئاشبەتاڵو نەمانی پارتی) دەکات.
- دووەم: لەدایکبونی تازەی یەکێتی.

- سێهەم: هاوپەیمانی حیزبی شیوعی‌و بەعس.
- چوارەم: بڵاوپێکردنی (١٥٠,٠٠٠) پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول.

لەمەوە، لە لاپەڕە (١٣٩)دا ئەم پەرەگرافەی خوارەوە هەڵدەهێنجێ:

" ئەمانە هەمووی گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ رژێمی عێراقی، واتە پارتی بەعس‌و بەرەی یەککگرتوویان لەگەڵ حزبی شیوعی‌و چەند پارتێکی کارتۆنی تری کوردو سوپایەکی چەند سەد هەزاری پڕ لە چەك‌و تفاقی جەنگی، ئەوە دەگەیەنێ کە باری خۆی ئەوسا بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی چەکداری رزگاری نیشتمانی بەهیچ جۆرێك لەبار نەبوو. گەر وورد‌تر بکەوینە لێکۆڵینەوە لەسەر سێکوچکەکەی پێویست لەبارەی باری خۆیی. پارتی پێشڕەو، بەرەی یەککگرتووی گەل، هێزی چەکداری شۆڕش، یان شۆڕشی چەکداری، ئەوە دەبێ باس لە یەکە یەکەیان بکەین."

ئەم پێوەرانەی نوسەر کردونیەتە بنەمای هەڵسەنگاندنی بارودۆخی ئەوسای (باری خۆیی) پێوانەیەکی کلاسیکی باری خۆییە. پێمان سەیرە، نوسەرێکی خۆ بە چەپزان، لەسەر پارتی پێشڕەو، لە کوردستانی دوای هەرەسیش، ئاوەها قسەدەکات. کەسێکی ئاوەها، هەقوایە ئاوڕێکی لە کوبا، نیکاراگوا، فەلەستین، بۆلیڤیا، وڵاتانی ئەفریقیا، تامیلستان‌و گەلێ ئەزمونی دیکە، بدایەتەوە.

ئەو کە دێت حیزب بە حیزب لە کوردستاندا (پارتی- قیادە موەقەتە) (یەکێتی نیشتمانی کوردستان (بزوتنەوەی سۆسیالیست) (کۆمەڵە)و (پاسۆك) لەبواری پارتی پێشڕەودا هەڵدەسەنگێنێ‌و هیچیشیان بە پێشڕەو نازانێ‌و لە لاپەڕە (١٣٩)دا دەڵێ:

" لەپێشدا ئەوەمان روونکردەوە، کە نەك هەر پارتێکی پێشڕەو لەکوردستاندا نەبووە، بەڵکو هەموو ئەو پارتو ڕێکخراوە سیاسیانەی، کە لەپێش ئاشبەتاڵ (گە لە پارتی)و پاش ئاشبەتاڵیش بە پارتیشەوە، نەك هەر هیچ مەرجێکی پارتی پێشڕەویان تێدا نەبوو، بەڵکو مەرجەکانی پارتێکی سیاسیشیان تێدا نەبوو."

نوسەرێك کە ئەمە بۆچونی بێ لەسەر حیزبەکانو هیچیان نەخاتە تەرازوی پارتی پێشڕەوەوە، کە تەرازویەکی کلاسیکییە، بەڵام خۆ دەبوو تایبەتمەندێتی باری خۆیی کوردستانیش لێکبداتەوەو رونیبکاتەوە، کە پارتی پێشڕەو، بە چەمکە لینینیەکەی، لە چ ژینگەیەکی چینایەتیو سیاسی لەدایك دەبێ، بۆچیش، ئەو ژینگە چینایەتیو سیاسییە، لە وڵاتانی رۆژهەڵاتو عێراقو کوردستاندا، نەبووە. ئاکام چۆن چۆنیش، هەم چەمكو هەم چۆنیەتی باری خۆیی، لەم وڵاتانەدا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

گەر شۆڕشگێڕانی فەلەستین، نیکاراگوا، کوباو کوردستان، ئەشکیان بە دیار پارتی پێشڕەوی لینینیەوە بگرتایە، شێر بۆداپیر ئێستاش بۆیان لەدایکنەدەبوو. بەڵام وایان نەکردو پێچەوانەی پێوانە کلاسیکیەکەی پێش مەرجی بونی پارتی پێشڕەو، بۆ شۆڕشو راپەڕین، بەبێ ئەو چەشنە پارتە پێشڕەوە، بە قۆزتنەوەی ژیرانەی (باری بابەتی) لە ئانو کاتی خۆیدا، شۆڕشو راپەڕینیان بەرپاکردو لەقۆناغی رزگاربون، یان روخاندنی دیکتاتۆرەکاندا، سەریشکەوتن. دوای ئەوە نەیانتوانی، سیستەمێکی دیموکراتو سۆسیالیست بونیاد بنێن، ئەمەیان شتێکی دیکەیە.

ئەزمون دەریخست، بۆ وڵاتانی لەمەڕ کوردستان، هێندەی باری بابەتی بۆ بەرەنگاریو شۆڕش گرنگە، بەو ئەندازەیە، بونو نەبونی پارتی پێشڕەو

چارەنوسساز نییە. مێژووی کوردستانیش، پڕە لە روداوی هەڵگیرساندنی شۆڕشی رزگاری، لەباری بابەتیدا، بەبێ بونی پارتی پێشڕەویش. لە سەدەی هەژدەهەم، نۆزدەهەم، هەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش. هیچ مێژوونوس و توێژەرەوەیەکیش هۆی تێکشکانی ئەو راپەڕینانەی لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم، بۆ نەبونی پارتی پێشڕەو، نەگێڕاوەتەوە. چونکە ئەوکاتە، چەمك و باسی پارتی لەوچەشنە، هەر لەئارادا نەبوو.

ئەگەر ئاوڕکێیش، بۆ شۆڕشە دیموکراسیەکانی رۆژئاواو ئەمریکاش بدەینەوە، لە تەواوی ئەو شۆڕشانەدا، تەنها باری بابەتی لەباری ئەو شۆڕشانە، تەنانەت بەبێ پارتێکی ئەزموندیدەش، بەس بون بۆ راپەڕین و بۆ سەرکەوتنیش. لەناو کام شۆڕشی دیموکراسی رۆژئاوادا، ئەوکاتە، قسەوباس لە پارتی پێشڕەوی پۆڵایین، هێنراوەتە ئاراوە. یەك فەیلەسوفی دیموکراسی ئەو سەردەمە (ڤۆلتێر، جان جاك رۆسۆ، دیدرۆ، شۆپینهاوەر، بارکلی، کانت، دیکارت و جۆن لۆك..تاد) دورونزیك باسی پارتی پێشڕەوی نەکردووە. تەنانەت باسی حیزبیشیان نەکردووە. چەمکی پارتی چینایەتی، لەئەدەبیاتی مارکسیستیەوە سەریهەڵداوە. لەسەردەمی لینیندا، خراوەتە چوارچێوەی پۆڵایینەوەو پێوەری حیزبایەتی توندی بۆ دارشتووە، کە سەرەنجام، لەسەر ئەم چەمکە پۆڵایینەش، گەورەترین دووبەرەکی کەوتە ناو سۆسیال — دیموکراتەکان (بلشەفیك و منشەفیك).

دوای (٣٥) سساڵ لە بەرپابونی شۆڕش، تازە تازە دێتە سەر پارتی پێشڕەوی کلاسیکی و رەخنە لە تێکڕای حیزبەکان دەگرێ، چونکە پێشڕەو نەبون!!

نازانین بۆ مێژووی نوێی کوردستانیشی بیردەچێتەوە. دوای روخاندنی کۆماری کوردستان، لە هەردوو دیوی کوردستاندا پارتی و حیزبی دیموکراتی کوردستان هەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی باری بابەتی لەبار نەبووە (١٦) ساڵ گەلی کوردستان چاوەڕوان بوو، هەتا شۆڕشی ئەیلول، لەبارێکی بابەتی کەمتر

خەملیویشدا، بەرپابوو. کەچی هەر سەرۆکی پارتی (بارزانی) لە چلەکاندا، لەبەرئەوەی ژیانی کورد خراپ بووەو ئامادەی بەرەنگاری بووەو ئەم ئامادەییە، لەهەلومەرجی داگیرکراوی کوردستاندا، هاوتای رەخساوی باری بابەتی بووە، بۆیە، بەبێ پارتی پێشڕەو، راپەڕینیشیان کردووە. راستە، ئەم راپەڕینانەو دەیان راپەڕینی چەکداری دیکەش، سەرنەکەوتون، بەڵام هۆیەکەی بۆ نەبونی پارتی پێشڕەو ناگەڕێتەوە. قابیلە ئێستا رەخنە لە میری بۆتان، یان شێخ عوبەیدوڵلای نەهری بگیرێ، لەبەرئەوەی بەبێ پارتی پێشڕەو شۆڕشیان بەرپاکردووە؟ دوای ئەوە، خۆ راگەیاندنی کۆماری مەهابادیش، لەبەر باری بابەتی دامەزرا، نەك لەبەرئەوەی حیزبی تەمەن یەك ساڵەی دیموکرات، بە یەك ساڵ، بوبێتە پارتی پێشڕەو. لەبەر نەبونی پارتی پێشڕەویش کۆمار نەڕوخا، بەڵکو ئەمریکاو بریتانیا، کۆماریان روخاند.

گەر بشمانەوی وردتر لەسەر باری خۆیی‌و بابەتی قسەبکەین. چۆن باری خۆیی‌و پارتی پێشڕەو، پێوانەی نەگۆڕیان نییە. بەهەمان شێوە، باری بابەتیش بنەمای نەگۆڕو یەك زەمان‌و زەمینەی نییە.

شۆڕشی درێژخایەنی چین، باری بابەتی رەخساوی هاوزای باری خۆیی خەملیویشی هەبوو، کەچی چارەکە سەدەیەکی لە پڕنەهامەترین‌و قوربانیبەخشترین دۆخی سیاسی ویست، هەتا سەربکەوێ. بەڵام بارێکی بابەتی وەکو کوبا، بەبێ پارتی پێشڕەویش، شۆڕشی تیا بەرپادەبێ، دوای سێ ساڵ، بە راپەڕینی شارەکان، سەردەکەوێ. لە یونانی دوای دووەمین جەنگی جیهان، پارتی کۆمۆنیستی پێشڕەو رابەرایەتی شۆڕش دەکات، بەڵام هولومەرجی بابەتی لەبار نابێ، ئازایانە دەست لە شۆڕش هەڵدەگرن. لە ئیسپانیاشدا بەهەمان شێوە.

لەناو ئەو ئەزمونانەی جیهان، بارودۆخی دوای هەرەس، دەبێ بەوردی لێکبدرێتەوە. نابێ بە پێوەری کلاسیکی بپێورێ. بەڵکو ناشبێ بە مێژووی راپەڕینی نەتەوەکەشمان، بەراوردبکرێ.

بەدرێژایی مێژوو، لەدوای هەرەسی شۆڕشێکی کوردستان، بەو دەستبەجێیە، باری بابەتی، بۆ هەلومەرجێکی تایبەتی بۆ بەرپاکردنی شۆڕش گونجاو نەبووە. باری بابەتی، بەمانای ئەوەی:

داگیرکەر، ئامادەی چارەسەرکردنی کێشەی گەلەکەمان نەبێ. زۆرینەی خەڵك بە رژێم رازی نەبن. مەترسی تەعریب، تەرحیل، تەهجیرو تەبعیس.. هەڕەشە لە نەمانی نەتەوەکەمان بکەن، لەو چوارچێوەیە، باری بابەتی، لەو هەلومەرجە تایبەتیەی دوای هەرەس، راستە لەبار بووە. بەڵام تایبەتمەندێتی خۆیشی هەبووە. لەهیچ بارێکی بابەتی پێشووی شۆڕشەکانی کوردستانو گەلانی دیکەش نەچووە.

شۆڕشی ئەیلول هەرەس دێنێ. پارتی، وەکو رابەری شۆڕشەکە، دوای سەرۆکی شۆڕشەکە دەکەوون. خامۆشیەکی ترسناك، ناخی خەڵك داگیردەکات. زۆرینەی خەڵك ئامادەی بەرەنگارییەو هیچ کەسو لایەکیش پرکێشی بەرەنگاری ناکات. زۆربەی خەڵك بەناچاری دەگەڕێنەوە، بەڵام چاویان شاخو تفەنگ بەرنادات. رژێم هەڵپەی سەپاندنی نەخشەکانێتیو هەفتەیەکیش وچان نادات. کۆی ئەم هەلومەرجەی کارەساتی هەرەس، ناکاتە کارەساتێکی دابڕاوی رۆژگاری دوای هەرەس. بەڵکو هەرەس لەناخی خەڵکدا، بەبێ پارتی پێشڕەویش، خۆی دەسپێرێتە بەرەنگاریکردنی هەرەسپێهێنانی هەرەس. بەمەش، باری بابەتی شۆڕشی ئەیلول، بەدرێژکراوی دەمێنێتەوە، بەڵام ژینگە سیاسیەکەیو حاڵە دەرونیەکەیو باوەڕە ئایدیۆلۆژیەکەی، گۆڕانکاری قوڵی بەسەردا دێت. دامەزرانی یەکێتی دوای دوو مانگ لە هەرەسو بەرپاکردنی

شۆڕش دوای ساڵێك لەو دامەزراندنە، هەروا سەرهەڵدانی لایەنەکانی تریش، پێویستە لەناو ئەو بارودۆخەو گۆڕانکاریەکاندا بخوێنرێتەوە، نەك لەڕوانگەی پارتی پێشڕەوی کلاسیکیەوە، یان باری بابەتی باووە!

دەریشکەوت، ئەو بارە بابەتیو خۆییە کلاسیگییە، نەك لە کوردستانی دوای هەرەس، بەڵکو لە هەموو جیهاندا، جارێکی تر، نەخرایە ناو قاڵبەکەی لینینو بۆلشەویکەکانەوە.

٦

## ئەقڵیەتی پاشڕەو، ئەپسوکی پێشڕەو

سەیر ئەوەیە، لەکاتێکدا نوسەر، رۆژگاری دوای هەرەس‌و لایەنە سیاسییە تازە سەرهەڵداوەکانی بەو پێوەرانە هەڵدەسەنگێنێ، کە پێی وایە باری (بابەتی)و باری (خۆیی) لێکدەداتەوە، کەچی لەوساوە، لە یەك وڵاتی جیهاندا، بۆ تاقیکردنەوەش، نە ئەو بارە بابەتییە خوڵقاوەو نە ئەو پارتە پێشڕەوەش دامەزراوە. بەڵکو ئەو پارتانەی لەناو ئەو بازنە کۆنەی باری بابەتی‌و باری خۆیی پارتی پێشڕەو، لە وڵاتانی رۆژهەڵات‌و ئاسیاو ئەفریقیاشدا هەڵدەسوڕان. هەتا هاتووە پاشەکشەیان کردووە. هەندێکیشیان، هەر شکستیشیان خواردووە. رەوتە بانچەپەکانی تریش، کە وەکو ئەلتەرناتیفی پارتە پێشڕەوە (مارکسی–لینینی)کان، یان چەپی شۆڕشگێڕی تر، لە چارەکە سەدەی رابوردودا هاتنە سەر شانۆ، ئەمانیش، لەناو هیچ روداوێکی کڵپەسەندوی وڵاتانی دواکەوتودا، نە لەبەرامبەر سیستەمە دیکتاتۆرەکاندا؛ نە لەناو قەیرانی کۆمەڵایەتی‌و دەیان ملیۆن کرێکارو هەژارو برسیدا؛ نە لە راپەڕین‌و خۆپیشاندانەکاندا، کاریگەرییەکی ئەوتۆیان بووە. تەنانەت لەپەراوێزی روداوەکاندا، ساڵانە دەبێ لەکوردستان‌و دەوروبەرماندا، ژمارەی جیابونەوەی ئەم چەپە کلاسیك‌و بانچەپە نوێچەشنانە، لەناو یەکترو دژی یەکتر بژمێرین.

راپەڕین‌و روداوەکانی وڵاتانی عەرەبی‌و رۆژهەڵاتیش دەبینین، لەناو هیچ روداوێکدا، ئەو بازە بابەتییەی نوسەر دەیپێوێ‌و ئەو بوارە پێشڕەوەی دەشێکاتە

پێوەر، دیاردەی وا، نە بە چەشنە کلاسیکیەکەی‌و نە بە شێوە نوێچەشنەکەی، هەستپێناکرێ. لەوەش زیاتر، لەناو راپەڕینەکاندا، راپەڕیوان، چەمکە باوەکانی حیزبایەتیان جێهێشت‌و مۆتەکەی باری بابەتیشیان رەواندەوە. نەوەی نوێی راپەڕین، نە بەدیار پارتی پێشڕەوەوە دۆش دامان‌و نە بەتەمای رەخسانی باری بابەتیشەوە سالّیان ژمارد. نەوەیەکی نوێ، بە چەمکی نوێ، بە روحیەتێکی نوێ، هێندەی تەکنیکی هاوچەرخ پەیوەندیەکانی رێکخستن‌و ئاراستەی دەکردن، دورونزیك ئاگاشیان لەوە نەبووە، حیزبە پێشڕەوەکان لەکام شەقام‌و بارەگادان. یان باری بابەتی لەولاّتەکەیاندا کەی دەخولقێ. ئەم نەوەیە، بەکەمترین تێگەیشتنی سیاسی‌و باوەڕی ئایدیۆلۆژی، بەلاّم بەگیانی بەرزی گۆڕانکاری، پشتئەستوور بە کۆمپیوتەرو یوتوب‌و فەیسبوك، رەوتی مێژوویان، بە راپەڕینی بەردەوام گۆڕی‌و دەشگۆڕن.

دەمێنێتەوە لەم بارەوە، ئەوەش بڵێین: نوسەر سالّەها لەئەڵمانیادا ژیاوە. دەزانین زمانی ئەڵمانی‌و رۆژئاوایی فێرنەبووە. بەلاّم خۆ ژیانی سیاسی‌و سیستەمی ئەڵمانیاو دەوڵەتانی دیکەی دیوەو بیستووە. لە گەرمەی نەمانی جەنگی ساردو سەرهەڵدانی سیستەمی نێوی جیهاندا، روداوەکان دەزانێ. دەشزانێ لەم دوو دەهەیەدا، لە رۆژئاوادا پێشتر، تەواوی چەمکەکان لەسەر مافی مرۆڤ، ئازادی، فیمینیزم، فیدرالیەت، دیموکراسی‌و دەستاودەستکردنی دەسەلاّت، لەناو سەرجەم حیزبەکان. مەرجی خەباتیش لەپێناوی ئەو ئامانجانە، نە باری بابەتییەکەو نە دۆخی خۆییە. تەنهاو تەنها پارتی پێشڕەو، مافی چالاکی سیاسی نییە (پارتی وا هەر نیشە) سەیرتر ئەوەیە، ئێستا پارتی (پاشڕەو) لە پێشەنگی روداوەکانە، نەك پارتی (پێشڕەو). وادیارە مێژوو، بەشێوەیەك لەشێوەکان، جێگۆڕکێی پێکردون. پێشڕەو بۆتە پاشڕەو، پاشڕەویش

بۆتە پێشڕەو. تەنانەت ئێستا، هێندەی باسی کاریگەری تەکنیکو ئابوری‌و ڕێکخراوەکانی (N.G.O) دەکرێ، نیوەی ئەوە باسی ئایدیۆلۆژیەت‌و پارتی پێشڕەو ناکرێ. پارتی پێشڕەو، ئەو پارتانەن کە زادەی ئایدیۆلۆژیەت‌و سیستەمەکانی بەناو کۆمۆنیستی‌و سۆسیالیستین. ئەم پارتانە، حوکمڕانی تۆتالیتاری‌و دژە دیموکراسیان بەرهەمهێنا. جارێکی دیکە، مێژوو ئەم چەمکو ئایدیۆلۆژیانە، ناژێنێتەوە.

هەموو قۆناغو سەردەمێك، گەوهەرێکی هەیە. گەوهەری قۆناغێك لەسەردەمی رابوردوودا، بایەخی ئابوری بوو. گەوهەری سەردەمی پێشوتر، خەباتی کرێکاران‌و دواتر، لە قۆناغێکی تردا، خەباتی گەلان بوو. ئێستا لەسەردەمی جیهانگیریدا، تەکنیك، شۆڕشی زانیاری، ئەو بیروڕاو بەرنامەو ڕێك شۆڕی زانستیانەیان، کە زوو زوو پێکدێن‌و خێراش، کێشە هەنوکەییەکان چارەسەر دەکەن. خەڵك، لەسەردەمی شۆڕشی زانیاریدا، حەوسەڵەی ئەوەیان نەماوە، بەدیار ئایدیۆلۆژیەت‌و ستراتیژیەتی شۆڕشی درێژخایەنەوە ئەشکی مێژوویی بگرن.

گەوهەری شۆڕشی زانیاری خێرای ئەم سەردەمە، ڕەنگە زۆر نەخایەنێ کاریگەرییە کۆمەڵایەتیەکانی دەربکەوێ، دوای ئەم کاریگەرییە کۆمەڵایەتیە، هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بابەتی دەڕەخسێ، ئاکام کاریگەری دەبێ لەسەر سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیەتی نوێباوی گونجاوی گۆڕانکاریە ئابوری‌و تەکنیکی‌و کۆمەڵایەتیەکانی ئاییندە.

ئەوەی نیو سەدە لەمەوبەر، پێشبینی دەکرا: تەکنەلۆژیاو پێشکەوتن، بازاڕەکانی جیهان تێکەڵاو بکات، جیاوازی شارو لادێ کەمبکاتەوە، نەتەوەکان نزیکبخاتەوەو بەرژەوەندیەکان ئاوێتە بکات‌و هەستێکی مرۆیی هاوبەشی جیهانی بخوڵقێنێ، کە ئیتر سەرەتای سەرهەڵدانی نەتەوەیەکی جیهانی

بێنێتەئاراوە، وێدەچێ، بە گواستنەوەی ئابوری، بازاڕی ئازاد، سیاسەت، تەکنیکی جیهانگیری بۆ ڕۆژهەڵاتو گۆڕانکاری لە ژێرخان، پێکهاتەی سیاسی، کۆمەڵایەتی، کولتورو ئازادیەکانی ڕۆژهەڵات، وادیارە، دوای ئەوەی ئەم گۆڕانکاریانە، لە هەزارەی سێهەمدا، لە ڕۆژهەڵاتدا، کاریگەری هەمەلایەنەیان دەردەکەوێ، ئەوسا، ڕۆژئاوا بتوانێ، لەوە دڵنیابێ، پێکڕا بەشەریەت بچنە ناو پرۆسەی (ئابوری- سیاسی- نەتەوەیی) جیهانی. یان جیهانگیریەکی سیستەماتیك. هیچ نەبێ لە قۆناغی یەکەمدا، بۆ چەند دەهەیەك، ئەزمونی یەکگرتنەوەی یەکێتی ئۆروپا دوبارەبکرێتەوە. کە هەموو وڵاتێك وڵاتەو خەسڵەتەکانی نیشتمانیش پارێزراوون، بەڵام لەناو بۆتەی یەکێتی ئۆروپادا.

هەڵبەتە، لەمەشیاندا باکوری جیهان (ڕۆژئاوا) پێشکەوتوەو باشوری جیهانیش (وڵاتانی دواکەوتوو) بەرە بەرە دەکەونە ناو پرۆسەکە. بەڵام دوورنییە، لە دەهە نزیکەکانی ئایندەدا ئەم پرۆسەیە دەستپێبکاتو هەرگیزیش، وەکو سەدەی هەژدەهەمو نۆزدەهەمو بیستەم، دوو- سێ سەدەی گەرەك نییە، هەتا ڕۆژئاوا کاریگەری شارستانیەتی سەرمایەداری لە ڕۆژهەڵاتدا جێبێڵێ. لەم سەردەمەدا، کە گەوهەرەکەی تەکنیكو شۆڕشی زانیارییە، ئەو گۆڕانکاریانە هەر چەند دەهەیەکی پێویستە، ڕۆژهەڵات، یان باشوری جیهان، لەناو پرۆسەی نەتەوەیی جیهانیو جیهانیبونی بەشەریەت، بەچەشنێ بتوێتەوە، لە باشوری جیهاندا، ئەگەر پاشماوەی دواکەوتوش، ڕێژەیەکی بمێنێتەوە، نەتوانێ لە هیچ هەلومەرجێکی نەخوازراودا، پرۆسەی جیهانیبونی بەرژەوەندیە باڵاکانی نەتەوەکان، لە هیچ شوێنێکدا، ڕابگرێ. یان هەڵبگرێ.

## ٧

# مام و نەوشیروان، کێشەی هێزەکان

لەبەرئەوەی پێشتر، باسی کۆمەڵە، بزوتنەوە، یەکێتی، قیادەی موەقەتە، شۆڕش‌و کێشە جۆراوجۆرەکانمان کردووە، بۆیە ناچینەوە سەر ئەو بابەتانەی بە خوێندنەوەیەکی سەرپێیی، بەبێ بەستنەوەی بە هەلومەرج‌و گۆڕانکاریەکان، نوسەر باسی کردونەتەوە. نامانەوێ جارێکی تر باسیان بکەینەوە. لە لاپەڕە (١٩١)دا، دێتە سەر گەڕانەوەی مام جەلال‌و نەوشیروان مستەفا؛ کێشەی نێوان کۆمەڵەو کۆمەڵەو بزوتنەوە، هەندێك بۆچونی هەیە، دەهێنن، بۆچونیان دەربارە دەربڕین. لە لاپەڕە (١٧٩)دا لەچەند دێڕێکدا دەڵێ:

" خدر مەعسوم، کە پاشان لە ناوزەنگ بووە خەتی گشتی، سەبارەت بە هەڵسوکەوتی سالار عزیزو مەلا بەختیار وازی لە کۆمەڵە هێنا."

ئەم قسەیە، کێشەیەکی ئەوتۆ نییە هەتا زۆری لەسەر بڕۆین. بەڵام تەنها بۆ مێژوو، پێویستە زانیاریەکە راست بکەینەوە.

یەکەمین کەس بوم، مام جەلال‌و کاك نەوشیروان‌و هەڤاڵانی ترم لە (١٩٧٧/٧/٢٠) لە گوندی (ماسی رۆ- کە دێیەکە دەکەوێتە دامێنی چیای داڵامپۆ، کە شاخێکە دەکەوێتە گۆشەی باشورو باکورو رۆژهەڵاتی کوردستان) بینی. دوو رۆژ دوای ئەوە، د.خدرو هەڤاڵانی دیکەم، چاوپێکەوت. نە ئەوساو نە دوای ئەوەش، من هەستم بەوە نەکردووە د.خدر ئەندام، یان لایەنگری

کۆمەڵە بوبێ. بەڵام ئەم تێکۆشەرە، یەکێکە لە کەسە پاكو بەخزمەتەکان. پێشمەرگەی رۆژگاری تەنگانە. هەتا شۆڕش پێویستی پێی بوو، چ وەکو پێشمەرگەو چ وەکو پزیشکێك، بەکۆڵەپشتێکی خۆیەوە، درێژەی بە خزمەت دا، یەکەمین پزیشکی مام جەلالو هەموو پێشمەرگەیەکیش بووە. کەسێکی ئاوەها، نەك لەگەڵ منو کاك سالار، بەڵکو نەمبیستووە لەگەڵ کەسی تریش، ساردیی کەوتبێتە نێوانیانەوە. ئیتر نازانم نوسەر، ئەو قسانەی لە کام کەلەبەری رقەبەرایەتی دەرهێناوە؟!

سەبارەت بە یەکەمین چاوپێکەوتنی کاك نەوشیروان، هەر لە گوندی (ماسی رۆ) لە کتێبی (یاخیبون لە مێژوو ۱۹۹۹) رونکردۆتەوەو پێویست بە پیاچونەوە ناکات. بەڵام سەبارەت بەوەی، ئاماژە بە بۆچونێکی نەوشیروان مستەفا دەکات کە لە لاپەڕە (۱۸۰-۱۸۱)دا دەڵێ:

" ئێستا ماندوم لەم هەورازەدا ناتوانم زۆر قسە بکەم، بەڵام هەر ئەوەندەت پێ ئەڵێم: ئێمە: ئەوانەی دەرەوە، لەگەڵ ئەم برادەرانەی ئێرە، هەر ناوەکەمان یەکە، ئەگینا لە هەموو شتێکدا جیاوازین.... بەجێ هێشتنیان لەم کاتەدا عەیبە، ئەگینا هەر لێرەدا پێشنیارم بۆ ئەکردی بە کام رێگادا هاتووی بەهەمان رێگادا بگەڕێنینەوە بۆ دەرەوە".

راستە، کاك نەوشیروان ئەو قسەیەی کردبوو. خۆم لە مام جەلالم چەند جارێك بیستووە، کە ئەوەی پێوتراوە. بەڵام ئەگەر بێتو ئەو قسانە، شیبکەینەوە، ئاخۆ چۆن بکەوێتەوە؟

دوای گەڕانەوەی کاك نەوشیروان، ماوەیەك لەگەڵ هەڤالانی بزوتنەوە دەبێ. کەم کەم پێشمەرگەی کۆمەڵەو کادری کۆمەڵەیش دەبینێ. خۆم لە قەندیل لە شێخ شەرۆ بوم، سەرەتای مانگی (۷)ی ۱۹۷۷ قادر خەباتو چوار پێشمەرگەم

بینی، دوو کلاشینکۆفی یەکلاقیان پێبوو (ئەوە یەکەمین جار بوو کلاشینکۆفی یەکلاق بگاتە کوردستان- یەکلاقیش ناوێکە پێشمەرگە لەم جۆرە کلاشینکۆفەی ناوە). قادر خەبات، نامەیەکی درێژی نەوشیروان مستەفاشی بۆ رەسول مامەند هێنابوو. نامەکە، بەدەستوخەتێکی جوانو کوردیەکی رەوان، نوسرابوو. کۆی دەنگوباس، هەولّو کۆششەکانی ئەوکاتە کە لە سوریا، لەناو تورکیاو لەسەر سنوور، ئەنجامدرابون، بەدەستوخەتێکی جوانو کوردیەکی رەوان، نوسرابوو. لە نامەکەدا، باسی گەڕانەوەی مام جەلال نەکرابوو. ئەمەش نیگەرانی لای کاک رەسولو فەرماندەکانی قەندیل، دروستکرد. چونکە، بڕیار بوو هەتا ئەوکاتە بگەڕێتەوە، ئەمە جگەلەوەی مانگی تەموزی (١٩٧٧) بوو، رژێم هێرشێکی بەربلاوی هێنابووە سەر پێشمەرگە. لەگەڵیشیا هەڵمەتێکی دەرونی فراوانیشی لەناو دێهاتو پێشمەرگەدا بلاوکردبوەوە، ئەو هێزە زۆروبۆرەی، کە بەناوی (خۆپشاندانی چەکدارانە) بۆ فشارخستنە سەر رژێم، هەتا دەرگای گفتوگۆ بۆ کورد بکاتەوە، کۆکرابونەوە. ئەو هێزانە کە بەو ئومێدەوە هاتبون، بەڵکو دوای چەند مانگێك، مفاوەزات بکرێو بەسەربەرزی بگەڕێنەوە، رژێم ئەم حاڵەتەی خوێندبوەوە، بۆیە، هەڵمەتێکی دەرونی فراوانی کردبوو، کە هەرگیز گفتوگۆ لەگەڵ "یاخیبوان"دا ناکات. پەلاماری کەسوکاری پێشمەرگەشی داو سەدان خێزانی خستە زیندانەوە، ئەم هەڵمەتە دەرونییەو پەلاماردانەی کەسوکاری پێشمەرگە، هێزە دوودڵو مفاوەزاتخوازەکانی، لەڕووی دەرونیەوە روخاند. هەشبون لەژێرەوە پەیوەندیان بە رژێمەوە کردبوو، بەئاشکرا پێشمەرگەو سەرەك هۆزەکانیان دەڕوخاند، دوان لەوانە (عەلی کۆ و ئەحمەد کۆ) بون، زمانیان بەد هەڵدەسوڕاو خراپیش باسی مام جەلالو کۆمەڵەیان دەکرد. بایز ئاغاو جەوهەر ئاغاو سەدان پێشمەرگەشیان دلّسارد کردو تەسلیمیان کردنەوە. کەم عەشرەت

هەبوو ئەوكاتە سەرۆكەکەی، یان خەڵکیان بە نوێنەرایەتی عەشرەتەکەیان نەناردبێتە دەرەوە. بەشی زۆری ئەم چەکدارە کاتیانە، کە بۆ مفاوەزات هاتبونە دەرەوە، روخان‌و تەسلیمبونەوە. تیاشیاندا بوو، چوامێر مانەوەو درێژەیان بە خەبات دا. لەوانە: قادری مامەند ئاغا، جەوهەر ئاغا، هەندێك لە کوێخاو ئاغاکانی مەنگوڕ، مەرگە، جاف‌و دۆڵی جافایەتی، شارەزووڕو ناوچەی شلێر.

پێش ئەوەی ئەو هێزانە هەرەسیش بێنن، کێشەوبێشەی زۆریان بۆ شۆڕش‌و یەکێتی هەبوو. وا تێگەیەندرابون، خۆپشاندانی چەکداریە. شۆڕش نییە. مفاوەزات دەکرێ. لەبەرئەوە، ئەمانە هەر تاقمێکیان لەناو هۆزو خێڵی خۆیدا، لە ناوچەی نفوزی عەشرەتەکەیاندا، لەناو لەوەڕگاو پاوانی کوێستانەکانیاندا، خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان، مەڕومالاّت‌و رەشماڵ‌و شوانیان، بەدڵی خۆیان زۆربەیان پاڵیان لێدابوەوە. گوێقوڵاغ بون کەی مفاوەزاتەکە دەستپێبکات. ئەمانە، بەهیچ سەرکردەو فەرماندەیەك، رێکنەدەخران. ئاسان نەبوو بەرنامەی شۆڕشیان لەناودا، جێبەجێ بکرێ. کەمترین هوشیاری سیاسیان لەسەر یەکێتی، شۆڕشی نوێ، ململانێی سیاسی.. تاد، نەبوو. گاڵتەیان بە فرەهێزی‌و دیالۆگ‌و دیموکراسی ناو شۆڕش دەکرد. جگە لە مام جەلال، زۆربەیان کەسیان بە هیچ نەدەزانی.

(هاوینی ١٩٧٧) شەهیدان عەلی عەسکەری‌و رەسول مامەندو سەعدی گچکە، هەروا سەید کاکەو.. منیش لە قەندیل بوین. بەبەرچاوی خۆمانەوە، باش باش دەمانزانی رژێم پەیوەندی بەوانەوە دەکات، شەهید عەلی‌و شەهید رەسول مامەندو ئەوانی تریش، نەیانتوانی هێندەیان رابگرن، هەتا مام جەلال دێتەوە. لەبەرئەوە زۆربەیان تەسلیمبونەوە. ئەمەش سەرەنجامێکی ئاسایی بوو. چونکە، پێکهێنانی هێز بۆ شۆڕشی نوێ، لەو پێکهاتانە، پێش ئەوەی شۆڕشەکە، قۆناغی دەستپێکردن‌و پەرەسەندنی تەواوکردبێ، خۆی گرتبێ، کێشە

سیاسی‌و ئۆرگانیکیەکانی چارەسەرکردبێ، بەکردەوەش شۆڕشەکە دەرکەوتبێ، درێژخلیەنە؛ خۆپشاندانی چەکدارانە نییە، وەکو پێیانگوتراوە؛ دوژمنیش مفاوەزات بەگوێرەی بەرنامەی ئەم شۆڕشە ناکات.. سەرەنجامێکی ئاساییە، ئەو هێزە، دوای ئەوەی هاتنەدەرەوە، خۆپشاندانی چەکدارانەشیان بە زۆری‌و بۆری کرد، بەلاّم دوژمن، دڕتر‌و هارتر بوو، ئیتر ئەم جۆرە هێزانە دەڕوخێن. خراپیش روخان. شەهید ئارام بەمشێوەیەی خوارەوە باسی روخانی ئەو چەکدارانە دەکات:

" ئەگەر دوژمن بە بەزین‌و روخانی هەندێ کەسانی بودەڵەو بەکرێگیراو کە خۆیان بەدەستەوەداوە، وا تێبگات کە گوایە شۆڕشی لاوازو بێهێز کردوەو سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێناوە، ئەوە هەر خۆی گێل ئەکات‌و بەس، ئەگینا ئەو ترسنۆك‌و بەزیوانە هەمیشە بارو کۆسپ بون بەسەر شۆڕشەوە، ئەبوایە زوتر ریزەکانی شۆڕشیان لێ پاك بکرایەوە، بۆیە خۆبەدەستەوەدانی ئەمانە نەك سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ شۆڕش، بگرە بەلاّیەکی زلیش بوو بۆ دوژمنەکەمان." (*)

سەیر ئەوەیە، لەیەکەمین کۆبونەوەی سەرکردایەتی، دوای گەڕانەوەی مام جەلال، لە دۆڵی (گۆستێ- ئابی ١٩٧٧) کاك نەوشیروان لەو کۆبونەوەدا، ئیتر خۆی بەناوی کۆمەڵەوە راگەیاند. کە هاتە سەر هەڵبژاردنی نوێنەری لایەنەکان بۆ سەرکردایەتی، شەهید عەلی عەسکەری (بایز ئاغا)ی وەکو یەکێك لە کاندیدەکانی بزوتنەوە هەڵبژارد. کاك نەوشیروان بەناوی کۆمەڵەوە رەتیکردەوە. شەهید عەلی سووربوو لەسەر دانانی. نەوشیروانیش پێی وت:

(١٩٤٦) لەسەر دانانی ئاغاو دەرەبەگ لە سەرکردایەتیدا، پارتی دووبەرەکی تێکەوت، تازە تازە دوای (٣٠) ساڵ، ئاغا دێننە ناو سەرکردایەتی یەکێتی.

---

* کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان- عێراق (بەشی یەکەم) هەڵبژاردەیەك لە نوسینەکانی شەهید ئارام. نوسینگەی راگەیاندنی چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ.کانونی دووەم ١٩٩٠. ل(٦٢).

شەهید عەلی، هەڵچوو. کاك نەوشیروانیش هەڵچوو. شەهید د.خالیدیش هەروا. مام جەلالیش بەرگری لە کاك نەوشیروان کرد. لەسەر ئەم کێشەیە، کۆبونەوەکە ئەو رۆژە تێکچوو.

بزوتنەوە، هەمویان هەڵسان. کۆمەڵەو مام جەلالو شێخ حسێنی یەزیدی مانەوە. باش باشم لەبیرە مام جەلال گوتی:

برادەران لەگەڵ ئێمە وا دەکەن. ئاخۆ لەگەڵ کۆمەڵە چۆن رەفتاریان کردبێ؟!

نوێنەرانی کۆمەڵە هیچمان نەووت. بەڵکو هەوڵماندا مامو کاك نەوشیروان ئارام بکەینەوە. شێخ حسێن یەزیدی رۆڵێکی جوامێرانەی گێڕا.

سەیرەکە لەوەدایە، ئەم فەرتەنەیە لەسەر "بایز ئاغا" رویدا. کە وەکو سەرەك عەشرەتێکی، سەنگین وەکو باوکی عەباس ئاغا، رێزی هەبوو. مام جەلالیشی زۆر خۆشدەویست. بەڵام کە ئەو هەموو پروپاگەندەیە هەبوو. عەشرەتێکی گەورەشی بەسەراکەوتبوو. گرتنو راوەدوونانیش دەستیپێکردبوو. هەر لەوکاتەدا، عەلی کۆ و ئەحمەد کۆ باییز ئاغایان تەسلیم کردەوەو بەداخیشەوە، لەرێگەی بەغداد لەروداوێکدا، بوو بە قوربانی. دوای ئەم کاندیدکردنە، لەسەر ئاغا، کێشە لەناو بزوتنەوەو کۆمەڵەدا، هەتارادەیەك نەما. چونکە چیکە، کاندیدی وایان بۆ سەرکردایەتی نەبوو.

دەمێنێتەوە بڵێین: خۆبەدەستەوەدانی هۆزەکان، ئۆباڵەکەی زۆرتر لەسەر چۆنیەتی هاندانو هێنانەدەرەوەیان بوو. کەمترین کەسیشیان خیانەتیان کرد.

## ٨

# سەرەتای درزی نێوان نەوشیروان مەلا بەختیار

نەوشیروان مستەفا.. کە ئەو قسانەی لەگەڵ مام جەلالدا کردووە، ئەوکاتە کێشەی سیاسی لەگەڵ کۆمەڵەدا نەبوو. تەنها لەسەر مەسەلە تیۆری‌و ئایدیۆلۆژیەکان، لەناخی خۆیدا، جیاواز بیریدەکردەوە. نەشیدەشاردەوە، کە رۆیشتنی هاورێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵەی بۆ ئێران زۆر پێناخۆشبوو. تەنانەت دەیگوت: بەرنامەکەمان بەهۆی رۆشتنی ئەوانەوە بۆ ئێران‌و تەسلیمکردنەوەیان، تێکچوو. لەمبارەوە رەخنەی لە شەهید شیهاب دەگرت، من، یەکەمین جار کە وەلامدایەوەو درز کەوتە بۆچونەکانمانەوە، لەسەر رەخنەکانی بون، لەسەر خاڵە شیهاب.

ئەو هەلومەرجە، دڵنیام خوێندنەوەی جیاوازیش هەڵدەگرێ. دەشزانم، دامەزرێنەرانی بزوتنەوە، روانگەی جیاوازیان هەبوەو هەیە. ئەمەش ئاساییە. نائاساییی ئەوەیە، دوو ئایدیۆلۆژیەت‌و سیاسەتی جیاواز، خوێندنەوەی جیاوازیان، لەسەر رووداوە گەورەکان نەبێ. لە نوسەر وایە کە باسی جیاوازیی نێوان کۆمەڵەو بزوتنەوە دەکات، نهێنیەکی مێژوویی نەدۆزراوەی دۆزیوەتەوە. بۆئەوەی ئەم جیاوازیانە قەبە بکات‌و لە چوارچێوەی دۆخی ئاسایی ململانێ جیاوازەکان، دەرهاوێ‌و بیانهاوێتە دۆخێکی نائاساییەوە، بڕوانن لە لاپەڕە (١٨١)دا چۆنی هەڵدەسەنگێنێ:

" ئەمانەو گەلێ هۆی تریش، دوایی باسیان دەکەم، بوونە هۆی دروستبوونی گەورەترین ناکۆکی لەنێوان کۆمەڵەو کۆمەڵە و کۆمەڵەو بزوتنەوەش، کە لەراستیدا چ مام جەلالو چ نەوشیروان لە سەرانی دەرەوە، شاسوار جەلالو نەجمەدین عەزیزو حیکمەت محەمەد لە سەرانی ناوەوە هەر لە یەکەم پێکگەیشتنیان کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەیان قوڵتر و سەختتر کرد."

هەرگیز کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە، بەو ئەندازەیە نەبووە کە باسی دەکات. جارێ سەبارەت بە شەهید ئارام، مامو کاك نەوشیروانی هەر نەدیبوو، هەتا خاڵە جیاوازەکانیان زەقبوبێتەوە. سالارو مەلا بەختیاریش، لەو هەلومەرجەدا، تەنها لە چوارچێوەی راپەڕاندنی ئەرکە هاوبەشەکان، بەبێ ئەوەی سەربەخۆیی کۆمەڵە لەدەستبدرێ، گفتوگۆیان دەکرد. مەترسی گەورەی ناوخۆیی ئەوکاتەش، کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە نەبوو. بەڵکو، چوار کێشەی سەرەکیمان هەبوو:

- یەکەم: (پارتی — قیادە موەقەتە) کە رێگاکانی چەکهێنانیان دەگرتو روداوی شەهیدکردنی برایم عەزۆو هەڤاڵەکانی قەومابوو.
- دووەم: هێزە زۆرو بۆرەکەی بۆ خۆپشاندانی چەکداری، کۆکرابونەوە، پەیتا پەیتا تەسلیم دەبوونەوە.
- سێهەم: چۆنیەتی گەیاندنی هاوکاریەکان بوو، لەسوریاوە بۆ کوردستان.
- چوارەم: رێکخستنەوەی یەکێتی، ئۆرگانەکانی، دابەشکردنی فەرماندەکانو دانانی بارەگای مەکتەبی سیاسی.

کێشە لەناو کۆمەڵەدا بەو ئەندازەیە نەبوو. هەر کەس لەبیریشی نەمابوو، لەناو شاردا (برایم جەلال) جیاواز بیردەکاتەوە، یان نەء؟ بۆ یەك جاریش ناوی نەهاتۆتە ئاراوە. بەڵام ئەو، کاتێك دەنوسێ (سەرانی دەرەوە)و (سەرانی ناوەوە)

کێشە ناوخۆییەکانی "کۆمەڵەیان قوڵترو سەختتر کرد". هەر جارێ بەکارهێنانی وشەی (سەران) تێگەیشتنی ئەو بۆ کێشەکان، بۆ سەرکردەو ململانێکان، دەخاتە ژێر پرسیارو نیگەرانیەکی زۆرەوە. بۆ؟

لەبەرئەوەی بە خەیاڵی نەرگسیەتی (کۆمیتەی ناو شارەکان!!)و کێشمەکێشەکانی ئەوسا، ئەم "چەپکەی کۆمەڵە"ی هۆنیوەتەوە، بۆیە وشەی (سەران)یش بەکاردێنێ، هەتا بڵێ:

منیش، خۆم بە رابەرێکی گەورە دەزانمو لەبەرامبەر (سەران)ی تریشدا، کەمتر نیمو سەرم لەناو سەراندایە! بۆئەوەی ئەمەشی بۆ بچێتەسەر، با ئەم پەرەگرافەی لاپەڕە (١٨٥)ی بەدیقەت بخوێنینەوە:

" کێشەی نێوان کۆمیتەی شارەکانو کۆمیتەی هەرێمەکان. چوونە شاخی زۆربەی کادرە ئەساسیەکانی لە ١٩٧٦، بەڵام هێشتا رێکخستنی کۆمەڵە لە شارەکاندا بەهێز رێکخراو بوو. هێشتا چەندانی وەك جەمال تایەر، شازاد سائیب، حەمە چاوشینو بەندە لە سلێمانیو عەبدولرەزاق لە هەولێرو ئەحمەد کرێکارو حەمیدی پۆلیس لە کەرکوکدا مابوونەوە، بۆ کاری ژێر دەستی، کە پاش ئەو کۆبونەوەیە ئەوانە کرانە سەرکردایەتی ناوخۆ."

بەم قسانەشدا دیارە، واز لەوە ناهێنێ کە گوایە خۆیو ئەو هاوڕێیانەی بەناوی کۆمیتەی شارەکانەوە، فریویدابون، خۆی بە جەمسەرێك بزانێ. واتا: هەوڵی تایبەتی خۆی، بۆئەوەی بەو باوەڕو بڕوایەی لەوکاتەدا هەیبوو، بکاتە راستییەکی مێژوویی.. یان بیچەسپێنێ، کە نیوەی کۆمەڵە لای نوسەر بووە.

جێی خۆیەتی بپرسم: کەسێك دوای (٣٧) ساڵ، ئەمە جۆری بیرکردنەوەو لێکدانەوەی بێ؛ ئەمە خوێندنەوەی بێ بۆ مێژووی نوێی گەلەکەی؛ ئەمە هەستی بێ بەرامبەر شەهیدە گەورەکانی رێکخستنەکەی؛ ئەمە بۆچونی بێ

بەرامبەر هاوڕێکانی ڕێکخستنەکەی؛ ئەمە ویژدانی بێ بەرامبەر ماندووبوون و قوربانیەکان، کەسێکی ئاوا، گەر هاتباو (٣٧) ساڵ لەمەوبەر، هەر بەڕاستی لەباتی شەهید ئارام کەسی یەکەمی کۆمەڵە بوایە، بەم باوەڕو بەم ئەقلیەتەو بەم خووڕەوشتە، چی بەسەر کۆمەڵەدا دەهێنا؟ چەند زیانی لە یەکێتی و لە بەرپابونی شۆڕش دەدا؟ چەندیش تاوانی دەکرد؟!

سەیرەکە لەوەدایە، ئەم نوسەرە، لە هەڵبەستنی هەموو جۆرە هەواڵێك، باسێك، بەسەرهاتێك، ناسڵەمێتەوە. ئیتر گوێناداتە ئەوەی شایەتی زیندوو ماوون. بەڵگەی نوسراو هەیە. دەستخەت هەیە. بۆ نمونە، ئەمەش دەنوسێ: "جەمال تایەر، شازاد سائیب، حەمە چاوشین و بەندە لەسلێمانی و عەبدولرەزاق لە هەولێرو ئەحمەد کرێکارو حەمیدی پۆلیس لە کەرکوکدا مابوونەوە، بۆ کاری ژێردەستی، کە پاش ئەو کۆبونەوەیە ئەوانە کرانە سەرکردایەتی ناوخۆ".

هەتا دەچێتە قوڵایی باسەکانەوە، دەسەلمێ نوسەر، چێژ لەم هەڵبەستنانە دەبینێ و بەم جۆرە هەڵبەستنانەش، گرێی دەرونی خۆی، کەمێك دەکاتەوە.

هەتا دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە، من بەرپرسیاری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوم لە شارەکان و کوردستاندا. سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی یەکێتیشم دەکرد، کە لە شارەکاندا کۆمەڵە سەرپەرشتی دەکردن و ساڵی (١٩٧٦)یش هەر کۆمەڵە پێکیهێنابون. ئەوکاتەی نوسەر باسی دەکات، دوورونزیك، دۆخی سیاسی و شۆڕش و ناو شارەکان نەدەگونجان "سەرکردایەتی ناوخۆ" دابمەزرێنین. بەڵکو زۆرتر ڕاستەوخۆ پەیوندیان بە شارەکانەوە دەکرد. ڕێکخستنەکانیش هێشویی بون، پەیوەندی تاکەکەسی زاڵبوو، نەك کۆمیتەی هەموو شارەکان. من ساڵی (١٩٧٨) دوای کارەساتی هەکاری کە سەردانی سلێمانیشم کرد، هێشتا سەرکردایەتی ناوخۆمان دانەمەزراندبوو. بەرپرسی شارەکانم بەجیا بینی. حاجی

مەمۆ لە هەولێرو شەهید بێستون لە کەرکوك، هەروەها سلێمانیو لە باقی شوێنەکانیش دەهاتنەلام. دوای (١٩٧٩) لەرێگەی شەهید جەمال تایەرەوە، بۆ یەکەمین جار، سەرکردایەتی ناوخۆمان پێکەوەنا، ئەویش پێمانگوت، بۆ حاڵەتی زۆر گرنگ پێکەوە کۆببنەوە، نە ئەوساو نە پێشترو نە دوای ئەوەش، هەرگیز برایم جەلال نەکراوەتە ئەندامی سەرکردایەتی ناوخۆ. تێکۆشەرێکی وەکو (حەمە چاوشین)یش، کرابووە سەرپەرشیاری بەشێکی رێکخستنەکانی یەکێتی. ئەم هەڵبەستنانە، وەکو داخ هەڵڕشتنێك وایە. ئەوەی دوای خاڵە شیهابو روداوەکانی ئەوکاتە، پیلانی بۆ داناوەو پێی نەهاتۆتە دی، ئێستا دەیەوێ هەمان خەیاڵی ئەوکاتە، بخاتە ناو ئەم چەپکەی مێژووی کۆمەڵە. ئەمەش هێندەی تر چەپکەکەی سیس کردووە.

() () ()

لەکۆتاییدا، دەمانەوێ ئەوە رونبکەینەوە کە هەتا ئێستا (چوار بەشی ئەم کتێبە خوێندنەوەیەکی مێژووییمان بۆ کردووە، کە دەکاتە (١٩٣ لاپەڕە). بۆئەوەی خوێنەر بە کتێبێکی زۆر قەبەوە خەریک نەکەین، ناچار، باقی خوێندنەوەمان، بۆ بەرگی دووەم دواخست. خوێنەر دڵنیا دەکەم، دوای ئەم بەرگە، دەستبەجێ دەست بە نوسینی بەرگی دووەمیش دەکەم. ئومێدەوارم، بەرگی یەکەم، سودێکی ئەوتۆی بەو چەپکە ژاکاوەی نوسەر گەیاندبێ، کە وا بکات، خوێنەر چاوەڕێی دووەمیش بکات.

داوای لێبوردنیش، لە بنەماڵەی ئەو شەهیدانە دەکەم، کە لەشوێنێك پێویست بوبێ، لەبەر خۆپاراستن لە گللەیی هەزاران ماڵە شەهیدی تریش، نەمتوانیبێ، تەواوی ناوەکان بنوسم.

هەروا، ئەو هەڤاڵو پێشمەرگەو تێکۆشەرانەش، بە بەخشندەیی خۆیان، گەر ناوی هەندێکیانم بیرچوبێتەوە، دەمانبەخشن. من دڵنیام، تێکۆشانی تێکۆشەرانی رۆژگاری سەخت، ئەوەندە گەورەن، کەسانی وەکو من، ناویشیانم بیربچێتەوە، لە گەورەییان کەمناکاتەوە. دڵنیام، ئەوانەی لە دروستکردنی مێژووی راستەقینەی یەکێتیو شۆڕشو گەلەکەمان، بەشدار بون، ئەمەم لێ قبوڵ دەکەن، ئەوەندەی توانیومە، نەمهێشتووە ئەو مێژووە، بشێوێندرێ.

بەهیواشم، خوێنەر، خوێندنەوەی ئەم روداوانەی لە وەڵامی هەڵەو هەڵبەستنەکانی کاك برایم جەلالدا، دەخوێنێتەوە، وردی ئەوە بێ، کە ئەم وەڵامانەی منیش، لەروانگەی منەوەیە وەکو پێشمەرگەیەك کە ناوی (مەلا بەختیار)ە. چەندم راست گوتبێ، بەو ئەندازە راستیانە خزمەتی راستیەکانی مێژووی نوێم کردووە. گەر لە هەندێك شوێنیشدا، هەڵەم کردبێ، بیرەوەری‌و چاوی من، ئاوای خوێندۆتەوە. لە هەر راستکردنەوەیەکی باشترو بابەتیش، خۆشحاڵ دەبم. ئیتر زۆرتر نوسین.. هەر بە برایم جەلال دەکرێ، چونکە هەتا خوێنەر پێی ناخۆشبێ، ئەم برایەمان دەتوانێ قسە هەڵبەستێ. روداو دابتاشێ. بوختان بکات. هەر بەوجۆرە قسانەش، گرێ دەرونی پڕ لە رقی دادەمرکێتەوەو زاخاوی نەرگسیەتەکەشی دەدات. بەڵام بەو کارانەی، خۆی قەرزارباری شەهیدان، تێکۆشەران‌و مێژووی شۆڕش‌و یەکێتی کردووە. نۆباڵ لەئەستۆی!

**مەلا بەختیار**

دەستپێکردن: ٢٠١١/١٠/٢

کۆتایی: ٢٠١٢/١/١٢

سلێمانی

# پاشکۆ

سەروتاری ڕۆژنامەی (چاودێر) ، ژمارە (٣٢٦) - ٢٠١١/٦/٦

## لە ساڵرۆژی یەکێتیدا.. ئاوڕێکیش لە سەرکردایەتی فەرامۆشکراوی ناو وڵات

بێگومان دامەزراندنی یەکێتیو بەرپابونی شۆرشی نوێ، دوو ڕوداوی هەرە کاریگەری مێژووی نوێی گەلەکەمانن. ساڵانە زۆر باسیان دەکرێت، یادەکانو ڕێڕەوی ٣٦ ساڵ خەبات، هێشتا زۆریان بەبەرەوە ماوە بابەتیانە لەسەریان بنوسرێت. بێگومان جەنابی مام جەلالو هەندێك لە هەڤاڵانی دەستەی دامەزرێنەر، کاریگەریی بەرچاویان لەو مێژووەدا هەیە. دیارە سەرگوزشتەی ئەندێشەی یەکێتیو چۆنێتی دامەزراندنی، هێندەی من دەیزانم، لەو زەمانو زەمینەیەدا، کە پێنج ساڵ بوو (کۆمەڵەی مارکسی لینینی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ) هەبوو، یەکێتیش لەسەر ڕەگی کۆمەڵە ڕوابوو، گفتوگۆی جۆراوجۆری لەسەر هەبووە. بەتایبەتی، کە ڕاوێژ بە سەرکردایەتی کۆمەڵە کراوەو بۆ ئەو مەبەستەش، پێش ئەوەی شەهیدان (شەهابو جەعفەرو ئەنوەر) بگیرێنو لەسێدارە بدرێن. شەهید ئەنوەر زۆراب جارێكو کاك فەرەیدون عەبدولقادر جارێکی تریش، سەردانی شامیان کردووەو بەنوێنەرایەتی کۆمەڵەش گفتوگۆیان لەگەڵ جەنابی مام جەلال کردووە. تەنانەت، جیاوازیی لەنێوان ئەو هەڤاڵانەی لە شامدا بەسەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلال، کۆبونەتەوەو (١٩٧٥/٥/٢٣) ڕەشنوسی بەیاننامەی دامەزراندنی یەکێتیان نوسیوە، لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەی لە بەرلیندا فراوانتر کۆبونەتەوەو دوا پاکنوسی بەیاننامەی دامەزراندنی یەکێتیان بڵاوکردۆتەوە (١٩٧٦/٦/١)، جیاوازی لەنێوانیاندا بۆ چۆنێتی دامەزراندنی یەکێتیو تەنانەت لەسەر هەندێ چەمکی ئەوکاتەی یەکێتی، هەبووە. لەم جیاوازی بیرکردنەوەو دوو کۆبونەوە جیاوازەدا، هەشت ڕۆژ لە مێژووی یەکێتی، قرتێنراوە. ئێستا کە کۆمەڵەی ڕەنجدەران، لەلایەن ئەوانەوە کە باوەڕیان بە ستراتیژی ڕزگارکردنی

هەر چوار پارچەکەی کوردستان پێکەوە هەبوو، لەسەر سنوری دوو پارچەی کوردستان ساڵی (١٩٨٩) نێژراو پێنج ساڵ لەتەمەنی ئەم ڕێکخراوە، لە مێژووی یەکێتیدا سڕایەوە، بەڵام لە دامەزراندنی یەکێتیەوە، خۆ دەبێ مێژووی بەردەوامی ڕوداوەکان، وەکو ڕویانداوە، بنوسرێتەوە.

من لەو کەسانە نیم بتوانم لەڕۆژی دامەزراندنی یەکێتیەوە، بۆ ئەو بیروڕایانەی لەکاتی دامەززاندنی یەکێتیدا، مشتوماڵ کراون، بەوردی قسە بکەم. ئەمەیان ئەرکی ئەو کەسانەن کە لەناو پرۆسەکەدا بوون. بەڵام لە دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە (پایزی ١٩٧٥) شایەتی بەشێکی زۆری چۆنێتی دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکان، پەیوەندیکردن بە دەستەی دامەزرێنەری دەرەوەی وڵات، خۆئامادەکردن بۆ جەنگی پارتیزانی، وەرگێڕانی نامیلکەی یەکێتیی نیشتمانی بۆچی؟ نوسینی پەیڕەوی ناوخۆی پارتیزانەکان، چۆنێتی کۆکردنەوەی فەرماندە عەسکەریو ڕابەری سیاسیو پێشمەرگەکانی دەستەکانی سەرەتایی، کڕینی چەکە ژەنگاویەکان، پێکەوەبەستنی ڕایەڵەی ڕێکخستنەکان، دروستکردنی شانە سەرەتاییەکانی یەکێتی لەلایەن کۆمەڵەوە، کێ ئامادە بوو بێتە ریزەکانی ڕێکخستنو کێش ئامادەنەبوو، هەروەها کێ بوون ئەوانەی ئامادەییان دەربڕی ببنە پێشمەرگەو، کێ بوون ئەوانەی گاڵتەشیان بە بەرپابوونی شۆڕش دەهات. چۆنێتی پێکهێنانی مەفرەزەکانی سەرەتای شۆڕش لە: دەشتی هەولێر، دەشتی کۆیە، قەندیل، دۆڵی جافایەتی، خۆشناوەتی، شینکایەتی، بتوێن، مەرگە، قەرەداغ، گەرمیان، بازیان، شارەزور، هەڵەبجە، پێنجوێن، شلێر، شارباژێر، دەوروبەری چوارتا، چەمی ڕێزان، عەسکەر، سورقەڵەوشان، دروستکردنی یەکەمین دەستەی پێشمەرگەی ناو شاری سلێمانیو بەسزاگەیاندنی چەندین تاوانبار...تاد. هەروەها پەیوەندیەکانی کۆمیتەی هەرێمەکانو دەستەی دامەزرێنەرو گۆڕینەوەی نامە لەنێوان جەنابی مام جەلال، بەدەستنوسی شەهید ئارامو مام جەلال، ناوەڕۆکی نامەکان، ئامۆژگاریەکانی مام جەلال، پێشنیارەکانی، بڕیارەکانی، چۆنێتی خۆئامادەکردنیان لە کامپی قامیشلو، چالاکو چالاکیەکانیان لە دەرەوەی وڵات، ڕێنوێنیەکانی بۆ پەیوەندی بزوتنەوەی

سۆسیالیستو کۆمەڵە هەتا خۆی دێتەوە. چۆنێتی سەرقاڵبونی ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان، جیاوازیی نێوانیان، ماندوبونی بێ‌ڕادەی شەهید ئارام بۆ ئامادەکردنی مەفرەزەکانی سەرەتای بەرپابونی شۆڕش، نوسینی بەیاننامەکان، کۆبونەوەکان، چۆنێتی ناردنەوەی دەستە دەستەی پێشمەرگەکان. پاشان پەیوەندی کۆمەڵەو بزوتنەوەی سۆسیالستی کوردستان، فراوانبوونی مەفرەزەکانو دروستکردنی هێزی فراوانی پێچەوانەی بنچینەکانی پارتیزانی، ململانێکانی کۆمەڵەو بزوتنەوە، هەتا گەڕانەوەی شەهید شێخ حوسێنی بابەشێخی یەزیدیو کاك نەوشیروانو شەهید حەسەن خۆشناو، شەهید سەید کەریم (هاوینی ١٩٧٧) تا دەگاتە چرکەساتی گەڕانەوەی جەنابی مام جەلال (١٩٧٧/٧/٢٠) بۆ دێی (ماسی ڕۆ- بناری شاخی دالانپۆ) لەکۆتایی ناوچەی هەکاریدا بۆ دۆڵی (گۆستێ) کە ناوچەی برادۆستو هەکاری لەیەك جیادەکاتەوەو ناوچەیەکی ئێجگار سازگارو دڵڕفێنو پڕ لە ترێی کوێستانیو کرۆسکە هەرمێو هەنگوینی کلۆرەداری دەیان ساڵەیە، هەتا دەگەینە یەکەمین کۆبونەوەی سەرکردایەتیو تەنها بەڕێز مام جەلالو کاك نەوشیروان، وەکو دوو کەس لە دامەزرێنەرانی یەکێتی لە دەرەوەی وڵات هاتبونەوەو لەکۆبونەوەکەدا بون، (مانگی ٨ی ١٩٧٧)، تەنانەت بەشی زۆری مشتومڕو بڕیارەکانی ئەو کۆبونەوەیەشمان لەبیرە. جیاوازیەکانمان لەناو شۆڕشو یەکێتیدا زۆر بوون، بەڵام ئومێدمان بە چارەسەرکردنیان زۆرتر بوو. هەر لەم کۆبونەوەیەدا مام بەسکرتێری گشتیی یەکێتی هەڵبژێردرا.

ئەمانە بەشێکی کەمی تێکۆشانی هەڤاڵانی ناوەوەی وڵات بوون. کە سەرەتا کۆمیتەی هەرێمەکانو پاشانیش کۆمیتەی هەرێمەکانو سەرکردایەتی بزوتنەوەی سۆسیالست بە رابەرایەتیی شەهید عەلی عەسکەریو شەهید رەسول مامەند، ئینجا دامەزراندنی سەرکردایەتیی کاتیی ناو وڵات (هاوینی ١٩٧٦)، کە من لەو کۆبونەوەیەدا نەبووم (لە شاردا سەرپەرشتی رێکخستنەکانی سەرانسەری کوردستانو عێراقو پێشمەرگەکانی ناو شارم دەکردو لەگەڵ شەهید ئارامو مەفرەزەکانی قەراغ، گەرمیان، شارەزور، بازیان، شارباژێر، دەشتی هەولێر، ناوچەکانی کەرکوك،

هاوئاهەنگیمان دەکرد) لەگەڵ ئەوەشدا شەرەفی ئەندامێتیی سەرکردایەتی ناو ولاتیان لەکۆبونەوەکەدا پێبەخشیبووم.

ئەمانە لایەنێکی سەرگوزشتەی تێکۆشانی ناو ولات بوون، پێش ئەوەی هیچ هەڤاڵێکی دەستەی دامەزرێنەر گەڕابێتەوە ولات. هەڵبەتە دوای گەڕانەوەی جەنابی مام جەلال، بەشێکی بەرچاوی بەرنامەو ئۆرگانەکانی یەکێتی، دابەشکردنی پۆستەکان، چارەسەرکردنی بەشێکی کێشەکان، تەبایی هەتارادەیەکی باشتری نێوان باڵەکانی یەکێتی (کە لەدوای کۆبونەوەی دۆڵی گۆستێوە هێڵی گشتیی ناو یەکێتیش پێکهێنراو پاشان بوو بە یەکێتی شۆڕشگێڕان)، لەگەڵ گەیاندنی وەجبەیەك چەکی دەرەوەی ولاتو دابەشکردنی بەسەر هێزەکاندا، کە زۆربەی چەکەکانیش درانە هەڤالانی بزوتنەوە. ئەمانە هەمووی بە رابەرایەتیو کاریگەریی مام جەلال ئەنجامدران.

ئێستا کە ٣٦ ساڵ بەسەر دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا تێدەپەڕێو دیسان تەنهاو تەنها باسی دەستەی دامەزرێنەر لەم یادەدا گەشکرایەوە. پێموایە، کاتێتی، کۆی خەباتی هەڤالانی دەرەوەی ولاتو ناوەوەی ولات، لەم یادانەو لە یادەکانی تردا، بابەتیانەتر باس بکرێن. من تۆزقاڵێك لە خزمەتو لە دوربینیی مام جەلالو توانای ئەندامانی دامەزرێنەر، بە جیاوازیی کەسایەتیو تواناکانیانەوە، هێندەی ماندوو بوون، دەربەدەر بوون، تێکۆشاون، مەڵۆیەکیان خستبێتە سەر خەرمانی یەکێتی، کەمناکەمەوە، رێزیشم بۆیان هەیە. هەریەکەیان چەندیان کردبێ، هەر بەو ئەندازەیە مێژوو بۆی نوسیون. بەڵام کەمکردنەوە، یان فەرامۆشکردن، یان لەبیرکردنی توانای سەرکردەو سەرکردایەتی ناو ولاتو ئەو هەموو رابەرە شەهیدو پێشمەرگە قارەمانانە، هەرچەند دەکەم ویژدانم قبوڵی ناکات. بۆیە بەپێویستم زانی، لەم یادەدا بەشێکی بیربخەمەوە. شایەنی باسیشە کە بپرسم: مێژووی یەکێتی، ئەگەر لەسێدارەدانی خاڵە شەهابو هاوڕێکانیو کەم بژیو کەڵ بژی لێدەرکرێت، ئەگەر تێکۆشانی شەهید ئارامو خزمەتەکانی لێکەمکرێتەوە، ئەگەر قارەمانێتیو کاریگەریی شەهید عەلی عەسکەریو شەهیدان: (عومەر دەبابە، دکتۆر خالید،

رەسول مامەند، رەئوف بەگ، تایەری عەلی والی، سەعدی گچکە، مامۆستا عەزیزو جەمال تایەر) هەروەها دەیان فەرماندەی شەهیدی تری سەرەتای شۆڕش، کە لە ڕێکخستنە نهێنییەکانو زیندانەکانو سەرەبزێوی پارتیزانی (١٩٧٦) وە دەستیان پێکردو بەگژ مەحاڵدا چونەوە، ئەگەر ئەمانە، لە یادی یەکێتیدا، هاوشانی دەستەی دامەزرێنەر، لە شوێنو کاتی خۆیدا، ڕۆڵو کاریگەرییان گەش نەکرێتەوە، پێموایە، مێژووی یەکێتیو قۆناغەکانی پێشکەوتنی شۆڕش، زیانێکی زۆری بەردەکەوێت.

من دەزانم، لەناو دەستەی دامەزرێنەراندا، مام جەلال، چەند ئەو شەهیدانەی خۆشدەوێت، چەندیش پێش گەڕانەوەی بۆ گەڕانەوە پشتی پێدەبەستن، تەنانەت داواشی دەکرد مەفرەزەی پاراستنیشی کۆمیتەی هەرێمەکان لە (٣٠-٥٠) ئەندامی کۆمەڵە، ئامادەیان بکات. دیومە چەند جارێك بۆ هەندێك لەو شەهیدانە هۆن هۆن فرمێسك لەچاوی مام هاتۆتەخوارەوە. بەڵام لە یادی یەکێتیشدا، وەکو چۆن باسی دەستەی دامەزرێنەری کردو هەقی خۆی دانێ، هەقیش بوو، ئاوڕێکیش لە سەرکردایەتیو دامەزرێنەرانی شۆڕش لە ناو وڵات، بداتەوە. تەنانەت ئەگەر بە دوو دێڕیش بوایە ئێمەومانانیش ئاسودەییەك دایدەگرتین. من ئەمە وەکو ئەمانەتێك دەیڵێم، کە بۆ یەکێتیو بۆ مام جەلال باشترە. ئەگینا بەش بە حاڵی خۆم، هەتا ئێستا قەڵەمم هەڵنەگرتووە باسی بیرەوەریی خۆم لەسەر ئەو مێژووە بکەم. ئەمە لەکاتێکدا، هەن، زۆر کەمیان کردووە، بەڵام کتێبی زل زلی پڕ لە چەواشەکردنی مێژوویان هۆنیوەتەوە. هەندێك لەوانە بەدرێژایی شۆڕش لولەی تفەنگەکەیان لە هیچ شەڕێکدا گەرم نەکردووە. بەڵکو لە شەڕی واش بووە، ئازیزترین پێشمەرگە بەبەرچاویانەوە شەهید بووە، دەستیان نەکردۆتەوە. هەتا شۆڕشیش تەواو بوو، لەبەرئەوەی کڵاوەکەیان بە سیکۆتینی خۆپەرستی بەسەریانەوە نوساندبوو، نەکا با بیبا، بۆیە ئێستاش کەروێشکێك دوژمنیان نییە.

لەکۆتاییشدا دەڵێم: ئایا کاتی نەهاتووە، لیژنەیەکی شارەزاو بەتوانا، بۆ نوسینەوەی وردو درشتی مێژووی یەکێتیو شۆڕش پێکبێت؟ هەتا بەئەمانەتەوە، ئەو مێژوە بدرێتە دەستی نەوەی ئێستاو نەوەکانی ئاییندە. پێموایە کاتێتی.



مام جەلال لەکاتی خوێندنەوەی  وتاری یەکەمین ساڵڕۆژی شەهید ئارام

گوندی شێنێ - ١٩٧٩



سالار عەزیز لەکاتی خوێندنەوەی وتاری کۆمەڵە لەیەکەمین ساڵڕۆژی شەهید ئارام

گوندی شێنێ - ١٩٧٩



کورش لاشایی

سکرتێری سازمانی ئینقلابی حزبی تودەی ئێران

(مامۆستای وانەوتنەوەی تیۆری لە بەکرەجۆ- ١٩٦٨)

سەردانی پارتیزانەکانی سلێمانی معینیو مەلا ئاوارەی کردبو

ساڵی ٢٠٠٢ بەنەخۆشی شیرپەنجە کۆچی دوایی کرد



خەسرەو سەفایی
ئەندامی سەرکردایەتی سازمانی ئینقلابی حزبی تودەی ئێران
(مامۆستای وانەوتنەوەی تیۆری لە بەکرەجۆ- ١٩٦٨)
لە زەمانی شا دا شەهیدبوو



نیرەجی کشکۆڵی - ١٩٨٣
ئەندامی سەرکردایەتی سازمانی ئینقلابی حزبی تودەی ئێران
(مامۆستای وانەوتنەوەی تیۆری لە بەکرەجۆ- ١٩٦٨)
ئێستا لە پاریسە

**سەرچاوەکان:**


١- الكذب في سلوك الأطفال، اعداد: محمد علي قطب الهمشري، وفاء محمد عبدالجواد، علي اسماعيل محمد، الناشر مكتبة العبيكات، الطبعة الاولى ١٤١٨هـ - ١٩٩٧م.

٢- دروغ گورا در چن دەقیقه بشناسید. دیوید جی – لیبرمن. دکتر حسین رحیم منفرد، ابو القاسم شهلایی، مقدم/ نقش و نگا/ سال نشر: ١٣٨٨.

٣- فریب نخورید/ دکتر دیوید لیبرمن/ ترجمة (دکتر محمد بهشتیان)، انتشارات بهشتیان – تهران ١٣٩٠.

٤- (الكذب واثره في الإنسان)، تأليف: يوسف ميخائيل اسعد، دار غريب للطباعة والنشر والتوزيع- القاهرة.

٥- تأريخ الثورة الروسية. ترجمة: أكرم ديري – الهيثم الايوبي. المؤسسة العربية للدراسات والنشر- الطبعة الثانية – تشرين اول ١٩٧٨.

٦- مسعود بارزانی – البارزانی والحركة التحررية الكردية الكرد وثورة ١٤ تموز ١٩٥٨. ١٤/تموز ١٩٥٨ – ١١/ايلول/١٩٦١.

٧- تجارب الصين من التطرف الى الاعتدال – ترجمة: محمد خير الوادي – دار الفارابي – بيروت – لبنان – الطبعة الاولى ٢٠٠٨.

٨- جان اسمين: الثورة الثقافية الصينية. ترجمة: ذوقان قرقوطي.

٩- محمد حسنين هيكل / سنوات الغليان – الجزء الاول – الطبعة الاولى – مركز الاهرام للترجمة والنشر. ١٩٨٨

١٠- نگاهی از درون به جنبش چپ ایران – گفتوگو به ایرج کشکولی – نوسینده: (حمید شوکت) – نشر اختران – چاپ اول، زمستان ١٣٧٩.

١١- گفتوگو با کورش لاشایی – نگاهی از درون به جنبش چپ ایران – حمید شوکت، نشر اختران – چاپ اول ١٣٨١– چاپ سوم ١٣٨٦.

١٢- هەواڵنامەی شۆڕش، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، مایسی ١٩٧٨، پوختەی رووداوەکان (١٩٧٦/٥/٢٣ – ١٩٧٨/٤/١٣).

١٣- جورج حبش- الثوريون لا يموتون ابداً - حاوره جورج مالبرنيو – دار الساقي، الطبعة الاولى ٢٠٠٩ ، الطبعة الثانية ٢٠١١.

١٤- الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟. من منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني. ١٩٧٥

١٥- فەرەیدون عەبدولقادر- لە بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهابو هاوڕێکانی. چاپی یەکەم – ٢٠١١.

١٦- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان- عێراق (بەشی یەکەم) هەڵبژاردەیەك لە نوسینەکانی شەهید ئارام. نوسینگەی راگەیاندنی چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ.کانونی دووەم ١٩٩٠.

١٧- هەواڵنامەی خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کوردستانی عێراق لەماوەی دوو ساڵدا- لەبڵاوکراوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. مایسی ١٩٧٨.

١٨- رۆژنامەی (چاودێر) ، ژمارە (٣٢٦) - ٢٠١١/٦/٦

١٩- رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)- ساڵی بیستەم – ژمارە (٥٦٥٣) ٢٠١١/١٢/١٥.

٢٠- مابعد التأريخ هل انتهى التأريخ؟ - دار المدى للثقافة والنشر / لوتز نيتهامر/ ترجمة: فاضل جتكر. الطبعة الاولى – ١٩٩٥

٢١- السلام المفقود – خفايا الصراع حول سلام شرق الاوسط – تأليف: دنيس روس/ ترجمة عمر الايوبي – سامي كعكي. دار الكتاب العربي – بيروت – لبنان. ٢٠٠٥

٢٢- اوسلو والسلام الاخر المتوازن – نايف حواتمة – الاهالي للطباعة والنشر والتوزيع الفلسطينية – الطبعة الاولى. ١٩٨٨

٢٣- محمد حسنين هيكل / الحل والحرب. شركة مطبوعات للتوزيع والنشر. بيروت- لبنان. الطبعة الاولى ١٩٧٧.

٢٤- راپۆرتی ئەنسیتۆی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ساڵی١٩٨٠ (لندن)- ژ: ٨.

٢٥- دەزگای ناوەندی سەرژمێری (حساباتی نەتەوەیی) نامیلکەی سەرژمێری باخەڵ. ١٩٨٢.

٢٦- شۆڕشی کوردستانو گۆڕانکاریەکانی سەردەم (خەباتی شاخەکان یان راپەڕینی شارەکان؟) - مەلا بەختیار ، سوید ، ١٩٩٣.

٢٧- التقرير المركزي للمؤتمر القطري التاسع. حزيران ١٩٨٢.

٢٨- حسن جمعة الأسدی، رئيس الأتحاد نقابات النفط في العراق (دراسة تحليلية في واقع سياسة النفطية في العراق).

٢٩- د.نزار احمد. دراسة اقتصادية حول اموال النفط العراقي مابين (١٩٣٠-٢٠١٠).



**Mala Bakhtiar**

# What Collection & Which History of Kommallah ?!

**a Historical Reading to**
**( a Bunch of History of Komala )**

**Part 1**
**February 2012**